


ژمارە (٢٨) ساڵی ٢٠١٤

**باس و توێژینەوە بڵاوکراوەکان لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی دەربڕی بیر و بۆچوونی توێژەرانن نەک دەستەی نووسەرانی گۆڤار**


- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی.
- بەرگ و سەرپەرشتی هونەری: عوسمان پیرداود
- نەخشەسازی: عیسام موحسین.
- هەڵەچن: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل.
شیلان جەلال.
- چاپ: چاپخانەی حاجی هاشم- هەولێر.
- تیراژ: ٧٥٠ دانە.

# لەم ژمارەیەدا

## بەشی كوردی



## بەشی عەرەبی – القسم العربي



## English part

# ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوە
# لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی

١. گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، گۆڤارێکی زانستی وەرزییە، باس و توێژینەوەی زانستی لە بارەی کورد و کوردستان، بڵاودەکاتەوە، بە مەرجێ لە هیچ شوێنێکی دیکە بڵاو نەکرابێتەوە یان بۆ بڵاوکردنەوە وەرنەگیرابێت.
٢. زمانی کوردی زمانی سەرەکی بڵاوکردنەوەیە لە گۆڤارەکە، بەڵام لێکۆڵینەوەی زانستی بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزیش بڵاودەکاتەوە.
٣. هەر بابەتێک کە بۆ گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی دەنێردرێت، دەبێت ناوونیشانی باسەکە، ناوی نووسەر، شوێنی کارەکەی، پلە و پایەی زانستی، ئیمێل و ژمارەی تەلەفۆنەکەی لە سەر لاپەڕەی یەکەمی لێکۆڵینەوەکە نووسرابێت.
٤. نووسەر دەبێت پوختەی باسەکەی بە هەردوو زمانەکەی دیکە، جگە لە زمانی نووسینی دەقەکە لە کۆتایی توێژینەوەکە بنووسێت، کە نابێت لە یەک پەڕەی (A٤) زیاتر بێت. لەو پوختەیەدا پێویستە گرنگی و ئەنجامە سەرەکییەکانی توێژینەوەکە بخرێنەڕوو.
٥. لە دوای پەسەندکردنی باسەکە لە لایەن هەڵسەنگێنەرانی زانستیەوە، دەستەی نووسەران ڕەزامەندی بڵاوکردنەوەی بە توێژەر دەدات.
٦. بۆ ئەوەی بابەتەکە لەگەڵ ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوەی گۆڤارەکەدا بگونجێت، دەستەی نووسەران مافی سەرلەنوێ داڕشتنەوە و لابردنی هەندێ دەستەواژەی هەیە، بە مەرجێک بیرۆکەی سەرەکی توێژینەوەکە نەگۆڕێت.
٧. ئەگەر باسەکە لە بارەی ساخکردنەوە (پەیدۆزیی، تحقیق) ی دەستنووسەوە بێت، دەبێت پەیدۆزییەکە بە پێی بنەما زانستییەکان بێت و چەند لاپەڕەی کۆپیکراوی دەستنووسەکە و شوێنی وەرگرتنی، کۆد و جۆری دەستنووسەکە (دەستنووس، چاپ، مایکرۆفیلم... هتد) لەگەڵ دابێت.
٨. ئەگەر ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی لە هەڵبژاردنی ناوونیشانی باسەکە، توێژینەوەی بابەت، شێوازی بەکارهێنانی سەرچاوە و ڕێکخستنی

پەراوێزەکان ڕەچاو نەکرابێتن، ئەوا باسەکە لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی بڵاوناکرێتەوە. هەروەها ئەو لێکۆڵینەوانەش کە بە زمانێکی پاراوی زانستی نەنووسرا بێتن فەرامۆش دەکرێن.

٩. دەبێت باسەکە دانەیەکی لەسەر (CD) لەگەڵ (٣) دانەی چاپکراوی سەر کاغەز (A٤) بە فۆنتی (١٥) ی یۆنیکورد بێت، بە مەرجێک ژمارەی لاپەڕەکانی بە لیستی پەراوێز و سەرچاوەکانەوە لە (٢٥) لاپەڕە زیاتر نەبێت و پەراوێزەکانیشی لە کۆتایی باسەکە دابندرێت.

١٠. ئەگەر بابەتەکە وەرگێڕدراو بوو، دەبێت لە زمانی یەکەمەوە بێت و دەقە ئەسڵییەکەشی لەگەڵدا هاوپێچ کرا بێت.

١١. گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی ناساندن و هەڵسەنگاندنی ئەو کتێبانەی لە بارەی کورد و کوردستانەوە نووسراون بڵاودەکاتەوە، بە مەرجێک نووسەر ڕەچاوی پێوەرە زانستییەکانی ئەم بوارەی کردبێت.

١٢. بابەتی نێردراو بۆ گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی نادرێتەوە بە خاوەنەکەی.

# پلانی زاراوەسازی لە تیۆری پلانی زماندا:
# ڕوانگەیەکی ڕێبازمەند بۆ پەرەپێدانی زمانی کوردی

**د. ڕەحیم قادر سورخی**
کۆلێژی زمان – بەشی کوردی – زانکۆی سەلاحەددین

**پوختە**

سوود وەرگرتن و فێربوون پێویستی بە شارەزایی و زانینە کە تەنیا لە ڕێی زمانی زانست و تەکنیکەوە دەکرێ. ئەگەر بمانەوێ زمانی کوردی وەك زمانی نەتەوەیی بەکار بێنین، پێویستە کۆدە زمانییە تایبەتییەکانی جۆری زمانی زانستی – تەکنیکی لە زمانی نەتەوەییشدا بەرفراوان بکەین. ئەمەش پێویستی بە *" پلانی زاراوەسازی لە تیۆری پلانی زماندا"*یە کە *"ڕوانگەیەکی ڕێبازمەندی بۆ پەرەپێدانی زمانی کوردی"*هەبێ. ئامانجی ئەم لێکۆڵینەوەیەش ئەوەیە، گرنگیی پلانی زاراوەسازی لە پەرە پێدانی زمانی زانستی – تەکنیکی کوردی بۆ دەستڕاگەیشتنی خێرای قسەکەرانی زمانی کوردی بە زانست و زانیارییە نوێیەکان لە ڕەوتی جیهانیبووندا بخاتە ڕوو.

زاراوەسازی هەم پێویستی بەپلانە و هەم بەپشتگیریی سیاسی و زانستی بۆ چەسپاندنی. ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵ دەدا لایەنە پێوەندیدارەکان، بڕیاردەر و پلاندانەرەکانی زمان و زاراوەسازی بناسێنێ. بۆ ئەم مەبەستەش، لە کورتەیەك، و دوو بەش پێکدێت: بەشی یەکەم، مەسەلەی لێکۆڵینەوەکە، پێشینە و هۆی هەڵبژاردنی، زاراوەسازی و جۆرەکانی، زمانی تایبەتی و زمانی ئاسایی، پلانی زمانی و پلانی زاراوەسازی لە رووی تیۆری و میتۆدەوە دەخاتە روو. بەشی دووەم، ئیستدلالەکان و پێویستییەکانی زاراوەسازی لە سەردەمی جیهانیبووندا باس دەکات. بەڵگەکانی زاراوەدانان روون دەکاتەوە و قۆناغ و ڕێبازەکانی دانانی فەرهەنگی زاراوەکان دەستنیشان دەکات. لە ئاکامدا بە ئەنجام، پەراوێز، سەرچاوە و کورتەی عەرەبی و ئینگلیزی کۆتایی دێت.

**زاراوە سەرەکییەکان: زاراوەسازی، پلانی زمان، پلانی زاراوەسازی، جیهانیبوون، کەلێنی دیجیتاڵی.**

## پێشەکی

ئـەم لێکۆڵینەوەیـە لێکۆڵینەوەیـەکی تیۆرییـە کـە بەناونیشـانی "*پلانـی زاراوەسازی لە تیۆری پلانی زماندا": (ڕوانگەیەکی ڕێبازمەند بۆ پەرەپێدانی زمـانی کـوردی)* هـاتووە. پلانـی زاراوەسـازی یەکێکـە لـە گـرنگترین چـالاکییەکانی زاراوەسازان لـە کۆمـەڵگا پێشـکەوتووەکان و ئـەو کۆمەڵگایانـەی روو لـە گەشـە و پێشکەوتنن. وەرگری ئەو زاراوانە خـەڵکی ئـەو کۆمەڵگایانـەن. ئەگـەر ئـەم زاراوە پلان بۆ دانراوانـە خێـرا و بـەوەخت، بـژار یـان دروسـت بکـرێن و ببنـە بەشـێك لـە زمانەکە، خەڵکی کۆمەڵگاکەش بەکاریان دێنن.

بێگومان، جگـە لـە هۆکـاری زمـانی لـە پرۆسـەی بـژار، دارشـتن و داهێنـانی زاراوەکاندا هۆکاری نازمانی وەك کولتووری، کۆمەڵایەتی، و سیاسی بۆ وەرگرتن و بڵاوکردنەوە و پەرەپێدانی زاراوەکان هـەن کـە لـە دەرەوەی زمانـەوە کاردەکەنـە سەر پرۆسەکە.

**ئامانجی** ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەوەیە کە پلانی زاراوەسـازی لـە رووی تیـۆری و میتۆدەوە بە شێوەیەکی وەسفی روون بکاتەوە، کارلێککردنی نێوان زمان، کۆمەڵ و پێوەندییەکان وەك سەرەتایەك بۆ بیرکردنەوە و پێداچـوونەوە بـە زاراوەسـازیی کوردی لە چوارچێوەی پلانـی زمانیـدا بخاتـە بـەر بـاس، پلانـی زاراوەسـازی وەك رێگاچـارەیەکی زانسـتییانەی بـژار و داهێنـانی زاراوەکـان بـۆ لایەنـە پێوەندیـدارە زانسـتی و حکومییـەکان (ئەنجومـەنی وەزیرانـی حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتان، وەزارەتی خوێندنی باڵا، پەروەردە، وەزارەتی رۆشـنبیری و ئـەکادیمیای کـوردی) پێشنیاز بکات.

### بەشی یەکەم: پلانی زاراوەسازی لە رووی تیۆری و میتۆدەوە

#### ١. مەسەلەی لێکۆڵینەوەکە

پلانی زاراوەسازی بەشێکە لە پلانی زمانی کە یەکـەم جـار هـاگن (Haugen) لە دەیەی (١٩٦٠) هێنایە ئاراوە. لە پاش ئەویش چەندین پێداچوونەوەی بـۆ کـرا. دوایـن جـار لـە لایـەن کـوپێر (Cooper, R. L) و بەڵـدەوف (Baldauf)ەوە لـە (١٩٩٧: ٢٩)دا پێداچـوونەوەی بـۆ کـرا کـە پێیـان وابـوو پلانـی زمـان دەبـێ لـە

دەوروبـەری کۆمەڵایەتیـدا بەڕێوەبچـێ و رەچـاونەکردنی هۆکـارە کۆمەڵایـەتی – زمانییەکان، وەك ڕوانگـە یـان پێویسـتیی ئـەو گرووپانـەی پلانیـان بـۆ دادەنـرێ، پلانەکـە بـەرەوڕووی شکسـت دەکاتـەوە. بەگشـتی، پلانـی زاراوەسـازی بـە پێـی دەوروبەرەکــەی دەتوانــێ فــۆرمی جیــاواز وەربگــرێ. لــە بــاری نەتەوەییيــەوە زاراوەسازی دەتوانێ لە شێوەی بەڵگەنامـە یاسـاییيەکاندا دەرکـەوێ. وەك بـواری زمان، میدیا و زانیارییە سیاسییەکان، بۆیە پێویسـتە پلانێـك هـەبێ بەشـێوەیەکی بنەڕەتی و زانستی زاراوەکان ڕێکبخات.

کێشەیەکی لەم رووەوە دێتە سەر ڕێی پلانی زاراوەسـازیی کـوردی، ئەوەیـە کە لەلایەك، تەنیا لە چوارچێوەی پارچەیەکی کوردستان، واتە لە باشـوور دەکـرێ لە بواری نەتەوەیی کار بۆ پلانێکی پێڕەومەندی زمـانی کـوردی بکـرێ کـە فـۆرمی بەڵگەنامە یاساییيەکان بەخۆ بگرێ. کۆمەڵەی زمانی کوردی وێـڕای قسـەپێکەرانی بن دەستە. لەبەر ئـەوەش، بـە شـێوەیەکی دیموکراتییانـە ناتوانـێ مـافی زمـانیی خۆی بەکار بێنێ و بڕیار لە بارەی پلانی زمانی، سیاسەتی زمان یـان زاراوەسـازی بــدا؛ هــەر بــە بــواری زاراوەســازییەکی ئاســایی و نافــەرمی و ناوچــەیيیەوە بەستراوەتەوە. هەروەها زمـانی نەتـەوەی سەردەسـت یـان زمانـە باڵادەسـتەکانی دیکـەی وەك ئینگلیـزی وەك جێگرەوەیـەکی زمـانی زگمـاکی بـۆ بەدەسـتهێنانی زانسـت و زانیـاری لـە بوارەکـانی تـەکنۆلۆژی و تەنانـەت یاسـاییش بـەکار دێنـێ. لەلایەکی دیکەشەوە لەو شوێنەی کورد دەتوانێ بڕیار لە بارەی پلانی زاراوەسازی و زمـانیی خـۆی بـدات، گـیرۆدەی جیـاوازیی نێـوان زارەکـان بـووە و هــەروەها زەرفییـەتی زانسـتی و سیاسـیی ئەوتۆشـی نییـە، بـە شـێوەیەکی سـەردەمییانە زمانەکەی لەم تەنگاوییە دەربێنێ. بۆ نموونـە، لـە هـەرێمی کوردسـتان سـەرەڕای ساغبوونەوەی ئـەکادیمیای کـوردی، لـە نـاو حکومەتـدا دوو حیزبـە سـەرەکییەکە لەسەر ناوێکی سادە بۆ توێژێکی وەك ئەوەی لە ئینگلیزی (Student)ی پێـدەڵێن، ڕێك نەکەوتوون کە بە "خوێندکار" یان "قوتابی" ناوی بەرن، لە ئەنجامدا هەردوو ناوەکە لەپاڵ یەکدا بۆ ئەم چەمکە بەکار دێنن. ئەمە دەریدەخات کە تەنانـەت لـە ئاستی حکومیشدا بەرهەمهاتنەوەی دەسەڵاتە ناوچەیی، حیزبـی و کلاسـیکییەکان

بەربینگی زمان بەرنادا و ئەو شوێنەی دەبێ شوێنی بڕیاردان لەسەر زمان بێت، خۆی گیرۆدەی حیزبیبوون و ناوچەیی بوونە و هەر ئەم بارە سیاسی — کۆمەڵایەتییەی دەسەڵات لە زمانیشدا دەنوێندرێتەوە.

بەم پێیە زاراوەسازیی کوردی ناوچەیی و دامەزراوەییە. چونکە پلانی زمان و پلانی زاراوەسازی لە ئارادا نییە، چەمك و شتەکان لە نێو ڕێکخراوە حکومی و ناحکومییەکانی هەرێمی کوردستان لەلایەك و لەلایەن تاکە ڕۆشنبیر و ڕۆژنامەنووسەکان، هەندێ دامەزراوەی دیکەی وەك ئەنیستیتۆی کورد لە پاریس و حیزبە سیاسییە جۆراوجۆرەکانی پارچەکانی کوردستانەوە زاراوەیان بۆ دادەنرێ. بۆ توێژێکی چالاك و بەرچاوی وەك ژنان، لە زاراوە فەرمی و یاساییەکانی حکومەتدا بە هەمان شێوە خێڵەکی و ناوچەییەکەی (ئافرەتان) و (ژنان) بەکار دێت. "لەبەر ئەوەی زاراوەسازانی کورد لە کاری زاراوە (سازیدا) یەك ڕا نین، بۆیە لەم بوارەدا دوو دیاردەی نابەجێ دەردەکەوێ: بەهەڵە داتاشینی زاراوە ؛ دانانی لە زاراوەیەك زۆرتر بۆ یەك واتا" (شەهاب شێخ تەییب، ٢٠١٢: ١٩٦).

لێکدابڕاویی خوێندەوار و لێکۆڵەرانی کورد لە یەکتر و دەست ڕانەگەیشتنیان بە سەرچاوە نووسراوەکان، وای کردووە کە کەلەپووری زانستیی کوردی فەرامۆش بکرێ و ئەو وشە و زاراوە زانستییانەی لە کتێب و وتارە کۆنەکانماندا هەیە، لە لایەن لێکۆڵەرە تازەکانمانەوە بەکار نەیە (کەمال جەلال غەریب، ٢٠١٢: ٢٢). ئەمەش ڕێگەچارە زانستییەکانی ئاڵۆزتر کردووە. لە ڕاستیدا زاراوەکان تەنیا ئاراستەیەکی ئاسۆیی و یان لە خوارەوە بۆ سەرەوەیان وەرگرتووە. چونکە لایەنی حکومی لەم پرۆسەیەدا پشکێکی ستوونی و لەسەرەوە بۆ خوارەوەی نییە، و بۆخۆشی وەك تاك و دامەزراوە مەدەنییەکانی تر بەشێوەی ئاسۆیی لەگەڵ زمان ڕەفتار دەکات. هەربۆیە، ئەگەر پلانێك یان هەوڵێکی دامەزراوی و تاکیی پیشەییش هەبێت، لە بواری بەڕێوەبردن و پابەندی و پیادەکردنەوە تووشی گرفت دەبێتەوە.

### ٢. پێشینە و هۆی هەڵبژاردنی لێکۆڵینەوەکە

پێویستیی بە کۆکردنەوە و تۆمارکردنی زاراوەکان ئەو کاتـە دەسـتی پێکـرد کە زمانە پسـپۆرانە و تەکنیکییـەکان سـەریان هەڵـدا. هەرچـەند پێڕەومەنـدکردنی زاراوەسازی و پێگە زانستییەکانی لەم دواییانەدا پەرەی سەندووە، چالاکییەکانی ئەم بوارە لە رووی مێژووییەوە زۆر زووتر دەسـتی پێکـرد. لـە سـەدەی هـەژدەدا لێکۆڵینەوە لە زانسـتی کیمیـا، رووەك ناسـی و زینـدەوەر ناسـی بـۆ دانـانی نـاوی چـەمکە زانسـتییەکان حـەزی بـەردەوامی هـۆگرانی راسـتەقینە و پسـپۆرانی ئـەم بوارانە بوو. لەبەر گەشەکردنی نێونەتەوەیی زانست لە سەدەی نۆزدەدا بۆ زانایان پێویست بوو، کۆمەڵە رێسایەکیان لەبـەر دەسـتدا بێـت بـۆ رێکخسـتنی زاراوەکـان تـاکو بـۆ لقـە زانسـتییەکەی خۆیـان ئاشـکرا بێـت. رووەك ناسـەکان (لـە ١٨٦٧)، زیندەوەر ناسەکان (لە ١٨٨٩) و کیمیاناسەکان (لـە ١٨٩٢)دا ئـەم پێویسـتییەیان لە کۆبوونەوە نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بەخۆیاندا خستە روو.

سەرەتای زاراوەسازی بە شێوە نوێیەکـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ کارەکـەی (ئـی. فۆستەر)[1] لە دەیەی ١٩٣٠دا. فۆستەر لە تێـزی دکتۆرایەکەیـدا بەڵگـەکانی بـۆ بـە پێڕەومەنـدکردنی ڕێبازەکـانی کـارکردن لـە زاراوەسـازیدا خسـتە روو. ئـەو زاراوەسـازیی وەك ئامرازێـك دەزانـی کـە دەبـێ بـە شـێوەیەکی کاریگـەر بـۆ رەواندنەوەی تەمومـژ لـە پێوەندییـە زانسـتی و تەکنیکییەکانـدا بـەکار بێـت. لـەو کاتـەدا زیـاتر گرنگیـی بـە رێبـاز و پێوەرەکـانی زاراوەسـازی لـە بەرانبـەر لایەنـە تیۆرییەکەیدا. پاشان لە کۆڕێکدا بۆ کردنەوەی *"ناوەندی زانیـاریی نێودەوڵـەتیی زاراوەناسی"* [2] لە ١٩٧٥ فۆسـتەر خـۆی، چـوار کەسـی وەك باوکـانی روونـاکبیری تیـۆری زاراوەناسـی نـاو بـرد: (ئـەی. سـکۆڵمان[3] لـە ئاڵمـان، یەکـەم کـەس کـە سروشتی پێڕەومەندی زاراوەکانی لەبەرچاو گـرت)، (فێردینـاد.دی. سۆسـێر[4] لـە سـویس، یەکـەم کـەس سـەرنجی دایـە سروشـتی پێڕەومەنـدیی زمـان)، (ئـی. درێسـێن[5] لـە رووسـیا، پێشـەنگی پێـداگریی لەسـەر بەسـتاندارد کـردن و هێـزی بنەڕەتی پشت فیدراسـیۆنی نێودەوڵـەتی ئەنجومـەنی نەتـەوەیی سـتاندارد کـردن ISA)[6] و (جەی. ئی. هۆلمسـترۆم[7] لـە بریتانیـا، یەکـەم کـەس کـە بـووە هـۆی

بڵاوبوونەوەی زاراوەسازی لە ئاستی نێودەوڵەتی لە یونسکۆ و بوونی ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی ئەوتۆی بۆ ئەم بابەتە بە پێویست زانی).

**بەکورتی ڕەوتی پێشکەوتنی زاراوەسازی چوار قۆناغ بوو:**

١. قۆناغی سەرهەڵدان (١٩٣٠ – ١٩٦٠)، لە ڕێگای میتۆدەکانی پێکهاتنی پێڕەومەندیی زاراوەکانەوە یەکەم دەقە تیۆرییەکان لەلایەن فۆستەر و لۆتێ[٨] دیاری کرا.

٢. قۆناغی ڕۆنان و داڕشتنی بوارەکان (١٩٦٠ – ١٩٧٥)، لەم قۆناغەدا گرینگترین داهێنانەکانی بواری زاراوەسازی لە ڕێگای کۆمپیۆتەرە گەورەکان و تەکنیکەکانی بەڵگەسازییەوە سەری هەڵدا. یەکەم بانکەکانی زانیاری و ڕوانگەکانی بەستاندارکردنی زاراوەکان لە زماندا دروست بوون.

٣. قۆناغی ڕەواج و برەو (١٩٧٥ – ١٩٨٥)، ئەم قۆناغە بە زۆربوونی پلانی زمان و پرۆژەکانی زاراوەسازی دەناسرێ. وڵاتانێکی وەك یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو و ئیسرائیل  سیاسەتی زمانیی تایبەت بە خۆیان دەست پێکرد. گرنگیی ڕۆڵی زاراوەسازی لەم قۆناغەدا دەردەکەوێ.

٤. قۆناغی فراوانبوون و پەرەسەندنی (١٩٨٥ – تا ئێستا)، لەم قۆناغەدا هەندێ بابەتی نوێ شایانی ئاماژە پێکردنن. کۆمپیوتەر وەك گرینگترین هێزی پشت گۆڕانی زاراوەسازییە، زاراوەناسان ئامراز و کەرەستەی تایبەتیی خۆیان لەبەردەستە بەکاری بێنن. پێوەندیی نێودەوڵەتی لە ڕێی تۆڕی پێوەندییەکانەوە ئاسان بووە. مۆدێلی زاراوەسازی پەیوەست بووە بە پلانی زمانەوە، کە پێویستە بۆ گەشەسەندنی وڵاتەکان (**بڕوانە**: Cabré, M. T, 1999: 5- 7).

لە زمانی کوردیشدا هەوڵی بەجێ و بەسوود دراوە لە لایەن کەسانی وەك **جەمال نەبەز**، "**هەندێ** زاراوەی زانستی"(١٩٦٠)؛ ***کامیل حەسەن بەسیر***، "زاراوەی کوردی" لە ١٩٧٩دا، **کەماڵ جەلال غەریب** لە کتێبی "پرۆژەی زاراوەی زانستیی کوردی"(١٩٨٧)دا؛ ***مەسعوود محەمەد*** لە کتێبی "زاراوەسازی پێوانە" لە (١٩٨٨)دا؛ **محەمەد وەسمان** لە کتێبی"گیروگرفتەکانی زاراوەدانان لە زمانی

کوردیدا" (٢٠٠٤)، نامەی ماستەری **رۆژان عەبدوڵلا**، بە ناونیشانی "فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی" (چاپکراو، ٢٠٠٧)، **جەمال عەبدول** لە کتێبی "بەرکولێکی زاراوەسازی کوردی"دا لە (٢٠٠٨)دا و لیژنەی زاراوەسازی ئەکادیمیای کوردی و هەوڵی لێکۆڵەرانی تری بوارە جیاجیا زانستییەکان و هتد. بەلام ئەم هەوڵانە هەرکامە بەپێی بارودۆخی تایبەت و تاکە کەسییانە لە دەرەوەی پلاندانانی زمان و زاراوەدا هاتوونەتە ئاراوە. لە ئاستی سەرەوە بۆ خوارەوە پشتگیرییەکی دامەزراوەیی و سیاسییان نەبووە. لە هەمان کاتیشدا، ئەم بەرهەمانە خۆشیان لەچاو ئەو هەموو تیۆر و لێکۆڵینەوانەی لەباری زاراوەسازییەوە بە زمانانی دیکە هەن و ئەو هەموو پێویستییەی لە ئاستە جیاجیاکاندا لە زمانی کوردیدا هەیە، کەم و ناتەواون.

### ٣. زاراوە و زاراوەسازی

ئاشکرایە کە زاراوەکان توخمە سەرەکییە پێکهێنەکانی زمانی (زانستی — تەکنیکی)ن. مەبەست لە زاراوە[٩] بێژێکە کە لانی کەم لە لقێکی زانستی — تەکنیکی، پیشەیی یان هونەریدا ئاماژە بە چەمکێکی دیار دەکات (گروە واژە گزینی، ١٣٨٨: ١٩). زاراوە لە رووی رۆنانەوە شەش جۆرە کە چوار جۆریان لە رێگەی پرۆسە سروشتییەکانی وشەسازییەوە دروست دەبن: زاراوەی (سادە، دارێژراو، لێکدراو، لێکدراوی دارێژراو). دوو جۆرەکەی تریش بریتین لە گرێ یان دەستەواژەیەکی سینتاکسی و فۆرمە کورتکراوەکان. کەواتە، لە زاراوەسازیدا بێجگە لە دروستکردنی وشە بە شێوە ئاساییەکەی وا لە زماندا روودەدات، پێویستیمان بە وشە دروستکردن، واتە "زاراوەسازی"یە. ساگێر (Sager, 1990:3) پێی وایە کە "تێرمینۆلۆجی[١٠]" دەکرێ بە سێ واتا بێت:

١. کۆمەڵێ چالاکی و رێباز کە بەکاربێت بۆ کۆکردنەوە، وەسفکردن و پێشکێشکردنی زاراوەکان [زاراوە سازی] و [رێنمایی و دەستوورەکانی کاری زاراوە نووسی ].

٢. تیۆرێك، واتە، كۆمەڵێ گریمانە، ئیستدلال و ئەنجامی پێویست بێت بۆ روونكردنەوەی پێوەندیی نێوان چەمكەكان و زاراوەكان كە بۆ چالاكییەكی پێوەندیدار بە خاڵی یەكەمەوە بنەڕەتییە [زاراوەناسی].

٣. كۆی وشە تایبەتەكانی بابەتێكی تایبەتی بێت [فەرهەنگی زاراوەكان].

ئەم لێكۆڵینەوەیە بۆ هەرسێ چەمكەكە هاوتای تایبەتی كوردی بەكار دێنێ:

أ). **زاراوەناسی:** ئەو بنەما و چەمكانەی بەسەر تاوتوێكردنی زاراوەكاندا زاڵە (Cabré, M. T, 1999: 32). لە زاراوە و چۆنێتی بەكارهاتنەكانی دەكۆڵێتەوە. پاشگری (Logy-) بە واتای (زانین یان ناسین)ە، وەك لە زانستە مرۆڤایەتییەكانی وەك كۆمەڵناسی[11] و دەروونناسی[12]یدا بەم واتایە بەكارهاتووە. هەركات بمانەوێ بەرانبەر بە وشەی "تێرمینۆلۆجی" ئینگلیزی، "زاراوەناسی" بەكار بێنین، ئەوا مەبەستمان دەبێ (تاوتوێكردنی زاراوەكان و شێوەی بەكارهاتنەكانیان) بە شێوە ئەبستراكت و تیۆرییەكەی بێ.

ب). **زاراوەسازی،** "كۆمەڵێ چالاكی و رێباز كە بەكارهاتووە بۆ كۆكردنەوە، وەسفكردن و پێشكێشكردنی زاراوەكان؛ (بۆچوونەكەی ساگێر). ئەو چالاكی و رێبازانەی لە هەڵبژاردن، داتاشین و دروستكردنی وشەی نوێ بۆ چەمكی نوێدا بەكار دێن. لە لێكۆڵینەوە زمانییەكانی زمانی كوردیدا (تێرمینۆلۆجی) زیاتر بەم واتایە بەكار هاتووە. نەك بەو جۆرەی (مۆرفۆلۆجی[13]) هاوتای "وشەسازی" بۆ دانراوە. چونكە لێرەدا زیاتر زانستی مۆرفیم یان مۆرفیم ناسی مەبەستە، و باس لە چۆنێتی پێكهاتنی دەكات. نەك لە دروستكردنێكی مەبەستدار و پلان بۆدانراو. توێژەری ئەم باسە، "زاراوەسازی" بەكاردێنێ، چونكە لێرەدا زیاتر جەخت دەخرێتە سەر لایەنە كارەكییەكەی و ئەمەش لە لایەنە ئابستراكتەكەی جیای دەكاتەوە و لەگەڵ (زاراوەی پلان/پلاندانان)دا گونجاوترە؛ پلاندانان كارێكی مەبەستدارە بۆ "دروستكردن"ی وشەی نوێ بەرانبەر چەمك و شتە نوێیەكان. كەواتە، لێرەدا، "**زاراوەسازی بریتییە لە پرۆسەیەكی دروستكردنی وشەی نوێ كە تێیدا بۆ چەمكێكی تایبەتی زانستی یان تەكنیكی یان پیشەیی و هونەری لە باری ئاساییدا بێژێك یان لە هەندێ باردا زیاتر لە یەك بێژ بژار یان دروست دەكرێ**. واتە

زاراوەسازی پرۆسەیەکی هەڵسەنگێندراو و زانستییانەیە بۆ دۆزینەوە یان دروستکردنی زاراوەیەك بۆ یەك چەمکی دیاریکراو لە بوارە زانستی، تەکنیکی، هونەری یان پیشەییەکاندا (گروه واژه گزینی، ١٣٨٨، ٢٠).

ج) ئەو رێنمایی و دەستوورانەی بۆ کاری فەرهەنگی زاراوەنووسی بەکار دێن (Cabré, M. T, 1999: 32).

### ٤. پێناسەکردنی زاراوەکان بە پێی بوارە تایبەتییەکەیان

ئەوەی لە زاراوەسازیدا گرینگە رەچاو بکرێ، بواری بەکارهاتنی زاراوەکەیە. ئەوەی کە زاراوەکە لە چ بوارێکدا بەکار دێ؟ ئەرکەکەی چییە؟ ناوە بۆ شتەکان یان ئاماژەیە بۆ چەمکەکان و پێوەرەکانی دەستنیشانکردنی چین؟

بابەتێکی توێژینەوە تەنیا ئەو کاتە دەچەسپێ، لە نێو بوارێکی زانستدا پێناسە بکرێ. بەم واتایە، بواری توێژینەوەی زاراوەسازی بە پێی شوێنەکەی لەناو بوارێکی زانستیدا پێناسە دەکرێ. (Cabre,M.T, 2000: 43). ئەم لێکدانەوەیە دەکرێ لەم خاڵانەدا روون بکرێتەوە:

١. بۆ زمانناسی، زاراوەکان سەر بە فەرهەنگی وشەکانی رێزمانێکن و بە پێی پێوەرە جۆری، پراگماتیکی و سیمانتیکییەکان دەستنیشان کراون.

٢. بۆ شتە تایبەتەکان، زاراوەکان ئامرازێکی دەربڕینی پیشەیی و پێوەندین و بەشێکن لە سیستمێك بۆ نواندنەوەی پێکهاتەی زانست لە نێو بوارە تایبەتەکاندا.

٣. زاراوەکان بۆ وەرگێڕان، لێکدانەوە و نووسینی هونەریی سوودمەندن و یەکەی کرداری پێوەندین کە بە پێوەری هاوسەنگ، یەکسان، ورد و ئابووری هەڵدەسەنگێندرێن.

٤. بۆ پلانی زمانی زاراوەکان ئەو یەکە فەرهەنگییانەن کە پێویستییان بە دەستوەردانە بۆ پاڵپشتی هەبوون، سوودمەندی و مانەوەی زمان وەك ئامرازێکی دەربڕین. (Cabre,M.T, 2000:47)

بە پێی هەرکام لەم لێکدانەوانە زاراوەکان دەبنە خاوەنی سروشتێکی سێ لایەنە: زمانی، هۆشەکی/ناسین، و کۆمەڵایەتی.

### ٥. جۆرەکانی زاراوەسازی

جۆرەکانی زاراوەسازی بەپێی دوو پێوەری گشتی دیاری دەکرێ. یەکەمیان بە هۆی ژمارەی ئەو زمانانەی دەیگرنە بەر (تاك زمانەیە یان فرەزمانە) و دووهەم ئەوەی کە تاوتوێکردنەکەی تاکلایەنە و تاکەکەسییە یان پێڕەومەندە (Cabré, M. T, 1999: 129). کە لێرەدا ئەمەیان بە گرنگ دەزانین و روونی دەکەینەوە.

١. **زاراوەسازیی تاك لایەنە**[١٤]، کە بە تاکە زاراوەیەك یان ژمارەیەکی سنووورداری زاراوەکانەوە خەریك دەبێت. زاراوەسازیی تاك لایەنە، لە وەرگێڕانە تەکنیکی و پیشەییەکاندا باوە، لەو شوێنەی کە زاراوەیەکی تایبەت (یان گرووپێکی زاراوە تایبەتەکان) بە خێرایی پێویست دەبێ بۆ چارەسەرکردنی کێشەی وەرگێڕانێکی تایبەت، ئەم جۆرەی زاراوەسازی زیاتر تاکەکەسییانەیە.

باری زاراوەسازی کوردی ئێستا زیاتر بەلای ئەم جۆرە لە زاراوەسازیدا کەوتووە. چ لە ئاستی حکومەتی هەرێمی کوردستان و چ لە ئاستی نێودەوڵەتی لەلایەن ئەو ناوەندە کوردییانەی لە دەرەوەی هەرێمی کوردستانن. ئەم جۆرەی زاراوەسازی بەتایبەتی لەکاتی کردنەوەی خول و پێشانگاکان وا لەلایەن کۆمپانیاکانی بازرگانی و رێکخراوە مەدەنییەکانەوە بەڕێوە دەچێ، باوە.

لە دەرەوەی کوردستان بۆ پێوەندییەکی رۆژانەی پەنابەرانی کورد و کاربەدەستانی بواری پەنابەری و خەڵکی ئەو وڵاتانەی لێیان نیشتەجێن بەکاردێ.

٢. **زاراوەسازیی پێڕەومەند (سیستمی)**[١٥]، جۆرێك زاراوەسازیی بە کۆمەڵە کە دەچێتە چوارچێوەی پلانی زاراوەسازییەوە، پێوەندیی بە هەموو زاراوەکانی بابەتێك لە ژینگەیەکدا یان چالاکییەك لە بوارێکی تایبەتەوە هەیە. زاراوەسازی وەك پێڕەوێك زۆرجار پێوەندیی بە وەرگێڕانەوە هەیە لە پاڵ فێربوون و وەرگێڕان لە زانکۆ و قوتابخانەکاندا و بەشەکانی وەرگێڕانی دامەزراوەکاندا. بەڵام زاراوەسازی بە وەرگێڕانەوە نابەسترێتەوە، دەکرێ تایبەت بەبواری پیشەسازیی تەکنیکی و دامەزراوەکانی ستانداردکردن بێت کە فەرهەنگی زاراوەی تایبەتی دادەنێن بە مەبەستی دڵنیابوون لە رێککەوتن لەسەر بەکارهێنانێکی چەسپاوی زاراوە پیشەسازییە تایبەتییەکان و بوارە تایبەتە فەرمی و زانستییەکان.

### ٦. زمانی ئاسایی و زمانی تایبەتی

زمانناسی لە نێوان زمانی ئاسایی (زمانی رۆژانەی خەڵك) و زمانی تایبەتی (زمانی تایبەتی ـ تەكنیكی) جیاوازی دادەنێ. بە تایبەتی زمانی ئاسایی گرێدراوی لایەنە سۆزداری و كەلتوورییەكانە. بەڵام، "كۆمەڵێك لە دیاردە زمانییەكان لە بوارێكی دیاری پێوەندیكردن و گەیاندندا روودەدەن و بەهۆی كەس، مەبەست و هەلومەرجی تایبەتەوە سنووردار دەكرێن. (Hoffmann, 1979: 16)[١٦]. ئەمەش جۆرێك لە تایبەتمەندبوونی ئەم دیاردە زمانییانە دروست دەكات. ئەم لێكۆڵینەوەیە زیاتر گرینگی بە زمانی تایبەتی و پسپۆرانە دەدا و سێ ئەركی بۆ دیاری دەكات:

١. بەدیهێنانی پێوەندییەكی ژینگەیی (دەوروبەری زانستی)؛ ٢. نواندنەوەی زانستی.

٣. دەست راگەیشتن بە زانیاری تایبەتی؛

ئەم زمانە تایبەتە، چ وەك زمانێكی تەكنیكی و چ وەك زمانێكی زانستی ناو بەرین، "لەگەڵ زمانێك لە هەناوی زمانێكی دیكەدا بەرەوڕووین. ئەمەش هەر ئەو زمانەیە كە لە زاراوەی زمانناسیدا بە" جۆری كارەكی"[١٧] ناو دەبرێ. بەڵام، زمانی زانست یان تەكنیك لقی جۆراوجۆری هەیە و هەر لقێكیش زاراوەی تایبەت بە خۆی هەیە. كەواتە بە پێی بواری زانستیی تایبەت، جۆری كارەكیی تایبەتی زمانیش هەیە. بۆیە، دەوری زاراوەسازی لە بەدیهێنانی پێوەندییەكی ژینگەیی بواری زانستیدا گرینگە، وەك زمانی فیزیا، زمانی یاسا و زمانی كۆمپیوتەر. سەرەڕای ئەوەش جۆرە تایبەتەكانی زمانی زانست هەندێ تایبەتمەندیی هاوبەشیان هەیە، كە دەكرێ بە پێی ئەم تایبەتمەندییە هاوبەشانە لە (زمانی زانست) بە واتا گشتییەكەی بدوێین. هەر ئەم تایبەتمەندییانەشن كە لە زمانی ئاسایی و رۆژانە جیای دەكەنەوە. ئەمانەش بریتین لە:

١. زمانی تایبەت خاوەنی لایەنێكی واتاییە، و تا رادەیەكی زۆر ئاشكراو وردە و دوورە لە هاودژیی ناوخۆیی.

٢. ئەرکی سەرەکیی زمانی زانست زانیاری گەیاندنە نەك جوانی ئافرینی و دەربرینی سۆز، بۆیە زمانی زانست بۆ هەر لقێکی زانستی زاراوەی تایبەت رێك دەخا. کە بۆ خاوەن ڕایانی ئەو بوارە زانستییە ناسراوە، بەڵام بۆ غەیری ئەوان نەناسراوە. (گروه واژه گزینی، ١٣٨٨:٢٥)

هەروەك ئاماژەی پێکرا، مەبەست لە زمانە تایبەتەکان، زمانی بوارە جۆراوجۆرە زانستی– تەکنیکییەکانە. ئەندامانی ئەم بوارە بە گشتی لەسەر رێککەوتنە زمانییەکانی خۆیان کۆکن. هەڵبەت ئەم جۆرە رێککەوتنە زمانییانە لەسەر پەیکەری زمانی سروشتی رێك دەخرێ و پوخت دەکرێ، و لە هەموو بوارەکانی رێزمان واتە فۆنۆلۆلۆژی، مۆرفۆلۆژی، سینتاکس و سیمانتیکدا هەر لە بنەڕەتەوە گرێدراوی زمانی سروشتییە. بەڵام، پابەندی رێککەوتنەکانی زمانی سروشتی و ئاسایی نییە. لەو رووەوە کە کۆمەڵگە نوێیەکان بە چڕی لەبەر کارتێکردنی پەرەسەندنی زانست و تەکنۆلۆژیدان، زمانە تایبەتەکانیش کاریگەرییەکی بەرچاویان لەسەر زمانە سروشتی و ئاساییەکان هەیە. چونکە زانست و تەکنۆلۆژی ژێرخانی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و ئابووری پێکدێنن، کارلێککردنی نێوان زمان و چالاکییە ئابوورییەکان بە تەواوی بەڵگە نەویستە. بە جۆرێك کە "توانای رێژەیی" زمانی کۆمەڵێك بە شێوەی ئاسایی پاش ماوەیەك کارکردی ئابووری ئەو کۆمەڵە دەردەخاتەوە.

زاراوەکان لەوانەیە لە وشەی سادە یان ئاڵۆز (زاراوەی فرە وشە) بە سیمای مۆرفۆلۆژی ـ سینتاکسی و مۆرفۆلۆژی ـ واتایی تایبەت دروست کرابن، کە هەندێ جار لە زمانی ئاساییدا نەناسراون. بەڵام دەکرێ لە بوارێکی پسپۆریی دیاریکراودا بەکار بێن.

زاراوەسازی لەسەر ئەرکی کاریگەریی ناودانان لە بوارە پسپۆرەکاندا دانراوە. بۆیە، زۆرجار جیاکردنەوەی وشە لە زاراوە یان ناو لە زاراوە زەحمەتە. کارلێککردنی زمانە تایبەتی و زمانە ئاساییەکان زۆر چالاکە و بەردەوام کەرەستەی وشەیی بۆ هەر دوو لا دەچێ.

١. بە وشە بوون[١٨]: زاراوە تایبەتییەکان دەبنە وشەی بە تەواوی باوی زمانی ئاسایی.

٢. بەزاراوە بوون[١٩]: وشە ئاساییەکان دەبنە زاراوە یان بەشێك لەو (UNESCO, 2005: 10).

## ٧. چوارچێوەی تیۆری و ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە

پلانی زاراوەسازی لقێکی بچووکی ناو پلانی زمانە، پلانی زمانیش سەر بە زمانناسیی کارەکییە. زمانناسیی کارەکی[٢٠] بوارێکی بەرفراوانی نێوان زانستی توێژینەوە زمانییەکانە کە بە چارەسەری کێشەکان و پێشکەوتنی ئەو بارانەوە خەریك دەبێ کە پێوەندییان بە زمان و بەکارهێنەکانی و بەکارهاتنەکانییەوە هەیە. "زاراوەسازی وەك لایەنەکانی تری پلانی پەیکەرسازی[٢١] دەکرێ هۆیەك بێت بۆ هەڵبژاردنی کۆدەکان" (A.B.Edem, 2000: 10).

لە سەدەی هەژدە و نۆزدەدا، لێکۆڵەران بە هۆی زۆربوونی زاراوەکان وەئاگا هاتن و زیاتر نیگەرانی فرەیی و جۆراوجۆریی زاراوەکان و پێوەندیی نێوان فۆرم و چەمکەکان بوون. گرنگیی تیۆری لە بارەی سروشتی زاراوەکانەوە دواتر سەری هەڵدا، ئەوکاتەی کە کاری زاراوەسازی دەبوو لە هەندێ بواری تایبەتدا بە شێوەیەکی کرداری ڕێك بخرێ. تەنانەت، تا ئێستاش لە ڕێگای ئەزموونێکی تاقیکارانە و پراکتیکییەوە، واتە پێویستیی چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی بنەمای زمانییان هەیە لە پێوەندیکردندا، پاڵنەری سەرەکیی لێکۆڵینەوە لەم بوارەیە. کارەکە لە دەیەی (١٩٣٠)دا، هاوکات، بەڵام بە جیا و سەربەخۆ لەلایەن لێکۆڵەرانی (نەمسایی، سۆڤیەتی و چێکی)یەوە بەڕێوەچوو، بنەمایەك بوو بۆ دەستپێکردنی ئەوەی نەمساییەکان ناویان نا *زانستی زاراوەسازی*. سێ قوتابخانە کلاسیکییەکەی زاراوەسازی (*قوتابخانەی نەمسایی، سۆڤیەتی و چێکی*) هەموویان لەمەوە سەریان هەڵدا. بە سەیرکردنی ئەم سێ قوتابخانەیە سێ ڕوانگەی جیاواز دەتوانین دەستنیشان بکەین کە بەرانبەر بەیەك ناتەبا نین:

١. یەکەم ڕوانگە ئەوەیە کە زاراوەسازی وەك لقێکی نێوان زانستی سەیر دەکات، بەڵام وەك بابەتێکی سەربەخۆ لە خزمەت لقە زانستی و تەکنیکییەکاندا.

٢. ڕوانگەی دووەم، جەخت دەخاتە سەر فەلسەفە، کە بەشێوەیەکی بنەڕەتی هۆگری پۆلینکردنی مەنتیقییانەی پێڕەوی چەمکەکان و ڕێکخستنی زانستە.

٣. ڕوانگەی سێیەم گرنگی دەدا بە زمانناسی، کە زاراوەسازی وەك لقێکی خەزێنەی وشەکانی زمان[٢٢] سەیر دەکا. زمانە تایبەتەکان پێڕەوی بچووکتری پێڕەوی گشتی زمانن.

تیۆری گشتیی زاراوەسازی لەسەر ڕوانگەی یەکەم دامەزراوە کە تێیدا سروشتی چەمکەکان، پێوەندیی چەمکەکان، پێوەندیی نێوان زاراوەکان و چەمکەکان و تایبەتدانی زاراوەکان بە چەمکەکان گرنگیی بەراییان هەیە. لێرەشدا ڕوانگەی یەکەم، وەك ڕوانگەیەکی نێوان زانستی پێڕەو دەکرێ. ئەم چڕبوونەوەیە لەسەر جووڵان لە چەمکەکانەوە بەرەو زاراوەکان، ڕێبازەکانی زاراوەسازی لەو ڕێبازانەی بۆ فەرهەنگنووسی بەکارهاتوون جیا دەکاتەوە. ئامانجی سەرەکی ئەوانەی فەرهەنگی زاراوەکان دادەنێن، ئەوەیە کە ناوەکان تایبەت بدەن بە چەمکەکان. واتە، لە چەمکەکانەوە بەرەو زاراوەکان دەچن (پرۆسەیەکی ئانۆماسیۆلۆجیکی)[٢٣]. لە بەرانبەر ئەمەدا، فەرهەنگ نووسان بە وشە دەست پێدەکەن (دەروازەی فەرهەنگی) و لە ڕووی ئەرکی و واتاییەوە، وەسفی دەکەن، واتە ئەوان بە ئاراستەیەکی جیا (پرۆسەیەکی سیماسیۆلۆجی)[٢٤] لە وشەوە بەرەو چەمك دەچن (Cabré, M. T, 1999: 7).

### ٨. پلانی زمان و پلانی زاراوەسازی

لە ڕوانگەی کوپێر (Cooper, 1985: 45)ەوە پلاندانان بۆ زمان "*هەر چەشنە هەوڵێکی مەبەستدارە بۆ شوێن دانان لەسەر ڕەوشی زمانی ئەوانی دیکە لە ئاستی فێربوون، ڕۆنان [پەیکەرە]، یان ئەرکپێدان بە کۆدە زمانییەکانیان [پێگەسازی]*". بەشێکی زۆر جێگای سەرنج لە پلانی زمانیدا پێشخستن و

بەرفراوانکردن و ستانداردکردنی خەزێنەی وشە پسپۆرییەکانە. لەم بەشەدا، بوارەکە لەگەڵ پلانی زاراوەسازی یەکتر دادەپۆشن. پلانی زمانی ئامانجی پەرەپێدانی زمان وەك ئامرازێکی ئەرکی لە پێناو پێوەندییە پسپۆرییەکاندا بەکاردێنێ. بەم کارەش، وەك سیمبۆلێك بۆ پێشکەوتنە زانستی و تەکنیکییەکانی نەتەوەیەك یان کۆمەڵەیەك رەفتار دەکات. ئەگینا، ئەگەر زمانێك بێبەش بێ لە بەکارهێنانی ئەم ئامرازانە لە بوارێك یان کارێکی پێویستدا، جێی خۆی دەدا بە زمانێکی دیکە، کە تاڕادەیەك تەواتربێ یان دەست پێڕاگەیشتنی بۆ ئەو بوارانە بۆ ئاسان دەکات (Anja Drame, 2009: 83).

پلانی زمانی لەوانەیە لە قۆناغێکی گەشە کردنی زمانێکدا دەست پێبکرێ، کە ئەم زمانە فۆرمێکی نووسین و تەنانەت هیچ نۆرمێکی زمانی نەبێت. کەچی، پلانی زاراوەسازی پێویستی بە چەسپانێکی رێژەیی رێزمان و رێنووس لە زمانی نووسینە. هەربۆیە رێکخستنی مەبەستدار و ئاگایانەی زاراوەکان دەبێتە هۆی بەرفراوانبوونی جۆرە زمانییە پسپۆرییەکان و یەکانگیرە لەگەڵ پێویستیی بوارەکانی پێوەندی کە بەردەوام زاراوەی تایبەتییان پێ زیاد دەبێت (UNESCO, 2005: 8).

بۆ زمانی کوردی لەم قۆناغەی ئێستایدا کە زمانی پەروەردە و خوێندن و بەڕێوەبردنە، رێکخستنی زاراوەکان دەورێکی سەرەکی لە بەڕایەڵەکردنی[٢٥] کار و چالاکییەکان و ئاسانکردنی پێوەندییەکاندا هەیە. بە گشتی، "پلانی زاراوەسازی و پلانی زمانی دوو چالاکیی تەواوکەری یەکترن. لەلایەك پلانی زاراوەسازی بەشێکی جیانەکراوەی پلانی زمانە. لەلایەکی دیکەشەوە، دەتوانێ چالاکیی تاکە رێکخراوێك بێت بۆ ئامانجە ستراتیژییە ناوخۆییەکانی و وەك پێویست هیچ پێوەندییەکی بە پلانی زمانییەوە نەبێت. زۆرجار پلانی زاراوەسازی هەم پلانی زمانی پێکدێنێ و هەم بە هۆی هەبوونی پلانێکی زمانییەوە پێك دێت. رێژەی پێکگرێدراوی نێوان پلانی زمانی و پلانی زاراوەسازی بە پێی ئەو بارودۆخە تایبەتانە دیاری دەکرێ کە کۆمەڵە زمانییەکەی تێدایە." (ISO 29383;2010(E): P.3).

### ١- ٨. پلانی زاراوەسازی

*پلانی زاراوەسازی بریتییە لەو چالاکیانەی بۆ پەرەپێدان، پێشخستن، بەکارهێنان و بڵاوکردنەوەی زاراوەی بوارێکی زانستی دەکرێ* (ISO 2010: 1).
پلانی زاراوەسازی بەشێکە لە چالاکییەکانی ستانداردکردن و ڕێکخستن لە پیشەسازی و بوارەکانی دیکەدا. لەلایەکی دیکەشەوە، لە وەرگێڕانی دەقی یاسایی یان دانان و ڕێکخستنی یاسادا بەردەوام پێویستە زاراوەکان پێناسە بکرێن بۆ ئەوەی بەباشی و بە ڕوونی تێیانبگەین. لە کۆنەوە گوتوویانە "شتێکی تێینەگەی ناتوانی ڕێکی بخەی". زاراوەکان دەورێکی گرینگیان لە ناساندن و تێگەیشتنی چەمك و واتا زانستی و تەکنیکییەکاندا هەیە.

پلان و سیاسەتی زاراوەسازی و دیاریکردنی ڕێگەچارەکانی، بەتایبەتی لە ئاستی نیشتمانیدا پێویستی بە ڕەچاوکردنی مەسەلەی ئاڵۆزی وەك:
- فاکتەرە دیمۆگرافییەکان.
- فاکتەرە ڕۆشنبیری، ئیتنیکی _ زمانی و جوگرافی – زمانییەکان.
- فاکتەری کۆمەڵایەتی – دەروونی ( UNESCO,2005:I).

### ٢- ٨. گرنگیی پلانی زاراوەسازی

پلانێکی ئاگایانە و پێڕەومەندی زاراوەسازی دەبێتە مایەی گەشانەوەی زمانە پسپۆرییەکان بە پێی پێویستییەکان و پابەندییەکان و پێوەندیی ژینگەیی کە هەموو ڕۆژێك گەلێك زاراوەی پسپۆرانە لە سەدان زمان لە سەرانسەری دونیادا بەدی دێنێ. هێندێ دامەزراوەی زانستی و ڕۆشنبیریی کوردی وەك ئەنیستیتۆی کورد لە پاریس هەوڵیان داوە لەم بوارەدا هەنگاو بنێن، بەڵام دەبێ ئەمەمان لەبەرچاو بێت کە زاراوەناسییەکی پلانمەند پێویستیی بە ژینگەیەکی بەکارهێنانی زمانی زانستی – تەکنیکییە کە ئەو زاراوانە بخرێنە بواری بەکارهێنانەوە و تاکی قسەکەری زمانی کوردی ئەو زاراوانە وەك ئامرازێك بۆ بەدەستهێنانی زانیاری و شارەزایییە تەکنیکییەکانی سەردەم بەکار بێنێ. ئەم جۆرەی زاراوەسازی تەنیا لەچوارچێوەی هەرێمی کوردستاندا بواری بەرفراوانکردن و پیادەکردنی هەیە،

چونکە زمانی وەرگرتنی زانست لێرە کوردییە و تاکی بەکارهێنی ئەم زاراوانە تەنیا ئەو جیلە نوێیەیە وا بەزمانی کوردی فێری خوێندن و نووسین بووە.

لە ئاستی ناوچەییدا، وەك کوردستان، زانست پێویستە لە زمانێکدا بگەیەنرێ، بۆ خەڵك درکپێکراو بێت. زانست بە بێ زاراوەسازی نابێت. چونکە، زاراوەسازی دەورێکی سەرەکی دەبینێ لە هەرجێیەك، بوارێکی زانستیی تایبەت، بەرهەم هاتووە (لێکۆڵینەوە، پێشکەوتن)، دەقی تایبەت بەکار هاتووە، فەرهەنگی وشە و داتابەیس تۆمارکراوە، فێرکردن و پەروەردە دانراوە، تەکنۆلۆجی و گەیاندنی زانست پەیرەو کراوە. وەرگێڕان و لێکدانەوە پێش خراوە.

هەر بۆیە، زاراوەکان و چەمکەکانیان سەرەڕای ئەوەی لە پرۆسەی تێگەیشتندا زۆر کاریگەرن، لەبەر ئەم هۆیانەش زۆر پێویستن:

١. وەرگێڕان.

٢. وەدەست خستنەوەی زانیارییەکان (دۆزینەوەی زانیاری لە ئینتێرنێت) .

٣. بەڵگەمەند کردن (پۆلکردنی بەڵگەکان و هەڵگرتنیان) .

٤. پێوەندییەکان (گەیاندنی زانست و زانیاریی ناو و بەڵگەکان بە قوتابی و مامۆستا و یاساناس و...).

٥. فێرکردنی بابەتی زۆر پسپۆرانە و تەکنیکی بە زاراوەکان فێری فێرخوازەکان دەکرێ (UNESCO,2005:9).

ئەگەر بمانەوێ زمانی کوردی وەك زمانی نەتەوەیی نەتەوەی کورد بەکار بێنین، پێویستە کۆدە زمانییە تایبەتییەکانی جۆری زمانی زانست لە زمانی نەتەوەییشدا بەرفراوان بکەین. ئەمەش پێویستی بە پلانی زمانە. پلانی زمانی دەبێتە هۆی هاوپەیوەندیی نەتەوەیی، بەرزکردنەوەی ئاستی متمانە بە خۆبوون و شانازیکردن بە زمانی زگماکی. ئەمەش پەرەپێدانی زانست و ئاگایی پیشەیی و تەکنیکی و هونەری بە زمانی زگماکی بەدوادا دێت. چونکە وەرگرتنی زانست و شارەزاییە تەکنیکییەکان بە زمانی زگماکی کاتێکی کەمتری دەوێ و لە بەرانبەردا فێربوونی زمانی بیانی/زمانی دووەم کاتێکی زیاتری دەوێ. "یەکێ لە لایەنە گرینگەکانی فێربوونی زمانی دووەم مەودای زمانی[٢٦] یە. ئەم مەودایە ئەو

ماوە کاتییە دیاری دەکات کە فێرخوازەکان بۆ زاڵبوون بەسەر زمانی دووەمدا پێویستییان پێیەتی. "(علوی مقدم، ١٣٨٩: ٦٥ لە Odlin,1989 وەری گرتووە).
بۆیە، جگە لەو خاڵانەی سەرەوە دەکرێ ئاماژە بەم خاڵانەش بکرێ کە گرنگی و پێویستیی زاراوەکان دەخەنە روو:

١. پێشکەوتنی زانست پێویستی بە زمانی زانستییە. زمانی زانست بۆ تێگەیشتن پێویستی بە روونکردنەوە و وەسفکردنی زاراوەکانێتی.

٢. زمانی زانست لە کوردستان کوردییە و دەبێ کوردی بێت.

٣. زمانی زانستیی کوردی بۆ مانەوە پێویستی بە زاراوەسازییەکی پلاندار و پێڕەومەندە.

٤. زاراوەکان دەبنە هۆی پێشخستنی خوێندەواریی سەردەمییانە بە زمانی کوردی.

٥. زاراوەکان دەبنە هۆی کاتگێڕانەوە و پاشەکەوتکردنی بۆ خوێندەوارانی زمانی زگماکی لە کاتی وەرگرتنی زانستدا.

## بەشی دووەم: لێکدانەوە و بەڵگە هێنانەوە (ئارگۆمێنتەکان)

### ١. پلانی زاراوەسازی لەبەرانبەر (داهێنان/ گۆڕان)ی سروشتیی زاراوەکاندا

**لەلایەک**، زمان ئامرازێکی سروشتی و چالاکە و بە پێی یاسای تایبەت بەخۆی لە گەشە و گۆڕاندایە. مرۆڤ هەرگیز ناتوانێ هەوڵی پاوانکردنی بدا و لە دەست بەسەرداگرتنیدا سەرناکەوێ. واتە، زمان پێڕەوی هێما زمانییەکان، پێوەندیی نێوان ئەم هێمایانە و رێککەوتنە کۆمەڵایەتییەکانە. لەلایەکی دیکەشەوە، "پەیوەندیی نێوان زاراوە و واتاکانیان پەیوەندییەکی بە ئەنقەستە" (ئازاد باخەوان، ٢٠١٢: ١٧٨). "زاراوە وشەیەکی تایبەتە، گرووپێك لە پسپۆر و شارەزا لە بوارێکی دیاریکراودا سازی دەکەن" (تالب حوسێن، ٢٠١٢: ١٦٨). زاراوەسازانی بواری رێکخستنی زانیارییەکانیش بۆ نواندنەوەی ناوەرۆکی بەڵگەکان لە سیستەمی کۆکردنەوە و بەدەستهێنانەوەی زانیارییەکاندا پێویستییان بە دانانی زاراوەیە.

کەواتە، "هەڵبژاردنی کۆمەڵێك لە وشەکان، کە زۆربەیان هی زمانی سروشتین و یان هی زمانێکی پسپۆرانەن لە بوارێکی بابەتی تایبەتیدا، وێڕای بەدیهێنانی هەندێ گۆڕان تێیاندا دەبێتە هۆی بەدیهاتنی بنکەیەك بۆ زەخیرەکردن و دەستخستنەوەی زانیارییەکان. بەکارهێنانەوەی فەرهەنگی زاراوەکان، شێوەی پۆلکردنی وشەکان، سیستمی زەخیرە و دەستخستنەوەی زانیارییەکان بە بەکارهێنانی زمانێکی دروستکراو، هەوڵ دەدات لێك تێگەیشتنێك لە نێوان کۆکەرەوە و بەکارهێن بەدی بێنێ، تا لەم رێگایەوە کارلێککردنێکی کاریگەر بۆ راییبوونی زانیارییەکان پێك بێت. ئەوەی لێرەدا لە بریاردەران و پلاندانەرانی پێڕەوی زەخیرەکردنی زانیارییەکان و بەدەستخستنەوەیان رووبەڕووی دەبنەوە و دەیکەن: پۆلکردنی وشەکان و تایبەتدانیان بە تەنێك، یان چەمکێکی تایبەت، سوود وەرگرتن لە تۆڕی واتایی وشەکان، هەڵبژاردنی بنکەیەك لە وشەکان بۆ نواندنی زانیارییەکان، سڕینەوەی لێڵیی واتایی لە وشەکان بۆ زەخیرە و دەستپێڕاگەیشتنی دووبارە و لە ئەنجامدا پێناسەی رێزمانی بۆ لێکدانی وشەکانی پێڕەوەکە لە کاتی رێکخستنی زانیارییەکاندایە ". جۆری ئاراستەکردنی پلاندانەرانی پێڕەوەکە بە پێی ئەم رێبازە بنەڕەتییە، دەبێتە هۆی پێکهاتنی جۆرێك رۆنانی تایبەتی زمان کە لە رۆنانە سروشتییەکەی جیاوازە (زندی روان، ٦٧:١٣٨٥ -٦٦).

## ٢. جیهانی بوون، پلانی زمان و زاراوەسازی

**هاوڕایی زمان و کۆمەڵ** و پێوەندییەکان لە پلانی زاراوەسازیدا: لە کۆمەڵەی زانیاریی جیهانیی ئەمڕۆدا و لە کارلێککردنی دوولایەنەی روو لەزیادبووندا بەناچار دەبێ زمان شێوەی پێبدرێ، پلانی بۆ دانرێ و ستاندارد بکرێ، ئەگینا هەرگیز نابێتە ئامرازێکی کاریگەر لە پێوەندیکردن لە کۆمەڵەی گەورەتردا. بەبێ هەوڵی مەبەستدار بە زوویی دادەمرکێت و زمانەکانی دیکە بەسەریدا زاڵ دەبن.

ئەو کۆمەڵە زمانییەی کە لەگەڵ کەمیی زاراوە بۆ چەمکە نوێ/بیانییەکان بەرەوڕوویە، بەڵام پێویستیی راستەوخۆ و خێرای پێیانە، یەکسەر رێگا

جێگرەوەکانی دیکە دەدۆزێتەوە. لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ناچار دەبێ ئامرازێکی دیکە (ئینگلیزی) بەکار بێنێ.

هەروەها، کۆمەڵەیەکی چالاکی زمانی لەرووی ئابوورییەوە بە شێوەیەکی "سروشتی"، لەخوارەوە بۆ سەرەوە زاراوەکان دروست دەکات. بۆیە، بە پێی پێشکەوتنی زمانێك بۆ ئەرك نواندنێکی کاریگەرانەی وەك زمانێکی زانستی و ئابووری، هەوڵەکانی پلاندانانی زمان پێویست دەبن:

١. ستانداردکردن: پێوەندییەکی روون و شەفاف

٢. گەشەپێدان: دروستکردنی زاراوە، داهێنان

٣. پلانی پێگەسازی: سیاسەتەکانی بەکارهێنانی زمان لە بوارە تایبەتەکاندا

٤. هۆشیارکردنەوە: بڕوابەخۆبوونی قسەکەرانی زمانەکە.

کەواتە، ئەمڕۆ دەبێ لە ڕوانگەیەکی فراوانترەوە بڕوانینە پلانی زاراوەسازی. واتە لە ڕوانگەی زانست و نوێخوازی و تەنانەت لە ڕوانگەی ستراتیژیی ناوەرۆکە ئەلەکترۆنییەکانەوە لێی بڕوانین. ئەو زمانەی کە زاراوەی زانستی و تەکنیکی پێویستی نییە، بە ناچار دەبێ لە پێوەندییە پسپۆرییەکاندا زاراوەی جێگرەوەی زمانە پێشکەوتووەکان بەکار بێنێ. لەبەر ئەوەی قورسایی پێوەندییەکان لە سەر شانی تەکنۆلۆژی زانیاریی پێوەندییەکانە، نەبوونی وشەی گونجاو لەم بوارەدا بە شێوەی ناڕاستەوخۆ دەبێتە هۆی بەدیهاتنی کەلێنی دیجیتاڵی.

هۆی باڵکێش بوونی تەکنۆلۆژیای زانیاری و پێوەندییەکان پێویستی بەمیتۆد و شێوازی کار بۆ بەهرەمەندبوون لەم تەکنۆلۆژیایە روو لە زیادبوونە. نرخی ئامرازە نەرم(٢٧) و ئامرازە ڕەقەکان(٢٨)ی بەرهەمهێنان و بەکارهێنانی ناوەرۆکی ئەلەکترۆنی بەرز دەبێتەوە... لێرەدایە کە دەوری شایانی زاراوەکان دەردەکەوێ. داتا زاراوەییەکان توخمی بنەڕەتیی زانیاری و زانستی پسپۆری پێکدێنن چونکە بەشێکی سەرەکی ئەو زانستە لەواندایە (UNESCO,2005:1). هەر بۆیە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە پلانی زاراوەسازی وێڕای پێشکەوتنی پێڕەومەندی ئەو تەکنۆلۆژییە زمانییەی پێوەندی پێیەوە هەیە، دەتوانێ توانا ستراتیژییەکانی

زمـان بـە شـێوەیەکی بـاڵا بـەرز کاتـەوە. بۆیـە زمـانی کـوردی پێویسـتی بـە زاراوەناسییەکی پێڕەومەندە لەم پێناوەدا.

## ٣. بچووکبوونەوەی جیهـان و نیگەرانییـەکانی کەمینـە نەتـەوەیی و زمانییەکان

یۆنسکۆ لە ساڵی (٢٠٠٠)ەوە هەوڵەکانی زیاتر کردووە بۆ بردنەسەرێی ئاگایی خـەڵك لـە گرنگیـی ڕۆڵـی زمـان لـە هەڵبەسـتنی پـردی پێوەنـدیی بەسـەر کـەلێنی دیجیتـاڵی و بنیاتنـانی کۆمـەڵگاکانی زانیـاری. کـەلێنی دیجیتـاڵی بـەردەوام دەرەنجامی نایەکسانی دەسـت ڕاگەیشـتن بـە زانیـاری و زانسـتە، کـە ئەمـەش لـە نایەکسـانیی زمانییـەوە سـەری هەڵـداوە. ناتـەواویی زاراوەکـان، فاکتـەرێکی سەرەکییە لە نایەکسـانیی دەسـت ڕاگەیشـتنی زمانیـدا و ئـەوەش دەبێتـە مایـەی "نەخوێندەواریی ئەرکی"[٢٩] لـە بـواری دەستڕاگەیشـتن بـەزانیاری و بـەکارهێنانی کۆمپیۆتەردا.

(UNESCO, 2000: V). زمانێك کە لەگەڵ کـەمیی زاراوە لـە هێنـدێ بـواردا بەرەو رووە، لە رەوتی کاتدا، توانایی دامەزراندنی پێوەندیی لـەو بـوارە تایبەتـەدا لەدەست دەچێ.(Ibid).

**زاراوەکان، هـەوێنی دەوڵەمەنـدکردنی زمـان و ئـامرازی گونجانـدنی زمـانی کەمینەکانن لەگەڵ ڕەوتی زانست و تەکنیك لە جیهاندا. تاکە ڕێگایەك بۆ ئەوەی مـافی دەستڕاگەیشـتنی نەتـەوەکان بـە پێناسـەی خۆیانـەوە و لـە ڕێـی زمـانی خۆیانەوە بەدەستی بێنن، زاراوەکانن.** لەگەڵ ئەوەشدا مەسەلەی کەلتوور گرنگە، "لە قۆناغی یەکەمدا زمان پشتی کەلتوور دەگرێ بۆئەوەی هەم ئامرازی پێوەندیی بێت و هەم ئامرازی جیایی ئەوان... زمان کە لە رووی دیالێکتیکی ئـەم دوو کـردە هاودژەی هەیە، دەتوانێ ئامرازێکیش بێت بۆ مانەوەی نەتەوەکان و جیاکەرەوەی "خۆمانەکان"ە لە "بێگانەکان". (بابازادە، ١٣٨٨: ٢١ لە ئانتیپۆف، ١٩٨٩ وەری گرتووە) زاراوەسازی بنەمایە بۆ پێوەندیکردن و زانیـاری. سـەرەکییە بـۆ دەست پێڕاگەیشتنی کۆمەڵە رووڵەگەشەکان بۆ زانیـاری، لـە ڕێـی دابینکردنی"خـۆراك"ی

ئامرازە تەکنیکییەکان، واتە ناوەرۆك و لەو رووەشەوە دەست ڕاگەیشتن بە زانست. زانست ئازادیبەخشە، واتە دەرفەتی گۆڕان و خاوەن دەسەڵات بوون دەڕەخسێنێ، ئازادیی لە بندەست بوونی ئەوانی دیکە. کەواتە زاراوەدانان "تەنیا" لەبارەی زمان و کەلتوورەوە نییە، بەڵکو بەشێوەی راستەوخۆ گرێدراوە بە سیاسەت، ئابووری و لایەنەکانی پێشکەوتنەوە.

## ٤. کێ پلانی زاراوەکان دادەنێ و بەڵگە زمانییەکانی دروستکردنی زاراوە چین؟

بەربڵاوترین دەسەڵات بۆ پلاندانانی زمان لە سیاسەتوانەکانەوە بەدەست دێت. پاشان دەستەیەکی پسپۆران بەتایبەتی ئەرکی ئامادەکردنی پلانێکیان پێ دەسپێردرێ. لە ئامادەکردنی ئەم پلانەدا پسپۆرەکان بەشێوەیەکی ئایدیال ئەو سەرچاوانەی لەبەردەستدان هەڵدەسەنگێنن و چۆنێتی بەکەلك بوونی ئەو سەرچاوانە بەپێی ئامانجە پێشکەوتووەکان پێشبینی دەکەن. کاتێ کە لەسەر ئامانجەکان رێککەوتن، ستراتیژی کارەکە روون دەکرێتەوە. ئەمانە لەلایەن پارلەمانەوە دەسەڵاتیان پێ دەدرێ و لەلایەن دەزگاکانی بەڕێوەبردنەوە پیادە دەکرێ، واتە بەهۆی دەسەڵاتی بەڕێوەبردنیشەوە بەنۆرەی خۆی دەسەڵات وەردەگرێ . پیادەکردنی ئەرکەکان لەوانەیە لەلایەن پلاندانەرانەوە بەشێوەیەکی خولەکی لە خولی دیاریکراودا بنرخێندرێ. (Jernudd &Das Gupta 1971: 196).

ئەگەر پلانێکی دیاریکراو هەبێت بۆ زاراوەسازی، ئەو دەم زیاتر لە چەمك و بواری بەکارهاتنی وشەکان ورد دەبینەوە و هاوتای گونجاو بۆ زاراوەی لەم جۆرانە[٣٠] هەڵدەبژێرین:

(١) ڤایرۆس زانی: Virology (٢) شانەزانی: Histology

(٣) کشتوکاڵزانی: Agriculture (٤) کەشزانی: Climatology

(٥) ئاوزانی: Hydrology

پاشگری (ناسی) لێرەدا گونجاوترە، چونکە پاشگری (–زانی) لە چاوگی (زانین) زیاتر لایەنی هۆشەکی و دەروونی هەیە و ئەگەر لەگەڵ وشەیەکی دیکەدا

داڕێژرایـەوە، وەك (زمـانزانی، قسـەزانی، لێزانـی)، زیـاتر دەربـڕی تواناییـەكی كەسییە، و لایەنی شارەزایی لە شتێكدا وەردەگرێ.

پاشگری (–ناسی) پێوەندیی بەو شتانەوە هەیە كە لـە دەرەوەی كەسـەكە هەن و دەسەڵاتی بەسەریاندا نییە، بـەڵام هـەوڵی تـاوتوێكردن و زانینیـان دەدات. ئەگەر بڕوانینە ئەو وشانەی سەرەوە، دەبینین پاشگری وشەداڕێژی"– ناسی" لـە بەرانبـەر (Logy-)دا بـۆ نموونـەی (١)، (٢)، (٤) و (٥) گونجـاوە. واتـە بڵـێین (ڤایرۆسناسی، شانەناسی، كەشناسی و ئاوناسی) ئەو شتانە لەدەرەوە هەن و ئەو زانستەی تاوتوێیان دەكات لەوانە وەك دیاردە دەكۆڵێتەوە و بۆ ئەوەی بیانناسێ. بۆنموونە، ناسینی جۆری ڤایرۆسەكەیە دەرمـان و چارەسـەری تایبەتیشـی دیـاری دەكات. هەروەك چۆن بـۆ وشـەی (سۆسـیۆلۆجی)، (كۆمەڵناسـی) بـەكار دێـت بـۆ (سایكۆلۆجی)، (دەروونناسی) بەكار دێت. لە نموونەی (٣)دا بەرانبەر بـە وشـەی (Agriculture)، هیچ پاشگرێك نابینین كە وەك نموونەكانی دیكە(–زانی) بۆ زیـاد كراوە. لەگەڵ ئەوەشدا پاشگری (–زانی) لێرەدا زیاتر واتای ئەو كەسە رادەكێشێ كە لە كشتوكاڵ دەزانـێ و شـارەزا و بـە ئەزموونـە لـە رووی كردەییـەوە نـەك لـە رووی هۆشەكییەوە. بۆیە، لێرەدا، لە جیاتی ئەوەی بە پاشگری (–زانی) دایڕێژین (كشتوكاڵزانی)، لە گرێیەكی وەك (زانستی كشتوكاڵ)دا دایڕێژین گونجاوترە.

لە پێوەنـدیی لەگـەڵ زاراوەی ئـەوتۆدا دەكـرێ ئـەم بنەمایانـە وەك بەڵگـەی زاراوەسازی وەربگرین:

١. ڕەچاوكردنی پێشینە

هێندێ جار لەبەر هۆی مێژوویی یان هـۆی دیكـە، لەوانەیـە چـەمكێك بـە دوو زاراوە ناو ببرێ. لەو بارەدا لەگەڵ زاراوە هاوواتاكان بەرەو ڕوویـن. ئـەو زاراوانـەی پێشینەیان هەیە و بە پێی یاساكانی وشەسـازیی كـوردی دروسـت كـراون، بەسـەر ئەو زاراوانەدا بـەرایی دەدەیـن كـە دواتـر دروسـت كـراون و یاسـاكانی وشەسـازیی كوردی تێیاندا ڕەچاو نەكراوە. لێرەدا پێویستیمان بە هاوكـاریی بـوارە پسـپۆرییە جیاوازەكان لەگەڵ زمانناسان دەبێت، كە واتای زاراوەكان لە رووی ئەرك و بـواری بەكارهاتنیانەوە روون بكەنەوە و زمانناسانیش بە پێی میكانیزمـەكانی وشەسـازی

هاوتای کوردییان بۆ دابنێن. بۆ نموونە لە نێوان زاراوەکانی وەك "رۆنان، دروستە و پێکهاتە" بۆ (Structure) لە زمانناسیدا، دەبێ پێشینەی بەکارهاتنی ئەو سێ وشەیە لە دەقە زمانناسییەکانی زمانناسانی کورد رەچاو بکەین. لەوانە، ئەورەحمانی حاجی مارف، محەمەد مەعرووف ، وریا عومەر ئەمین و مەسعود محەمەد پێش ئەوانی تر "رۆنان"یان بەکار هێناوە.

**٢. هاوبێژیی (هاودەنگیی) نێوان وشە بیانی و کوردییەکە**

لە وەرگێڕان و هاوتاسازیی وشە زانستییەکاندا لە زمانی سەرچاوە (ئەو زمانە سەرەکییەی زاراوە زانستییەکەی لێ وەرگیراوە)دا رۆنان و واتای زاراوەکە رەچاو دەکەین. بۆ نموونە بۆ وشەیەکی وەك (Ascenseur/ مصعد) دەکرێ، تەنانەت، لایەنی هاودەنگیی وشە بیانییەکە بکەینە بەڵگە بۆ دروستکردنی هاوتا کوردییەکەی و زاراوەی وەك "ئاسانسووڕ"(ئاسان + سووڕ)/ "ئاسانبەر"(ئاسان + بەر) بەدی بێنین.

**٣. گونجانی واتایی (پێوەندیی واتایی)**

وشەکان سەر بە بواری واتایی جیاوازن. لە هەر بوارێکدا چەند وشەیەك هەن کە پێکەوە لە پێوەندییەکی هاوپۆشیی واتاییدان یان جۆرێکن لە واتایەکی گشتی یان بەشێکن لەو یەك بواری واتایی چەند وشەیەك پێکەوە دەگرێتەبەر و دایان دەپۆشێ. بۆ نموونە لە بواری واتایی زانستی زماندا بۆ زاراوەیەکی رێزمانی وەك (Verb)/ (فعل)ی بیانی، "چەند هاوتا"ی جیاواز (کار، کردار، کردە، و فرمان) بۆ یەك"چەمك"دانراوە و هاوکات لە دەقە زانستییەکان و تەنانەت دەقە پەروەردەییەکانیشدا بەکار دێن. بۆ ئەوەی گونجانێکی واتایی دروست کەین، کە تێگەیشتنی فێرخواز ئاسان بکات، بوارە واتاییەکەی و دەوروبەری زمانی زاراوەکە رەچاو دەکەین و لەگەڵ بەشە پێکهێنەکانی تری رستەدا زاراوەی بۆ دادەنێین، واتە "کار" هەڵدەبژێرین. چونکە رستە جگە لە "کار" (Verb) لە "بەرکار" (Object) و "بکەر" (Subject) پێکدێت. هەرسێ زاراوەکە سەر بە یەك بواری واتاین (رستەسازی). ئەم سێ زاراوەیە جگە لە گونجانی واتاییان پێکەوە لە رووی رۆنانیشەوە لە وشەکانی تری وەك کردار، کردە و بەتایبەتی"فرمان"

گونجاوترن کە هەر هیچ بەڵگەیەك نییە بۆ کۆکردنـەوەیان لەگـەڵ بەشـەکانی تـری رسـتە (بکـەر و بـەرکار)دا. هـەر وەك لـە زاراوە ئەندازەییيـەکانی وەك سێگۆشـە (**مثلث**) و چوارگۆشە (مربع) و لاکێشە (**مستطیل**)دا گونجانێکی واتایی دەبینرێ.

**٤. تێڕوانینی ئەرك پێوەر یان ناوەڕۆك پێوەر**

پاڵنەری **هاوتاسازیی** زاراوەکان چەمك، دیاردە یان تەن (مصداق)ە. تێڕوانین بـۆ زاراوەکـە لـە زمـانی یەکـەم و تەنـەوە بـۆ چـەمکەکەی ورد دەبێتـەوە. لێـرەدا وەڵامی ئەم پرسیارانە دەداتەوە: **کۆمەڵەی زمانی چۆن لەم چەمکە دەڕوانێ؟ کام یەك لە تایبەتمەندییەکانی زاراوەکە زیاتر مەبەستە؟**

بەگشتی دوو تێڕوانینـی ئـەرك پێـوەر و نـاوەڕۆك پێـوەر بەرانبـەر دیاردەکـە هەیـە: لـە تێڕوانینـی ئـەرك پێـوەردا کۆمەڵـەی زمـانی زیـاتر گرنگـی بـە ئـەرکی دیاردەکـــــە دەدات (نعمـــــت زادە، ١٣٧٩: ١٣٣– ١٣٤). بـــــۆ (Cooler)، "فێنککەرەوە" (فەرهەنگی زاراوەی کـارگێڕی، ٢٠٠٤: ٤١) و یـان بـۆ (Pronoun) "جێناو" بەکار دێنێ، نەك راناو.

لە تێڕوانینی ناوەڕۆك پێوەردا رەگەز و ناوەڕۆکی دیاردەکە رەچاو دەکرێ. بۆ نموونە وشەیەکی وەك(Socialism)، ناکرێ لە واتای بنەڕەتی وشەکە لە وشەی (Society)ییەوە هاوتای (کۆمەڵایەتی)بۆ دابڕێژرێ، بەڵکو لە ناوەڕۆکی وشەکە کە بنـەمای هزریـی ئـەم رێبـازەی لەسـەر دامـەزراوە، هاوتـای "**هاوبەشـایەتی**"بۆ دادەڕێژرێ (مەسعود محەمەد، ١٩٨٨: ١٤٩). یان وەك ئاماژەمان پێکـرد، زاراوەی (Agriculture) ئەگەر بۆ لقێکی زانسـتی بـەکار بێـنین، پێویسـتە لـە زاراوەیـەکی وەك"زانستی کشتوکاڵ"دا دەربیڕین.

**٥. فەرهەگی زاراوە زانستییەکان (فەرهەنگی پسپۆڕانە)**

بـە گشـتی، "فەرهـەنگ بەرهـەمێکی زمانییـە کـە کۆمەڵـە وشـەیەکی هەڵبژێردراوی زمانێك (یان زمانەکانی دیکە) کۆ دەکاتـەوە و زانیارییـان لـەبارەوە دەخاتـە روو." (Cabré, M. Teresa, 1999: 31) ئـەو وڵاتانـەی دەیانهـەوێ بـە

زمانی نەتەوەیی خۆیان زانست وەرگرن، و لە رەوتی پێشکەوتنی جیهانیش بە دوا نەکەون، دەست دەکەن بە هاوتاسازیی زاراوە بیانییەکان لە چوارچێوەی فەرهەنگی زاراوە تەکنیکی و پسپۆرییەکاندا بە زمانەکەی خۆیان، لە زمانی کوردیشدا کۆمەڵێ بەرهەمی تایبەت بە زانست و بوارە پسپۆرییە جیاوازەکان دانراون، سەرەڕای هەوڵ و ماندووبوونی شایانی دانەرەکانیان لە رووی شێوازی فەرهەنگنووسییەوە کەم و کورتییان تێدایە. بەگشتی فەرهەنگی زاراوە زانستییەکان "کۆمەڵە زاراوەیەکی لقێکی زانستی لە رێگەی پێناسەکردن، وەسفکردن، وێنە و روونکردنەوە دەخاتە روو، و هاوتای کوردییان بۆ دیاری دەکات. (مشیری، ١٣٧٠: ١٠٤) و بە پێی جۆری ئەو زانیارییانەی دەیگرێتە بەر رێك دەخرێ. کە لەم هەنگاوانەی خوارەوە پێکدێت:

**١. قۆناغەکانی رێکخستنی فەرهەنگی زاراوەکان.**

دیاریکردنی ئامانجی ئامادەکردنی فەرهەنگەکە، دیاریکردنی بەکارهێنەکانی فەرهەنگەکە، دیاریکردنی پانتاو قووڵایی پۆلە بابەتییەکان، دەستنیشانکردنی پێکهاتەی فەرهەنگەکە، دیاریکردنی قۆناغە جۆراوجۆرەکان و رێکخستنی فەرهەنگەکە وەك شێوەی کۆکردنەوە و پەسندکردن و پاراستنی زاراوەکان. دیاریکردنی ئەنجومەنێك یان لیژنەیەك کە دەبێ پێکهاتبێت لە زمانناسان و پسپۆرانی باری بابەتێکی تایبەت. پێداچوونەوە بە فەرهەنگی زاراوە تایبەتەکانی پێشتر ئامادە کراون، کۆکردنەوەی وشەکان (هەڵبژاردنی وشە)، بەستاندارکردنی وشە (لە رێگای هاوتاکردن، گونجاندن و پەسندکردنەوە)، ئامادەکردنی فەرهەنگێکی وەسفی لە رێگای وەسف و روونکردنەوەی واتای زاراوەکەوە.

**٢. سەرچاوەی کۆکردنەوەی زانیارییەکان**

فەرهەنگی زاراوەی هەبوو و فەرهەنگی گشتی و تایبەتی، فەرهەنگۆك و ئیندێکسی سەرچاوەی پێوەندیدار بە بابەتەکە و هەموو کتێب و گۆڤار و توێژینەوەکانی خوێندنی باڵا و بڵاوکراوەکان بە گشتی، سەرچاوەی زیندوو وەك

پسپۆرانی بابەتەکە و شارەزایانی بابەتەکە، زاراوە بەکار هاتووەکان لە بەڵگەنامە فەرمی و حکوومی و دامەزراوەییەکان، سەرچاوە ئیلیکترۆنییەکان.

**٣. بنەماکانی بژارکردنی وشەکان**

روونی لە بەرامبەر لێڵیدا، تۆکمەیی و یەکدەستکردنی زاراوەکان و پێشگرتن بە زاراوەی هاوواتا بۆ یەك مەدخەل، گونجاوی و هاتنەوەی زاراوەکە لەگەڵ چەمکەکەی، کورتیی (ئیکۆنۆمی زمانی) شیان بۆ دارشتنەوە و گەردانکردن، دروستی زمانی، پێشخستنی زمانی زگماکی بە سەر وشە و زاراوەی بیانیدا.

**٤. قۆناغەکانی هەڵبژاردنی زاراوەکان:**

**٤– ١.** یەکەم قۆناغ کونترۆڵی وشە هاوواتاکانە لەو هەڵبژاردنەدا کە لێرەدا پێویستە هەماهەنگی بکرێ لە نێوان:

– بەکارهێنانی گشتیی فەرهەنگەکە و رادەی زانیاری و دەرك پێکردنی بەکارهێنەکانی و

– خۆپاراستن لە بەکارهێنانی وشەی گران و تەمومژاوی.

**٤– ٢ .** کونترۆڵی فۆرم و ریشەی وشەکان کە لەم هەنگاوانەی خوارەوە پێك دێت:

رێنووسی وشەکان، وشە کورتکراوەکان، ناوە زانستی و جەماوەر پەسندەکان، ناوە تیجاری و باوەکان، ناوی شوێن و تاك و رێکخراوەکان و گرنگیی ئەو کەرتەی وەسف دەکرێ.

**٤– ٣.** دیاریکردنی پێوەندیی پۆلەکان بە شێوەیەکی پلەیی

**٤ – ٣– ١.** پێوەندیی گشت ـ کەرت یان داپۆشینێکی پلەیی:

– پێوەندیی جنس و جۆر، کە پێوەندیی نێوان پۆلێك و جۆرەکانی دیاری دەکات. وەك: باڵندە و کەو، یان کانزاکان و ئاسن.

– پێوەندیی گشت و کەرت کە تێیدا گشت رۆڵی فەرمانڕەوا و کەرتیش رۆڵی فەرمانبەر دەبینێت. وەك: پێوەندیی نێوان دڵ و دەمارەکان و یان زانستە کۆمەڵایەتییەکان و دەروونناسی.

**٤- ٣- ٢.** پێوەنـدیی بەنـدێتی کـە تێیـدا پێوەنـدیی نێـوان دوو زاراوەی پێکەوە بەندکراو دەکرێ لەم جۆرانەی خوارەوە بێت:

- کردە و بەرهەمەکەی وەك: تەون و تەنراو/جۆلایی و جاجیم
- کردە و ئەو کەسەی کە پێوەندیی پێیەوە هەیە.(وەك جۆلایی و جۆلا).
- کردە و بەرکارەکەی وەك : وەك چارەسەرکردن و نەخۆش.
- شت و بەکار هاتنی وەك: پێنووس و نووسین.
- مادە و ئەو شتەی لێی دروست دەکرێ. دار و کاغەز
- پرۆسە و ئەو ئامرازەی تێیدا بەکار دێت، وەك: پێوەندیی گشتی و رۆژنامە.
- هۆ و بەرهۆ (عیللەت و مەعلول) وەك: پیسبوون و نەخۆشی.
- هۆکاری دژ بەیەك و کاریگەر لەسەر یەکتر، وەك: سەرکەوتن و شکست.
- شتێك کە پشت و پاڵپشتی شتێکی ترە، وەك: هەور و باران.
- هاوبەشیی سەرچاوەی دوو چەمك، وەك: کورد و کوردی.
- ئەو بیرانەی لە چەمکێکی تایبەتەوە وەرگیراون، و لە رووی پۆلی بابەتییەوە لە یەك ئاستدان. وەك: مەسیحییەت و ئیسلام، کەشتی و گەمی
- بـارودۆخ یـا هەلومـەرجی تایبـەت و ئـەو شـتەی لێیـەوە دێـت، ئاوسـان/ هەڵاوسان و بەرزبوونەوەی نرخ.

## ٥. رۆنانی فەرهەنگی زاراوەکان

بەگشتی دوو رۆنان بۆ پێکهێنـانی فەرهـەنگ رەچـاو دەکـرێ کـە فەرهـەنگی زاراوە پسپۆری – زانستییەکانیش دەگرێتەوە: "رۆنانی درشـتبین[٣١]" و "رۆنـانی وردبـین[٣٢]"بڕوانـە (مشـیری، ١٣٧٠:١٠٣ – ١٠٦) و ( Cabré, M. Teresa, 1999: 31):

**٥–١. رۆنـانی درشـتبین**، پێکهاتـەی گشـت فەرهەنگەکەیـە. لـەم رۆنانـەدا گرینگی دەدرێ بە پەیکەرەی فەرهەنگەکە (کۆی سەرچاوەکان کە لـە کۆکردنـەوە یان وەرگێڕانی زاراوەکاندا بەکارهاتوون، کە هەموو ئەو وشانەی سەر بەیەك بواری پسـپۆرین کـۆ دەکرێنـەوە و دەخرێنـە سـەر بەرگـە (فـیش) و دەروازەکـان پـاش

تۆمارکردنیان لە بەرگەکاندا هەڵدەبژێردرێن. بۆ ئاسانکاری لە بەرگە نووسیدا لە بەر زۆریی سەرچاوەکان بۆ هەر سەرچاوەیەك لەسەر بەرگەکان کۆد (ژمارە) دادەنرێ. لە پاشان لەسەر بەرگەکان ئەم زانیارییانە لەبارەی دەروازەکانەوە تۆمار دەکرێ (بەرگەکان ئەم زانیارییانە دەگرنە خۆ):

– وشە بیانییەکە (ئینگلیزی، عەرەبی، فارسی، تورکی، فەرانسی و...)

– هاوتا (یان هاوتا) کوردییەکان بە ئاماژە بە ناوی کورتکراوەی ئەو سەرچاوەیەی لێی وەرگیراوە.

– پێناسە/وەسفی وشەکە.

– ئاماژە بەو وشانەی کە لە رووی فۆرم یان واتاوە لەگەڵ زاراوەکە دەکەونە یەك بوارەوە.

– هەر روونکردنەوە، وێنە یان خشتەیەك کە تێگەیشتنی واتای زاراوەکە ئاسان دەکات. (ئەگەر لەسەر بەرگەکان جێیان نەبێتەوە هاوپێچ دەکرێن).

– دانانی هێما یان ناوی کورتکراوەی ئەو لقە پسپۆرییەی زاراوەکە تێیدا بەکار دێ.

– هەڵبژاردنی دەروازەکان و دیاریکردنی رەشنووسەکە: بە پێی بەرگە تەواوبووەکان دەروازەی گونجاوی تایبەت بە فەرهەنگە پسپۆرییەکە بژار دەکرێ و رەشنووسی سەرەکی فەرهەنگەکە پێکدێت.

**– پۆلینکردن بەپێی پێویست کە ئەم پۆلانە دەگرێتە بەر:**

أ) پۆلینکردنی بابەتی (پێڕەومەند)، کە دەروازەکان بە پێی بابەت و وشەی پسپۆری لەسەر بنەمای پێوەندیی واتاییەکانیان پۆلین دەکرێن. بە جۆرێك کە وشەکانی پێوەندیدار بە هەر بوارێکی واتایی، بە شێوەی ئەلفوبێ ریز دەکرێن.

ب) پۆلینکردنی ئەلفوبێیی، کە دەروازەکان بە پێی فۆرمەکانیان و بە پێی ریزبەندی پیتەکانی زمان رێکدەخرێن.

ج) پۆلینکردنی لێکدراو: کە تێیاندا دەروازەکانی فەرهەنگەکە بە پێی هەردووك پێوەری بابەت و فۆرم پۆلین دەکرێن(سەرەتا بابەتەکان بە پێی بواری واتایی و پاشان هەر لەو بوارەدا بەپێی ریزبەندیی ئەلفوبێ رێك دەخرێن).

٥-٢. **رۆنانی وردبین،** رێکخستنی زانیاری و تایبەتمەندییەکانی پێوەندیدار بە هەر چەمکێکی زانستی رۆنانی وردبینە. کە پێکدێت لە ئارتیکلێ (دابەشکردنی بابەتە گشتییەکانی وا فەرهەنگەکە پێکەوە دەبەستنەوە و تۆکمەی دەکەن)، دەروازە یان وشە سەرەکییەکانی هۆی پەنابردنە بەر فەرهەنگن. ئاماژە دەدەنە واتاکان. هەر دەروازەیەك دەبێ ئەم زانیارییانە بگرێتە خۆی:

- رێنووسی وشە بیانییەکە؛ پۆلی رێزمانیی وشە بیانییەکە؛ هاوتاکانی وشەکە لە زمانەکانی تری وەك (عەرەبی، فارسی و تورکی و...)

هاوتا کوردییەکەی، پۆلی رێزمانی هاوتا کوردییەکە، دژواتاکانی وشە بیانییەکان، ئاماژەکان، ئەو تێبینییانەی کە لە بەرگەکانی پێوەندیدار بە زاراوەکان لە تێگەیشتن زاراوەکە و چەمکە زانستییەکەی کاریگەرە.

د) هێماکان: وەك (=) بۆ پیشاندانی فۆرمە جۆراوجۆرەکانی رێنووسی وشەکان، (؛) بۆ جیاکردنەوەی واتا جیاوازەکانی زاراوەکە. لەم حاڵەتەدا دەکرێ واتاکان بە ژمارەش جیا بکرێنەوە. هێمای (#) بۆ دژواتاکان بەکار دێ. (*)، بۆ پیشاندانی ئەو وشەیە بەکار دێ کە وەرگێڕ و پسپۆڕەکان بەرایی پێدەدەن بەسەر ئەو وشە هاوتایانەی دیکەدا وا لە بەرانبەر وشە بیانییەکەدا لە کوردیدا بۆی دانراوە. وشە بەرایی پێدراوەکە بە(*) دیاری دەکرێ. ( ) بۆ روونکردنەوەی واتای گشتی و کورتکراوەکە یان روونکردنەوەی کورتی پێویست بەکار دێ.[] بۆ دیاریکردنی لقە زانستییەکان و پۆلە جۆراوجۆرە پسپۆرییەکان.

بۆ گەڕانەوە بۆ وشەی دیکە یان دەروازەی دیکە[٣٣](مشیری، ١٣٧٠: ١٠٤ - ١٠٥).

**ئەنجامەکان:**

١. پلانی زاراوەسازی دەتوانێ لە چالاکییەکانی ستانداردکردن و ڕێکخستن لە پیشەسازی و بوارەکانی دیکەدا دەورێکی سەرەکی هەبێ. زمانی کوردی لەم ڕووەوە پێویستییەکی زۆری بە پلانێکی وردی زاراوەسازی لە هەموو ئاستە حکومی و ناحکومییەکاندا هەیە، واتە پێویستی بە بەشداریی لە ئاستی سەرەوە بۆ خوارەوە (دەسەڵاتی سیاسی) و ئاستی خوارەوە بۆ سەرەوە (کۆمپانیا و دامەزراوە و پسپۆران و تاکە ڕۆشنبیرەکان) هەیە.

٢. لەلایەک لە دانانی زاراوەدا پێوەرەکانی وشەسازیی کوردی و یاساکانی زمانی کوردی ڕەچاو ناکرێ، و تەنانەت بە شێوەیەکی نازانستی هاوتاسازی دەکرێ بۆ زاراوە بیانییەکان و لەلایەکی دیکەشەوە، ناهاوڕایی و جیاوازییە ناوچەیی، پیشەیییەکان و دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی و سیاسی بەسەر زمان (زاراوەکان)یشدا دەسەپێنرێ.

٣. زمانی کوردی ، بە بواری زاراوەسازییەکی ئاسایی و نافەرمییەوە بەستراوەتەوە. بۆیە بەشێك لە قسەپێکەرانی ئەم زمانە، زمانی نەتەوەی سەردەست یان زمانە باڵادەستەکانی دیکەی وەك ئینگلیزی وەك جێگرەوەیەکی زمانی زگماکی بۆ بە دەستهێنانی زانست و زانیاری لە بوارەکانی تەکنۆلۆژی و تەنانەت یاساییش بەکار دێنێ. ئەمەش هەڕەشەیە بۆ سەر مانەوەی زمانەکە.

## پەراوێزەکان:

(1). E. Wüster

(2).Infoterm(International Information Centre For Terminology)

(3).A. Schloman

(4) .F. De Saussure

(5).E. Dresen

(6). International Federation Of National Standardizationassociations (Isa).

(7).J. E. Holmstrom

(8). Lotte

(9).Term

(10).Terminology

(11).Sociology

(12).Psychology

(13). Morphology

(14). Ad Hoc Terminology

(15). Systematic Terminology

(١٦). بڕوانە:

Terminology : Theory, Methods, And Applications / M. Teresa Cabré; Edited By Juan C. Sager ;Translated By Janet Ann Decesaris. P. 61.

(17). Register

(18). De-Terminologization

(19). Terminologization

(20) .Applied Linguistics

(21). Corpus Planning

(22). Lexicon

(23).Onomasiologic Process

(24). Semasiological Process

25).Networking

(26). Linguistic Distance

(27). Soft Ware

(28). Hard Ware

(29). Functional Illiteracy

(٣٠). بڕوانـە، فەرهـەنگی زینـدەزانی، ئامـادەکردنی: زاهـیر محەمـەد سـەعید، چ١، سلێمانی: چوارچرا

(31). Macro Structure

(32). Micro Structure

(٣٣) دیارە ئەم هێمایانە بەپێی ڕێککەوتنە و دەکرێ دانەرانی فەرهەنگەکە لەسەری ڕێـك بکـەون، بـەڵام لـە پێشـەکی فەرهەنگەکـەدا هێماکـان بـۆ بەکارهێنـەکانی فەرهەنگەکە روون دەکەنەوە.

**سەرچاوەکان:**

**– کوردی**


١. ئازاد باخەوان، (٢٠١٢)، "***چارەسەرکردنی ئاریشەکانی زاراوە و لێك نزیککردنەوەی دیالێکتەکانی زمانی کوردی***"، لە کتێبی"توێژینەوەکانی کۆنفرانسی زانستیی زمـانی کوردی ١٩ – ٢٢ی ئەیلولی ٢٠١١"، چاپی یەکەم، هەولێر: چاپخانەی رۆشنبیری.

٢. تالـب حوسـێن (٢٠١٢)، "***زاراوەسـازیی کـوردی و چـەند تێبینییـەك***"، لـە کتێبی"توێژینـەوەکانی کۆنفرانسـی زانسـتیی زمـانی کـوردی ١٩ – ٢٢ی ئـەیلولی ٢٠١١"، چاپی یەکەم، هەولێر: چاپخانەی رۆشنبیری.

٣. شـەهاب شـێخ تـەیب (٢٠١٢)، "***گرفتـی زاراوەدانـان لـە زمـانی کوردیـدا***" ، لـە کتێبی"توێژینـەوەکانی کۆنفرانسـی زانسـتیی زمـانی کـوردی ١٩ – ٢٢ی ئـەیلولی ٢٠١١"، چاپی یەکەم، هەولێر: چاپخانەی رۆشنبیری.

٤. کەمال جەلال غەریب، (٢٠١٢)، "***پرۆژەی زاراوەی زانستیی کوردی***" ، چاپی دووەم، هەولێر: دەزگای ئاراس.

٥. لێژنـەی زاراوە لـە کـۆڕی زانیـاریی کوردسـتان (٢٠٠٤)، "**زاراوەی کـارگێڕی**" چـاپی یەکەم، هەولێر: چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری.

٦. مەسعود محەمەد (١٩٩٨)، "***زاراوەسازی پێوانە***" ، بەغدا: چاپخانەی (سومر هاتف).


**– فارسی**


٧. بابازادە، جمیلە (١٣٨٨)، "***زبان، فرهنگ، اصطلاحات و ارتباط آنها باآموزش زبان هاي خارجی***"، مجله پژوهش زبانهای خارجی (ش.٥٥، ص. ١٩ – ٢٨).

٨. خسروی، فریبرز و همکاران (١٣٨٠)، "***اصطلاحنامة فرهنگی فارسی (اصفا)***"، تهران: کتابخانه ملی جمهوری اسلامی ایران.

٩. زندی روان، نرگس (١٣٨٦)، "***فضای سه بعدی اطلاعات و ضرورت ساختار اصطلاحنامه ها از طریق افزودن خصیصه های معنایی به آنها***"، کتابداری و اطلاع رسانی ، جلد ١١، شمارە ٤ ، صص(٦٥– ٩٠).صدرزاده، ماندانا (١٣٩٠)، "***ترجمه حقوقی: چالشها و نظریه های معاصر***"مجله پژوهش ادبیات معاصر جهان، ش.٦٢، (ص.٧٧–٩١).

١٠. علوی مقدم، سید بهنام (١٣٨٨)، "***ردەشناسی زبانی در پدیده دو زبانگی***"، فصلنامه زبان و ادب پارسی، شماره ٤٤.

١١. گروه واژه گزینی (١٣٨٨)، "***اصول و ضوابط واژه گزینی، ویرایش سوم***"، تهران: فرهنگستان زبان و ادبیات فارسی.

١٢. مشیری ، مهشید (١٣٧٠)، "***ساختار فرهنگها و واژه نامەهای تخصصی***"، مجله علمی پژوهشی علوم انسانی دانشگاه الزهرا، س٢، ش ٣و ٤، بهار ١٣٧٠، صص١٠٣ – ١٠٦.

١٣. نعمت زاده ، شهین (١٣٧٩)، "***استدلال در واژه گزینی***"، در "نامەی فرهنگستان"، سال چهارم، شمارەی چهارم، شمارەی مسلسل: ١٦.

**– ئینگلیزی:**

14. Anja Drama.M.(2009). "Terminology Polices And Communication For Social Change: Promoting Linguistic Diversty And Terminology In South Africa", Dissertaion(PHD): Wien University.
15. Antia,B.E(2000). Terminology And Language Planning: An Alternative Framework Of Discourse And Practice. Amesterdam/Philadolphia: Jhon Benjamins.
16. Cabre, M.T.(1999).Terminology : Theory, Methods, And Applications / M. Teresa Cabré; Edited By Juan C. Sager ; Translated By Janet Ann Decesaris.
17. _____ (2000). "Elements For A Theory Of Terminology: Towards An Alternative Paradigm". En: Terminology. International Journal OfTheoretical And Applied Issues In Specialized Communication, 6, 1, P.35 – 57(A).

18. Cooper, R. (1989).Language Planning AndSocial Change, Cambridge: Cambridge University Press.
19. Infoterm.(2005).Guidelines For Terminology Polices. Formulating And Implementing Terminology Policy In Implemation And Operation Of A National Policy On Information- Paris: UNESCO.
20. ISO 29383; 2010(E)."Terminology Policies- Development And Implementation".
21. Jernudd, B.H. And Das Gupta, J. (1971). "Towards A Theory OfLanguage Plan-Ning". In Can Language Be Planned?,J. Rubin And B.H. Jernudd (Eds), 195–215. Hawaii: East-West Center/The University Press.
22. Kaplan, R.B AndBaldauf, R.B., Hr. (1997). Language Planning From Practice To Theory, Clevedon: Multilingual Matters.
23. Sager, J. C. (1990).A Practical Course In Terminology Processing. John Benjamins, Amsterdam/Philadelphia.

## الملخص

## التخطيط الإصطلاحي في نظرية التخطيط اللغوي: المرصد المنهجي لتطوير اللغة الكردية

تقضي الإستفادة والتعليم الخبرة والعلم، وهذا أمر لايتم إلاّ من خلال لغة العلم والتكنولوجيا. وإذا أردنا أن نستعمل اللغة الكردية بوصفها اللغة القومية للأمة الكردية، فعلينا أن نوسع الشفرات اللغوية الخاصة باللغة العلمية – التقنية في لغتنا وتحتاج هذه العملية الى (تطوير المجال الاصطلاحي في نظرية التخطيط اللغوية) لهذا يحمل بحثنا عنوان (التخطيط الإصطلاحي في نظرية التخطيط اللغوي: المنطلق المنهجي لتطوير اللغة الكردية)، وحاولنا فيه أبراز أهمية التخطيط الاصطلاحي في تطوير اللغة العلمية – التقنية لمستخدمي اللغة الكردية ويعرفهم بالتطورات العلمية – الحديثة في مجال اللغة في عالمنا المعاصر.

## Abstract

**The Terminology planning in the language planning theory: a methodological approach to develop Kurdish language**

Learning and progress require the knowledge and expertise whose inevitable way of acquisition is the scientific and technical language. The use and application of our Kurdish language as a national language necessitates development and enrichment of the special linguistic codes of the scientific-technical language. Such development of language requires "Terminology planning in language planning theory: a methodological approach to develop Kurdish language", which is the title and topic of research in the current paper. In this paper, the aim is to highlight the significance of terminology planning in enriching the scientific-technical language which ultimately leads to immediate availability of the scientific knowledge and information for the Kurdish language speakers; an indispensible necessity in the today 's globalization process.

# ڕەوتی مێژوویی گۆڕانی ((ئەست)) لە زمانی کوردیدا

د. مزگین عەبدورەحمان ئەحمەد
بەشی کوردی – کۆلێژی زمان – زانکۆی سەلاحەددین

لەوانەیە ئەم بابەتە زیاتر لە بابەتێکی ئەدەبی بچێت و بیر و هزرمان بەرەو چیرۆکێکی خەیاڵی ببات، بەڵام لە راستیدا و بە تێڕوانینێك بۆ ڕەوتی مێژوویی گۆڕانی زمانی کوردی، ئەم حیکایەتە بوونی هەبووە و باس لە دیاردەیێکی زمانی کوردی دەکات، کە لە زەمانێکدا هەبووە و ئێستا تەنیا شوێن پێیەکی زۆر کاڵی لە خۆی بە جێ هێشتووە. ئەویش کارێکی تەواو بووە و ئێستا وەك کارێکی یاریدەدەر تەنیا بە تاکە مۆرفیمێك دەردەکەوێت. واتە ئەم بابەتە بابەتێکی زانستی مێژوویی و ئیتمۆلۆجییە کە لە بەشێکی زماندا، رۆڵی هەبووە و بە تێپەڕبوونی کات بە شێوەی جۆراو جۆر دەرکەوتووە.

ئەم لێکۆڵینەوەیە بە پێی ڕێبازی مێژوویی و وەسفی و شیکاری ئەنجام دراوە. سنوور و کەرەستەی بەکار هاتووە لە چوارچێوەی هێنانی نموونە لە زمانە ئێرانییە دێرینەکان و شێوەزاری لوڕی و زمانێکی ناوچەیی کرمانجی سەروو.

لێکۆڵینەوەکە لە سێ تەوەر پێکهاتووە و هەر تەوەرێك، قۆناغێکی مێژوویی گۆڕانی ئەم کارە دەردەخات.

لە تەوەری یەکەمدا: چۆنییەتی دەرکەوتنی (ئەست) لە دەمکاتەکانی سەردەمی زمانەکانی ئێرانی دێرین باس دەکەین.

لە تەوەری دووەم: قۆناغەکانی گۆڕانی (ئەست) بۆ (ست) و (ئەس)، لە سەردەمی ناوەندی و ئێستای زمانە ئێرانییەکاندا باس دەکەین.

لە تەوەری سێیەمیشدا: چۆنییەتی بوونی ئەم کارە بۆ (ە، یە) باس دەکەین لە جۆرەکانی ئێستای زمانی کوردیدا. دواتر کورتە و ئەنجامی باسەکە دەخەینە بەرچاو.

## تەوەری یەکەم:

١. ئەست:

ئەم کارە لە سەردەمانێك وەکو کارێکی سەربەخۆ دەرکەوتووە و لە رستەدا رۆڵی گێڕاوە و هەندێ جاریش وەك کاری (هەبوون)ی خاوەنیەتی و (هەبوونی) وجوود، کەینونە بەدەر کەوتوون. چاوگی ئەم کارەش هەندێ جار لە تێکستە دێرینەکاندا وەکو ئیستادن (estaden) و ئیشتادەن (eştaden) بووە (یداللە منصوری ٣٢:١٣٨٤). ریشەی بنەڕەتی لە ڕەگی ڕانەبردوو لە ئێرانی دێرینیشدا (-ah) بووە. ئەم کارە لە ئێرانی دێرین و ناوەڕاستدا بە زۆری لەم دۆخ و کاتانەدا بەکار هاتووە:

١-١. **رابردووی تەواو** (past perfect) **لە کاری تێنەپەڕ**:

بە زیادکردنی رەگی رانەبردووی کاری estaden و eştaden بە رەگی رابردووی دروست دەبێت:

| | | | |
|---|---|---|---|
| **رۆیشتووینە** | raft estĕm | **رۆیشتوومە** | raft estĕm |
| **رۆیشتوونە** | raft estĕd | **رۆیشتوویتە** | raft estĕ |
| **رۆیشتوونە** | raft estĕnd | **رۆیشتووە** | raft ested |

٢.١.١. بۆ دروستکردنی کاری رابردووی تەواوی تێپەڕ، بکەر وەك راناوی سەربەخۆ پێش رەگی رابردوو دێت و دواتر رەگی رانەبردووی کاری estaden لە کەسی سێیەم زیاد دەکرێت (ژاله+احمد ٧٨:١٣٨٠):

| | |
|---|---|
| **"من (ئەو)م دیتووە"** | um did ested |
| **"تو (ئەو)ت دیتووە"** | Ut did ested |
| **"من تۆم دیتووە"** | um to did ested |

١. ٢. لەم نموونانەی سەرەوە (لەو کاتەدا کە کارا دەرنەکەوتبێت)رستەکە لە کاری رابردووی تێپەڕ واتای رستەی نادیاری دەدات لەگەڵ (ئەست):

"**گووتراوە**" Guft estĕd

"**بینراوە**" did ested

**١. ٣. لە رستەی نیهاد و گوزارە** (برۆنر ١٣٧٦:٤٥٣):

"وە ئەو پڕە لە عیشق" Ud hō frihíft purr iştĕd.

ە پڕ عەشق ئەو وە

**١. ٤. رابردووی دووری تێنەپەڕ:**

بە زیادکردنی شێوەی رابردووی کاری estaden و eştaden بە رەگی رابردوو دروست دەبێ (رۆدیگراشمیث ١٣٨٢:٢٠٩):

١. āmād eştād hĕm **هاتبووم** ١.amād eştad hĕm **هاتبووین**

٢. āmād eştad hĕ **هاتبووی** ٢. amād eştad hĕd **هاتبوون**

٣. amād eştād **هاتبوو** ٣. amad eştad hĕnd **هاتبوون**

هەرچەندە کە لە هەندێ دەقی پەرتی دا لە شوێنی estaden کاری بوون (budan) هاتووە وەك کوردی ئێستا، نموونە:

چوو بووم (a)gad bud hēm

چوو بووی(a)gad bud hē

**١. ٤. ١. رابردووی دووری تێپەڕ:**

ئەم ڕابردووە بە هۆی بکەری لۆجیکی (agent) کە لە سەرەتای ڕستەدا دێت و ڕابردووی کاری سادەی iştadan و istadan و būdan دروست دەبێت:-

"من (ئەو)م دیت بوو" Um (ōy) did estād

"من دیت بووم" Um did būd

هەروەك تێبینی دەکرێت، لەم کارانەدا ڕەگی کاری ئیستادەن و ئیشتادەن لەگەڵ کاری سەرەکی هەمیشە وەکو کارێکی یاریدەر دەرکەوتوون. لەم کارانەدا هەروەك هەست دەکرێت، بە بێ ئەم کارە تێنسێکی دیاری زمانە کۆنەکان دروست نەبووە کە ئەویش کاتی رابردووی تەواوە.

**تەوەری دووەم:**

**٢. گۆڕانی ئەست بە ((ست و ەس)):**

لە دوای قۆناغی کۆن، کاری (ئیستادەن) شێوە کۆنەکەی لە دەست دەدات و هەندێ دەنگەکانی دەسوێ و نامێنن. بۆ نموونە لە قۆناغێکی دوای زمانی ئێرانیی کۆن، ئەم کارە وەك (ست) خۆی دەنوێنێ و دەنگی(ئە) لە سەرەتادا دەسوێ. هەندێ جاریش وا بیر دەکرێتەوە کە جێگۆڕکێ لە نێوان (ئە) و (ست) کرابێت. واتە ست لە سەرەتادا هاتبێت، دواتر (ە) بەدوایدا هاتبێت. واتە بە شێوەی (ستە یا سیتە) دەرکەوتبێت. ئەم جۆرە قسەکردنە لە پێش فارسی نوێ واتە فارسی دەری دا هەبووە. شێوازی دەرکەوتنی، شێوازێکی نیزیك بووە لە قسە پێکەرانی ئەم زمانە. بۆ نموونە (کردستم، گفتەستەم). بۆ ئەم جۆرە تێنسە موقەددەسی دەڵێت: ((خەڵکی نیشابوور (س)ینێکی بێ سوودیان بە هەندێ ڕەگی چاوگەوە لکاندووە)) وشەکانی (بخردستی، بگفتستی، بخفتستی) وەك نموونە هێناوە. (ملك الشعرا بهار)، ئەم جۆرە کارانەی ناو ناوە (کارەکانی نیشابووری)، جگە لە شیعر لە پەخشانیشدا لە سەردەمی زمانی دەریدا بە کار هاتوون (خانلری ١٣٨٢: ٩٦). وەك:

(گفتا مردی از آن راه آمدستم)

پەرویز خانلری دەڵێت: (کە چەند زانایێکی سۆڤیەتی جاران، لە بارەی ئەم جۆرە کارە لە رابردووی تەواودا، لە زارەکانی ئێستای ئێراندا لێکۆڵینەوەیان کردووە. بە پێی ئەم لێکۆڵینەوەیە، ئەمڕۆ لە زارەکانی (بدخشان، قراتکین، کولا لە تاجیکستان و کابۆل لە ئەفغانستان) کاری رابردووی تەواو بەم شێوازە بەردەوامە.

لە راستیدا ئەم زانا رووسییانە لەوانەیە سەرنجی هەندێ زاری کوردییان نەدابێت کە، لە کوردیشدا ئەم دیاردەیە بوونی هەبووە. بۆ نموونە لە هەندێ بەچکە زاری کوردیدا (ناوچەی زێبار). بە تایبەت لە کاری تەواودا ئەم دیاردەیە بەرچاو دەکەوێت.

٢. ١. لە کاری تێپەڕی تەواو هەندێ زارۆچکەی ناوچەی زێبار بەم شێوەیە (ست) دەرکەوتووە:

| | |
|---|---|
| **چوستیمە** | **چوستینە** |
| **چوستیی** | **چوستنە** |
| **چوستییە** | **چوستنە** |

لێرەدا هەروەك تێبینی دەکرێت، (ست) لەگەڵ کاری تێنەپەڕدا هاتووە. جگە لەمەش (ە) کە نیشانەی بەردەوامییە، وەك بەشێك لە مۆرفیمی رابردووی تەواو دەردەکەوێت. واتە چوومە و تائێستاش کاریگەریی ئەم چوونە هەر ماوە، یا دەکرێ بە جۆرێکی تریش لێك بدرێتەوە کە (ە)، لە سەرەتای وشەی (ئەست و هەست) قرتێندرابێت و هاتبێتە کۆتایی کارەکان. بە بەراورد لەگەڵ زمانە ئێرانییە دێرینەکان جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە. بڕوانە بڕگەی (١-١) کە لەم نموونانەی خوارەوەدا دیاری کراوە:

| ئێرانی دێرین | کوردی |
|---|---|
| Estém | Stéme |
| esté | stéî |
| Estéd | Stéye |
| Estém | Stéîne |
| estéd | sténe |
| Estend | sténe |

هەروەك دەبینین، ئەگەر نووسەکە کەسییەکان لابەرین دەردەکەوێت کە رەگی (sté)ەکە لەشێوەی کۆن و ئێستادا هەروەك یەکە.

٣. ١. ١. بۆ رابردووی تەواو لە کاری تێپەڕیش، لەم زارۆچکەیەدا بەم شێوەیە دەردەکەوێت:

| | |
|---|---|
| من کرستییە | مە کرستییە |
| تە کرستییە | وە کرستییە |
| وی کرستییە | وان کرستییە |

هەروەك لە بڕگەی (١-١-٢) باسمان کرد، لە بەراورد لەگەڵ ئێرانی دێرین پێویستە لێرەدا کارا لەگەڵ کارەکەدا بێت. شێوازی دروستبوونیشی بە هۆی ئەم (ست)یە، کە بە دیار کەوتووە و جگە لەمەش دوو دەنگی (ی) هەیە، کە یەکەمیان مۆرفیمی کەسی سێیەمە و ئەوەی تریش (یە)ی نیشانەی کاری تەواوە.

٢. ٢. کاری نادیار هەرچەندە کە لە ئێستادا نەبیستراوە دەربڕینی بە شێوەی (هاستیە گوتن) بێت، وەك لە بڕگە (١. ٢)دا باسی Guft eštĕd مان کردبوو، بەڵام بە پێی شێوازی هاتنی ئەم کارە بێت، پێدەچێت کە فۆرمێك لەم رۆنانە هەبووە و لە سەردەمێکدا بەکار هاتبێت. واتە بە شێوەی (هاستییە گوتن، هاستییە کرن، هاستییە کوشتن)، دواتر نەمابێت، ئێستا تەنیا (یە)کە مابێت واتە (هاتیە گوتن).

٢. ٣. بۆ رستەی نیهاد و گوزارە یا رستەی ئیسمی، (ست) بەتەواوی لە ناوچووە لە تەوەری سێیەمدا باسی دەکەین.

٢. ٤. بۆ رابردووی دووری تەواوی تێنەپەڕ لەم بەچکەزارەدا رستەکە بەم شێوەیە دەردەکەوێت:

| | |
|---|---|
| هاستبوومە | هاستبووینە |
| هاستبووی | هاستبوونە |
| هاستبوویە | هاستبوونە |

هەروەك دەردەکەوێت، ئەم فۆرمە بە هۆی هاتنی کاری تەواو بەشی دووەمی بە (یە) کۆتایی هاتووە و (ست)ەکەش پێش کاری یاریدەدەری بوون کەوتووە.

هەرچەندە کە قۆناغێکی دوای (ئەست)ە، بەڵام لێرەشدا هەست بەمە دەکرێت کە قۆناغێکی گواستنەوەیە لە نێوان ئەست و ست بۆ گۆڕینی بۆ (ە).

هەرچەندە کە قسە پێکەرانی ئەم زارە لەوانەیە لە چەند گوندێك مابن و لە پەنجەی دەست تێنەپەڕن، بەڵام قسەکەری ڕەسەنی ناوچەکەن کە زارۆچکەی بەم شێوەیان بەرەو نەمان دەچێت.

**٣. گۆڕانی ئەست بۆ (ەس) یا (ئەس):**

بە تێپەڕینی کات لە ئێرانی دێرین بۆ سەردەمی دەری، دەبینین کە ئەست و ست لە قۆناغی دواتر بۆتە ەس یا ئەس. بۆ نموونە لە زاری لۆڕیدا، (ەس) شوێنی ئەست و ست ی گرتووە و تائێستاش بەکار دێت. هەرچەندە کە هەندێ زمانەوان بە مۆرفیمێکی بەتاڵ دایدەنێن، لەبەر ئەوەی گوایە هەبوون و نەبوونی کار لە واتا ناکات (عبدالوهاب ٢٠٠٠:٩٠)، بەڵام لە ڕاستیدا درێژە پێدەری هەمان کارە یاریدەرەکەیە. لە زاری لۆڕیدا بەم شێوەیە دەردەکەوێت:

٣-١. لە کاری ڕابردووی تەواوی تێپەڕ لە کاری (کردن):

١ **کردمەس (کردوومە)**
٢ **کردتەس (کردووتە)**
٣ **کردییەس (کردوویەتی)**

٣-٢. لە کاری ڕابردووی تەواوی تێنەپەڕ لە کاری (چوون):

**چیمەس (چوومە)**
**چیتەس (چووتە)**
**چییەس (چووە)**
**هاتمەس (هاتوومە)**
**هاتییەس (هاتووە)**

٣-٣. لەگەڵ کاری بکەر نادیاردا لە کاتی ڕابردووی تەواودا:

**وتریاس (وتراوە)**
**وتنەس (وتوویانە)**

٣-٤. لەگەڵ کاری رابردووی دووری تەواو:

**هاتبوومەس**

**هاتبووتەس**

**هاتبوویەس**

**وتبوویەس**

**چووبوویەس**

هەروەك تێبینی دەکرێت لە گشت ئەم کارانە (ەس) وەك کارێکی یاریدە دەرکەوتووە، هەرچەندە کە (بوون) خۆی کارێکی یاریدەرە، بەلاّم بۆ تەواوکردنی ئەرکەکە هەر لە قۆناغی دێرینەوە لەگەڵی هاتووە. جگە لەوەی کە لەم کارانەدا وەك کاری یاریدەر دەرکەوتوون، لە کاری (بوون)ی کەینونەشدا بە شێوەی (ەس) دەرکەوتووە. وەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

کاری (بوون)ی وجوود:

**بیومەسە مامۆستا**

**بیوتەسە مامۆستا**

**بیویەسە تالب**

٣-٥. لە کاری ناتەواودا (تارا عەبدوڵا ٢٤:١٩٩٨):

**ئەوەس** (ئەوە)

**ئەو نییەس** (ئەو نییە)

**براەس** (برایە)

جۆرێکی تری بەکارهێنانی ئەم تێنسە، بە شێوەی دەگمەن و کەمیاب لە هەندێ تێکستی سەردەمی (دەری)دا دەبینرێت. ئەویش بەکارهێنانی کاری ناتەواوی (ئەست) بە شێوەی (هەست)ە: **((یهودا بر سر آن چاه نگاه کرد تا یوسف زنده هست))**

((**مارا خود محنت افتاده هست**)) **خانلری١٣٧٣**:٨٤).

شێوازی زمانی (دەری) ئەم جۆرە کارە بۆ ئەو مەزەندەیە دەمانبات کە بیر لەوە بکەینەوە زاری فەیلی لە دوای زاری دەری هێشتا لە ژێر کاریگەرییەکانی زاری دەری بە یەکجاری تەواو نەبووە و هەژموونی (هەست)، هێشتا بە زاری فەیلییەوە ماوە.

**٤. گۆڕانی (ست) بۆ (یە،ە):**

دەنگی (ە) لەلایەن زمانەوانە کوردەکانەوە بە فۆنیمێکی بێ هێز سەیر کراوە، بەلاَم لە راستیدا ئەم (ە)یەی کە ئێستا لە کاری رابردووی تەواو لە زمانی کوردیدا دەردەکەوێت لە چاو ڤاولەکانی تر سەنگێکی زۆرتری هەیە. لەبەرئەوەی چ وەك فۆنیم یا مۆرفیمی دارشتن یا مۆرفیمی رێزمانی رۆڵی بەرچاوی لە پێکهێنانی پۆلە رێزمانی و واتاییەکاندا گێڕاوە (ئومێد بەرزان ٤٩:٢٠١٠). ناکرێ لەم لێکۆڵینەوەیەدا بە درێژی باس لە ئەرك و رۆڵی ئەم دەنگە بکەین، تەنیا ئاماژە بە هەندێ ئەرکی دەکەین کە پەیوەستە بە بابەتەکەمان:

لە کاری رابردووی تەواوی تێنەپەڕ لە (ك.س)دا بەم شێوەیە دەردەکەوێت:

| | |
|---|---|
| چوویمە/ چوومە | چووینە/چووینە |
| چوویە/ چوویتە | چوونە/چوونە |
| چوویە/چووە | چوونە/چوونە |

لە کاری رابردووی تێپەڕ بەم شێوەیە دەردەکەویت:

| | |
|---|---|
| من کرییە/کریومە | مە کرییە/کریومانە |
| تە کرییە/کریوتە | وە کرییە/کریوتانە |
| وی کرییە/کریویەتی | وان کرییە/ کریویانە |

لەوانەیە بەشێك لە زمانەوانان یە(ye) بە ئەسپێکتی کاری رابردووی تەواو دابنێن (سلیمان اسماعیل ٩١:٢٠٠٦)، یاخود بەشێکیش بە مۆرفیمی رێکەوتن (بائیز عمر ٣١:١٩٩٩)، بەلاَم لە راستیدا، لە بنەڕەتا هیچکامیان نییە جگە لەوەی

کــە شــوێنگرەوەی (اســت)ی دێرینــە و ئێســتا وەك مــۆرفیمی کــاری تــەواو دەردەکــەوێت. هەنــدێ جــاریش وەك کــاری بــوون ســەیر دەکرێــت (کــوردییڤ ٢٢:١٩٨٤).

هەروەك دیارە (ە) لە شوێنی (ئەست) بەکار هاتووە، پرسیارەکە لێرەوە دەست پێدەکات ئایا ئەم (ە)یە بە درێژایی زەمان لە (ئەست) چۆن بۆتە (ە)ی بە تـەنیا؟ ئایـا یاسـاکانی فۆنۆلـۆجی ڕێگـا بـەم جـۆرە گۆڕانکارییانـە دەدات؟ ئایـا بنەمایەکی روون و ئاشکرا هەیە بۆ ئـەم گۆڕانـە؟ یـاخود جیـاوازی شـێوەزارەکانی ئێرانی دێرین ئەم جیاوازییەی دروست کردووە؟

### ٤-١. لێکدانەوەیەکی فۆنۆلۆجی:

هەروەك دیارە لەم نموونانەی سەرەوەدا دوو دەنگی (ست) سواون و دەنگـی (ئە،ە) ماوەتەوە. بە پێی ئاراستەکە تێچوون لە دواوە بۆ پێشەوەیە. واتە (سـت) نەماوە و (ە)ی سەرەتا ماوە. لێرەدا دەکرێ پشت بـە ئاراسـتەی بـەدوای یەکـدی هاتنی دەنگەکان نەبەسترێت، بەڵکو بە پێی هەندێ بنەمای تری وەکو گڕی و کپی و بەهێزی و بێ هێزی یا هاتنی ڤاول و کونسنانتەکان بێـت. لێـرەدا سـێ تێـڕوانین دروست دەبێت:

١. ئەگەر لە رەهەندێکەوە بـۆ گـڕی و کپـی بـڕوانین، ئەمـە دەنگـی (س،ت) دەبێ نەسوێن و دەنگێکی وەك (ە) لە ناو بچێت. یاخود کپەکان ببن بە گـڕ، واتـە (س) ببێ بە (ز) و (ت) ببێ بە (د). لە کاتێکدا دەنگی (ە)، زۆر زوو بە کاریگـەری دەنگەکانی دەوروبەری تێدەچێت (بهزاد محسن ٢٠٠٨:١٢٦). بۆ نموونـە (لـە ئێـرە دەبێ بە لێرە).

٢. ئەگەر دوو دەنگی کپ لە تەك یەك بـێن، ئاسـاییە کـە یـەکێکیان لـە نـاو بچێت. هەروەك هاتنی (س،ت) پێکەوە دەنگی (ت ) لە ناو دەچێت. وەك: دەسـت ماڵ= دەسماڵ. یا وەك هەست/ی دەری لە لۆڕیدا بۆتە (هەس).

٣. هەموو کات مەرج نییە یاساکانی فۆنۆلۆجی تەواو دەربچن. هەروەك چۆن لە زۆر زماندا یاسـاکانی گـریم، هەمیشـە لـە سـەر هەنـدێ زمانـدا پیـادە نـاکرێن و نـاوێزەی تـێ دەکـەوێت. هەنـدێ جـار لـە کوردیـدا دەنگـی (ئـە) نـەك تـەنیا لـە

دەوروبەری دەنگی تر ناسویٚ بەڵکو زۆر بەهێزتر دەردەکەوێت، بە تایبەت کاتیٚ کە دوو ڤاول لە تەك یەك بن و دەنگێکی نیمچە کونسنانت بکەوێتە نێوانیان. وەك (ەوە، ەیە...تاد).

### ٤-٢. لێکدانەوەی مۆرفیمی:

١. مەرج نییە دەنگی (ە) هەموو کات بیٚ هێز بێت، بە تایبەت کاتیٚ وەك مۆرفیم ئەرکی هەبێت. ئەگەر بەراوردی کوردی و فارسیش بکەین، ئەوە بۆمان روون دەبێتەوە کە (ە) هەمان جێگرەوەی (است)ە و بە پێچەوانەوەش نەك تەنیا (ە) بە مۆرفیمێکی بیٚ هێز ئەژمار ناکرێت، بەڵکو بەهێزییەکەی بۆتە هۆکاری نەمانی (ست). لە فارسیدا مۆرفیمەکانی (ام، ایم_ ای، اید_ اند، است) بە کورتکراوە و پاشماوەی گۆڕاوی چاوگی (استیدن) دەزانرێن. کە واتە نەك تەنیا (ئە) نەسواوە بەڵکو بۆتە مایەی سوانی (ست). تەنیا لە کەسی سێیەمی تاك نەبێت، کە بەهۆی نەدەرکەوتنی راناوی کەسی سێیەم (ست) هێزەکەی لە دەست نەداوە. یا هەندیٚ جار (ە) بە هێزێکی زۆرەوە دەبیٚ بە جێگرەوەی مۆرفیمی تری وەك (بۆ). بۆ نموونە:

دەچم بۆ بازاڕ ←——— دەچمە بازاڕ.

٢. لە کوردیشدا هەندیٚ جار ئەم (ە)یە بە مۆرفیمی کاتی ئێستا یاخود مۆرفیمی سێیەم کەسی تاك و هەندیٚ جاریش بە کاری ناتەواو هەژمار کراوە. بەڵام لە راستیدا نەك تەنیا ئەمانەی سەرەوە نییە بەڵکو کارێکی بەهێزیشە لە دروستکردنی رستەدا. وەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

ئازاد مامۆستا

هەوا خۆش

ئارام باش

ئایا ئەم رستانەی سەرەوە هیچ واتایەك دەگەیێنن ئەگەر بەم شێوەیە دەرنەکەون؟

ئازاد مامۆستایە.

هەوا خۆشە.

ئارام باشە.

بۆیە نەك ناکرێت بڵێین کە کاری ناتەواون بەڵکو کاری سەرەکین لە دروستکردنی رستەدا.

### ٤-٣. لێکدانەوەیەکی مێژوویی:

فرانز بۆپ لە وتارێکدا دەڵێت شێوەی لاتینی ئەماریس (amāris) بە واتای (تۆ خۆشەویست دەبی)، وەرگیراوە لە ئەماسیس (amāsis) و بەردەوام دەبێت کە ئەم شێوازە هەڵگری توخمی ـِ س(s)ە، کە رەگی کارێکی تێدایە. جگە لەمەش دەڵێت کە، هەندێ شێوازی رابردوو هەیە لە یۆنانیدا، کە (س)ی تێدایە. وەك ئلۆسۆ (elūsa) بە واتای (شلم کرد) هەروەها شێوەی داهاتووشی هەیە وەك لۆسۆ (lūsō) بە واتای شلی دەکەم. کە هەڵگری بەشێکی کاری (بوون)ە. وێنە یۆنانییەکەی ـِس(es)ە و سانسکریتییەکەی ـَ س(as)ە (رۆبینز ١٣٧٨:٣٧٠). کە واتە لە زمانی یۆنانیی کۆن و لە سانسکریتی (as)ەکە هەبووە. لە ئێرانی دێرینیشدا وەك کارێکی سەربەخۆ (ئەست) هەبووە (مهری باقری، ١٣٨٠:١٥). لە کوردیشدا وەك باسمان کرد، لە شێوەزاری لۆڕی و هەندێ شێوەزاری کرمانجیدا هەیە. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت لە ئێرانی دێریندا شێوە راستەقینەکەی کە کاری سەربەخۆ بووە، هەبووە و لە ئێرانی ناوەڕاستدا (ست) و (است) بوونەتە کاری یاریدەر. لە سەردەمی ئێستاشدا یا وەك سەردەمی ناوەڕاست لە هەندێ شێوەزاردا ماوە، یاخود تەنیا بۆتە مۆرفیمێکی ئەرکدار وەك (ە) بەتەنیا دەردەکەوێت بەم شێوەیە:

ئەستیدەن ← ئەست ← ست ← ئەس، هەس ← ە

لێرەدا دەبێ تێبینی ئەوە بکەین، جگە لەم گۆڕانکارییە لە فۆرمی ئەستیدەن، گۆڕانێکی تریش رووی داوە، ئەویش لە بەدواداهاتنی راناوەکان یا نووسەکەکانە. لە ئێرانی دێرین و فارسیدا راناوەکان دوای ئەست دێن، بەڵام لە کوردیدا راناوەکان پێش ئەست دەکەون:

| | |
|---|---|
| ئێرانی دێرین | کردە + است+ م رفتە + است + م |
| زاری فەیلی | کرد + م + ەس چی + م + ەس |
| زارە کوردییەکان | کردو +م + ە چوو+ م + ە |

لە زارۆچکەی (ناوچەی زێبار) وەك دەقە کۆنەکەیە بەلاّم دیسان (ە) کەوتۆتە دوای راناوەکان:

کر + ست + م + ە

چوو + ست +م +ە

لەم هێڵکارییەدا مەبەستمان باشتر روون دەبێتەوە:



## ئـەنـجـــام:

لەم لێکۆڵینەوەیەدا گەیشتینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

١. کاری (ئەستیدەن) لە زمانی ئێرانی دێریندا هـەبووە و ئـەم کـارە وەك es لـە یۆنانیـدا و as لـە سانسـکریتیدا هـەبووە، وەك بەشـێك لـە کـاری بـوون. تـا سەردەمی نوێش لە زمانی فەرمی ئێرانـدا، بـوونی مـاوە. لـە زاری لـۆڕی و هەنـدێ بەچکەزاری ك.س/شدا دا ماوە.

٢. ئەم (ئەستیدەن)ە لە سەردەمی ئێرانی ناوەڕاستدا بە شـێوەکانی (سـت، ەس، هەس، ستە) دەرکەوتووە.

٣. لە سەردەمی ئێستادا ئەم کارە بەرەو نەمان دەچێت و ئێستا لـە زۆربـەی زمان و زارەکانی کوردیدا (ە) ماوەتـەوە و لـە فارسیشـدا یـا وەك (ە) یـاخود (ێ) دەردەکەوێت.

٤. ئەم (ە)یە گرنگی و سـەنگێکی تایبـەتی لـە زمانـەکانی هینـدو ئەورووپیـدا هەبووە و پێگەیەکی تۆکمەی لـە زمـانی هینـدیی ئێستاشـدا داگیر کـردووە. بۆتـە هەوێنی دروستکردنی زۆربـەی کارەکـان، جگـە لەمـەش ڕەگـی ڕانـەبردووی کـاری بودن و ئەستیدەن، لە ئێرانی دێریندا (ah) بووە، کە ئەمەش نیزیك دەبێتـەوە لـە (have)ی ئینگلیزی و (هە)ی کوردی و(هست)ی فارسی.

٥. بە پێی دابەشبوونی زمانە دێرینەکان و هاتنە کایـەی زمانـەکانی ئێسـتای کوردی و فارسی، دەکرێ بڵێین کە ئەو بەشە زار و زمانانـەی کـە (ئەسـت، هـەس، سـت وسـتە)یان تێـدا بـەکار دێـت، سەرچـاوەکەیان زۆرتـر بـۆ سـەردەمی زمـانی پەهلەوی ساسانی دەگەڕێتەوە، لەبەرئەوەی لەم زمانـەدا کـاری (ئەسـتیدەن) زۆر بەکار هاتووە و باو بووە. بە پێچەوانەوە ئەو زمانانەی کە (ئەست)یان کردۆتە (ە) سەرچاوەکەیان زۆرتر بەلای زمانی پارتی ئەشکانی دەشکێتەوە، لەبەرئەوەی ئـەم کارە لە پارتی ئەشکانیدا کەمتر باو بـووە و زۆرتـریش وەك کـاری (ئەشـتیدەن یـا بودەن) بەکار هاتووە.

## سەرچاوەکان:


١. ئومێد بەرزان برزۆ، مۆرفیمی /–ە/ لە ڕێزمانی کوردیدا. گۆڤاری زمانناسی، ژمارە ١٠. ساڵی ٢٠١٠. هەولێر.

٢. بائیز عومەر ئەحمەد، تێنس لە دیالێکتی ژووروی زمانی کوردیدا– ٢٠٠٢، چاپخانەی موکریانی.

٣. بهزاد محسن رەووف، تێنس لە نێوان زاری ناوەڕاستی زمانی کوردی و زمانی فارسی ستانداردا. نامەی ماستەر زانکۆی سەلاحەددین. کۆلێژی زمان، بەشی کوردی، ساڵی ٢٠٠٨.

٤. تارا عەبدوڵلا سەعید، هەندێك لایەنی ڕێزمانی زاری فەیلی؛ نامەی دکتۆرا . زانکۆی سەلاحەددین، کۆلێژی ئاداب ساڵی ١٩٩٨.

٥. سلێمان ئیسماعیل ڕەجەب، مۆرفیمە ڕێزمانییەکانی کرمانجی سەروو (گۆڤاری بادینان)، نامەی ماستەر– ٢٠٠٦، زانکۆی سەلاحەددین.

٦. عەبدولوەهاب خالد موسا. ڕێزمانی (بوون و هەبوون) لە کوردیدا، ساڵی ٢٠٠٠، نامەی ماستەر، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین.

٧. Qenatê kurdo, Gramera zimanê Kurdi-Kurmanci- Sorani-1990, Roja nu.

٨. کۆردییێف ك.ك.، ڕێزمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی، وەرگێڕان، کوردستان موکریانی– ١٩٨٤، ئەمینداریەتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان.


### سەرچاوەکان بە فارسی:


٩. پرویز ناتل خانلری، دستور تاریخی زبان فارسی، به کوشش، عفت مستشارنیا، چاپ پنجم– ١٣٨٢، انتشارات طوس.

١٠. ــــــــ، تاریخ زبان فارسی، جلد اول، چاپ ششم– ١٣٧٣، نشر سیمرغ

١١. رودیگر اشمیث، راهنمای زبانهای ایرانی (١٩٣٩)، ترجمه فارسی، زیر نظر حسن رضایی باغ بیدی، جلد اول– ١٣٨٢، انتشارات ققنوس.

١٢. روبینز. رابرت هنری، تاریخ مختصر زبانشناسی، ترجمه علی محمد حق شناس، چاپ سوم– ١٣٧٨، کتاب ماد.

١٣. ژاله اموزگار + احمد تفضلی، زبان پهلوی (ادبیات و دستور ان)، چاپ سوم– ١٣٨٠، انتشارات معین.

١٤. کریستوفر، ج، برونر، نحو زبانهای ایرانی میانه غربی، ترجمه و تحقیق، سعید عریان، چاپ اول– ١٣٧٦، انتشارات حوزه هنری.

١٥. مهری باقری، واجشناسی تاریخی زبان فارسی– ١٣٨٠، نشر قطره.

١٦. یداللە منصوری، بررسی ریشه شناختی فعلهای زبان پهلوی (فارسی میانه زردشتی)، چاپ اول– ١٣٨٤، نشر اثار.

## ملخص البحث

يسعى البحث لأظهار الجانب التأريخي من الفعل المساعد في اللغة الكردية وهو الفعل الذي كان يستخدم كفعل مستقل. غير أنه اليوم لايستخدم الا (كمورفيم) لغوي في الفعل الماضي. ويعتبر هذا البحث من الدراسات التأريخية (الجذرية أو الايتمولوجية) ويتشكل البحث من محاور ثلاثة وهي كالتالي:

المحور الأول يتحدث عن (است) في اللغة الايرانية القديمة وكيفيتها في الفعل التّام والماضي البعيد والمبني للمجهول.

أما المحور الثاني، فيتضمن دراسة عن تحوّل (است) الى (ست وسيته) حيث يستخدم في بعض اللهجات الكردية اليوم في الفعل الماضي، كذلك في اللغة الايرانية في العهد الوسيط.

وقد شكل المحور الثالث: متابعة التغيرات الواقعة لتلك الأفعال الى (ه — يه) وتستعمل اليوم في الماضي التّام في اللغة الكردية وتحليلها من جوانب عدّة (كالفونيم والمورفيم) في التّحوّل التاريخي.

## Abstrract

This paper is an attempt to display the historic aspect of auxiliary in Kurdish language , the verb that was used as an independent verb. However, it is only used as a linguistic morpheme in past verb today. This paper is an etymological study and consists of three sections as follows:

Section one deals with ( -AST) in the Old Iranian language and its use and form in perfect case, distant past and passive.

Section two studies the way (-AST) has transformed to (-ST and -SITA) which are used in some dialects in Kurdish with past verb and also in Iranian language during the medieval era.

Section three is a follow-up of the transformations and changes of these verbs into (-A -Ya) which are used today in past perfect in Kurdish and analyzing it from various perspectives such as (phoneme and morpheme) within historical transformation.

# کارامەیی لە زماندا وەك پێویستییەکی بێژەری ڕاگەیاندنکار

**د. ئازاد ڕەمەزان عەلی**
زانکۆی پۆلیتەکنیکی/ هەولێر

## پێشەکی

**– ناوونیشانی لێکۆڵینەوەکە :**

ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە (کارامەیی لە زماندا وەك پێویستییەکی بێژەری ڕاگەیاندنکار)ە و بێژەری ڕادیۆ بەنموونە وەرگیراوە . بێژەری ڕادیۆ لە ناردنی پەیامدا بە پلە یەك پشت بە دەنگەکەی دەبەستێت، واتە وشەی درکێنراو. لێرەدا ئاستی گۆکردنی دەنگ و وشە و ڕستەکان لەلایەن بێژەرەوە زۆر گرینگە، چونکە مرۆڤەکان لەم ڕووەوە جیاوازییان هەیە، هەندێکیان ئاستیان لاوازە و هەندێکیان مام ناوەند و هەندێکی تریان باش. بێژەرانی ڕاگەیاندنکار لەم دۆخە بەدەرنین، بۆیە پێویستە ئاست لاواز و مام ناوەندەکان هەوڵی چاککردنیان بدەن بەرەو باش و باشتر .

**– سنووری لێکۆڵینەوەکە :**

ئەم لێکۆڵینەوەیە تەنیا لێکۆڵینەوەیەکی تیۆرییە بۆ بێژەرانی بواری ڕاگەیاندن و خستنەڕووی هەندێ ڕێنمایی و ڕاسپاردەی گشتییە بۆیان .

**– گرفتی لێکۆڵینەوەکە:**

هەموو کەسێك پێویستی بەوە هەیە کە توانایەکی سەرکەوتووتری هەبێت بۆ پێوەندیکردن تاکو بتوانێ کاریگەرییەکی باش لەلای وەرگر دروست بکات، بۆیە زۆربەی خەڵك پێویستییان بەسازاندن و کارامەیییەکانی پێوەندیکرن و

مەشقکردن لە سەریان هەیە. کارامەبوون لە زماندا کە زمان هۆکارێکی سەرەکیی پێوەندیکردنە و پێویستییەکی گرینگی ڕاگەیاندنکارە، ئاخاوتنیش وەك دووەم کارامەیی لەزماندا لایەنێکی گەورەی چالاکی زمانیی مرۆڤە و چالاکترین هۆکارە بۆ جێبەجێکردنی پێویستییەکانی. ئەگەرچی هەندێ کەس وای بۆ دەچن، کە کارامەیی ئاخاوتن کارامەییەکی ساکارە بەشێوەی خۆڕسك مرۆڤ لە سەرەتای ژیانیدا لەگەڵیدا گەشە دەکات، تەنیا بە بوونی ئەندامانی ئاخاوتن کە توانای دەربڕین و گوزارشتکردنی هەبێت. بەڵام پرۆسەکە بەم شێوەیە نییە، بەڵکو لەوپەڕی ئاڵۆزیدایە، چونکە چەندین پرۆسە و لایەنی لاوەکی تێ دەکەوێت، وەك ڕەهەندی دەروونی و لایەنی هۆش و بیر و ئاستی تەمەن و ڕۆشنبیری و.... هتد.
ڕەواندنەوەی ئەم بیر و بۆچوونە و خستنەڕووی ئاڵۆزیی ئەم لایەنە وەك ئاگادارکردنەوەیەك بۆ ڕاگەیەندنکارانی کورد بەمەبەستی بەهەند وەرگرتنی ئەم بابەتە واتە ئاخاوتن و دەربڕین لەلای بێژەران لە دووتوێی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا خراوەتە ڕوو.

**- گرینگیی لێکۆڵینەوەکە :**

کارامەییەکانی زمان و پێوەندییان بەکەسانی ڕاگەیەندنکار و ئاگاداربوون و شارەزابوونی ڕاگەیەندنکار لە کارامەییەکانی زمان و بە هەند وەرگرتنی ئەم لایەنە، پێویستییەکی سەرەکییە بەشێوەیەکی گشتی و کارامەیی ئاخاوتن بۆ بێژەری ڕاگەیاندنکار بەتایبەت. خستنەڕووی لایەنە جیاجیاکانی ئەم بابەتە لە چوارچێوەی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا بۆ بێژەری کورد کارێکی گرینگ و سوود بەخشە، ئەگەر لەبازنەی لێکۆڵینەوەیەکی تیۆریش بێت و ببێتە هاندەرێك بۆیان بۆ زیاتر گرینگیدان بەوردەکارییەکانی زمان و بەدواداچوون بۆ ئەو سەرچاوە زمانەوانییانەی دەبنە مایەی بەدەستهێنانی شارەزایی زیاتر.

**- کەرەستەی لێکۆڵینەوەکە:**

لە بەر ئەوەی لێکۆڵینەوەکە تەنیا لێکۆڵینەوەیەکی تیۆرییە و مەبەست خستنەڕووی هەندێ ڕێنمایی و ڕاسپاردەیە لە بواری یەکێك لە کارامەییەکانی

زمان، کە کارامەیی ئاخاوتنە بۆیە هەوڵمانداوە بەپێی توانا پشت بەو سەرچاوانە ببەستین کە باسیان لەم بابەتە کردووە وەکو کەرستە بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە.

**– ئامانجی لێکۆڵینەوەکە:**

بەو پێیەی کە ڕاگەیاندن جۆرێکە لە جۆرەکانی پێوەندیکردن و ئەمڕۆ پانتاییەکی فراوانی لە پرۆسەی پێوەندیکردندا داگیر کردووە، کاری بێژەریش یەکێکە لە کارە دیارەکانی ڕاگەیاندن، بۆ جێبەجێکردنی ئەم پرۆسەیە (ڕاگەیاندن) زمان هۆکار و فاکتەرێکی سەرەکییە، کارامەبوون لە ئاخاوتندا وەك یەکێك لە کارامەییەکانی زمان، کە بێژەری ڕاگەیاندنکار لە ئەنجامدانی کارەکەی پشتی پێ دەبەستێت، کارێکی پێویستە، ئامانجی ئەم لێکۆڵینەوەیە خستنەڕووی هەندێ ڕێنمایی و ڕاسپاردەی پێوەندیدارە بەم بابەتە لە پێناو سوودگەیاندن پێیان و بەتایبەتی ڕاگەیەندنکاری کورد، چونکە ئەمڕۆ بەحوکمی زۆربوونی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی کوردی، کەسانێکی زۆر ڕوویان لەم پیشەیە (بێژەری) کردووە دوور لە ئاگاداربوون لە بنەما زانستییەکانی ئەم بوارە .

**ناوەرۆکی لێکۆڵینەوەکە :**

لێکۆڵینەوەکە لە دوو تەوەر پێکهاتووە، لە تەوەری یەکەمدا باس لە (چەمك و پێناسەی کارامەیی، زمان و کارامەییەکانی زمان، ئاخاوتن لە ڕووی چەمکەوە، گرینگیی ئاخاوتن، کارامەییەکانی ئاخاوتن، جۆرەکانی ئاخاوتن) کراوە. تەوەری دووەمیش ئەم بابەتانە لەخۆ دەگرێت: (ڕاگەیاندن، کارامەیی شێوازی ئاخاوتنی ڕاگەیاندنکار، هەندێك ڕاسپاردەی زمانی دەربارەی شێواز و تەکنیکی ئاخاوتن لە بواری ڕاگەیاندنی بیستراودا، کە بریتین لە: دەربڕین و گوزارشتکردنی چاك، کۆنترۆڵکردنی خێرایی ئاخاوتن، دۆزینەوەی هێز «نبرە» یەکی دەنگیی ڕاست و دروست، شارەزابوون لە چۆنیەتیی ئاخاوتن و بەردەوامبوون لە ئاخاوتن، کۆنترۆڵکردنی دانیشتن، وەستان، هەناسە) لە کۆتاییدا ئەنجامەکان و کورتەی لێکۆڵینەوەکە بەهەردوو زمانی ئینگلیزی و عەرەبی خراونەتە ڕوو.

## تەوەری یەكەم

### كارامەیی لە ڕووی چەمكەوە:

كارامەیی، واتە شارەزابوون و ئاشنابوون بە شتێك بە شێوەیەكی زۆر باش و تۆكمە لە هەموو ڕوویەكەوە، بۆ نموونە: كاتێك دەگوترێ ئەو كەسە كارامەیە لە زانست یان لە فلان پیشە، لەو كۆنتێكستەدا كارامەیی ئاكارێكی پرۆگرامسازی و زانستی پێوەندیدارە بەمرۆڤ، كە ئەو كارەی تێدا كارامەیە بە پرۆفشنالی ئەنجامی دەدات و ڕێكوپێكییەكی زۆری پێوە دیارە.

هەموو ئەو كار و چالاكیيانەی ڕۆژانە لە ژیانی مرۆڤدا بوونیان هەیە، وەكو : (پێوەندیكردن، ئاخاوتن، گوێگرتن، نووسین، بزاوتن "جوولە"ی هونەری . وەرزش، كاری دەستی، پیشەیی .......هتد ) دەشێ مرۆڤ تیایاندا قوول ببێتەوە و كارامەیی بەدەست بێنێت، كەواتە كارامەیی كۆمەڵە توانستێكە بۆ جێبەجێكردنی ئەركێكی دیاریكراو بە شێوەیەكی زۆر باش، هەروەها كارامەیی كارێكی كەڵەكەبووە لە شتێكی بچووكەوە دەست پێ دەكات تاكو دەبێتە شتێكی گەورە، واتە كارامەیی لە سانایی و ساكارییەوە بۆ ئاڵۆزی دەڕوات. بۆیە زۆربەی لێكۆڵینەوەكان وای دەبینن كە پەیوەندییەكی بەهێز لەنێوان پێگەیشتنی جەستە و مەشق و شارەزایی لەلایەك و كارامەیی زۆر باش لەلایەكی ترەوە هەیە (عبدالهادي وآخرون، ٢٠٠٣، لا ٢٤) .

**كارامەیی دوو لایەنی پێویستە:**

١- **لایەنی تیۆریی كارامەییەكە:** واتە ئەو كەسەی كە فێری كارامەییەكی دیاریكراو دەبێت، پێویستە شارەزاییەكی تەواوی لە سەر بنەما گشتییەكانی چۆنیەتی فێربوونی هەبێت.

٢- **مەشقی پراكتیكیی پێوەندیدار بە لایەنی تیۆرییەوە** : لێرەدا جەخت لە سەر ئەوە دەكرێت، كە بەستنەوەی لایەنی پراكتیكی بەتیۆرییەوە، كارێكی گرینگە بۆ پێكهێنانی كارامەییەكان، ئەمەش پێویستی بەمەشق و ڕاهێنان و هەڵسەنگاندنی بەردەوام بۆ ئەو كارامەییە هەیە، تاكو دەگاتە پلەیەكی زۆر باشی فێربوون (هەمان سەرچاوە لا ٢٥) .

زمانیش وەك دیاردەیەكی گرینگ و تایبەت بەمرۆڤ و ژیانی مرۆڤ، دەكرێ کارامەیی لەم بوارەدا (زمان) بەم شێوەیە پێناسە بکەین:
بریتییە لە دەربڕین و تێگەیشتن و بەکارهێنانی زمان لە ڕووی نووسین و خوێندنەوە و گوێگرتن و ئاخاوتن و فەرهەنگ و وشەسازی و ڕستەسازی و شێواز، بەشێوەیەك ئەگەر هاتوو بەکارهێنی زمانێك شارەزای هەموو ئەو ئاستانەی بوو، واتە بنەما و پێکهاتە و واتا و شێوازی ئەم زمانە، بەو کەسە دەوترێت، کارامە لە زماندا، کەواتە کارامەییەکانی زمان چوارن، کە بریتین لە (بیستن، ئاخاوتن، نووسین، خوێندنەوە).
لەم لێکۆڵینەوەیەدا ئەو کارامەییەی کە زیاتر پەیوەندی بە بابەتەکەی ئێمەوە هەیە، کارامەیی (ئاخاوتن)ە بۆیە بەکورتی هەندێك لایەنی پێوەندیدار بەم کارامەییە دەخەینە ڕوو.

**ئاخاوتن لە ڕووی چەمکەوە :**

ئاخاوتن گوزارشتکردنی مرۆڤە لە شتێك کە واتایەكی لە بیر و هۆشی ئاخێوەر و گوێگردا هەبێت، کە بریتییە لە واژە و واتا، واژەش لە ڕەمزە دەنگییەکان پێك دێت و مانایەكی زاراوەیی ناسراوی لەنێوان ئاخێوەر و وگوێگردا هەیە ( عطية /٢٠٠٨، لا ١١٤)

یان ئاخاوتن بریتییە لە تێکەڵاوی یان گیراوەی ئەم ڕەگەزانە: بیرکردنەوە وەك پرۆسەیەكی هزری و زمان وەك داڕێژەری بیر و ڕاکان لە دووتوێی وشەدا و دەنگ وەك هەڵگری بیر و ڕا و وشەکان بۆ خەڵك (عبدالهادي وآخرون، ٢٠٠٣، لا ٩٣) .

یان بریتییە لە کۆمەڵە کارامەییەكی ئاکاری کە ئاخێوەر لە دەوروبەری جیاجیادا ئەنجامی دەدات بۆ دیاریکردنی بیر و ڕاکانی بەشێوەیەكی ورد و داڕشتنی ئەو بیر و ڕایانە لەچوارچێوەیەكی وەرگێڕدراوی زمانیدا، پاشان گۆکردنی بەدەنگ بەشێوەیەكی دروست شان بەشانی جووڵاندنی لەش بەمەبەستی جێبەجێکردنی کارلێککردنێكی باش لەنێوان خۆی و گوێگرەکەیدا . ( هەمان سەرچاوە، لا ٢١٧).

**گرینگیی ئاخاوتن:**

گومانی تێدا نییە كە ئاخاوتن یەكێكە لە گرینگترین چالاكییەكانی زمان بۆ هەموو چین و توێژێكی كۆمەڵ بەشێوەیەكی سەرەكی لە پرۆسەی پێوەندیكردندا، لێرەدا هەوڵ دەدەین لە چەند خاڵێكدا گرینگیی ئاخاوتن لە ژیانی مرۆڤدا بخەینە ڕوو .

١- زۆر لەپێش ئەوەی نووسین دابێت، مرۆڤ شێوەی قسەكردنی زمانی زانیوە و تا ئێستاش زۆر زمان هەن، كە شێوەی نووسینیان نییە.

٢- منداڵی ساوا یەكەم جار فێری شێوەی قسەكردن دەبێت، ئینجا پاش ماوەیەك شێوەی نووسین.

٣- قسە یان گوتن دەورێكی بالاتر لە ژیانماندا دەبینێت، بەواتای ئەوەی كە ئێمەی مرۆڤ زۆرترین كاتمان بەقسەكردن دەڕوات وەك خوێندنەوە و نووسین (فتاح، ٢٠١١، لا ٢٢١).

٤- سروشتی بەكارهێنانی ئاخاوتن لە ژیانی ڕۆژانەدا ئاسانترە لە بەكارهێنانی نووسین.

٥- ئاخاوتن و كارامەییەكانی، یارمەتیدەرن بۆ تاك لەپێناو گونجانی كۆمەڵایەتی.

٦- ئاخاوتن، بوارێكی سروشتییە بۆ پیادەكردنی دەستوورەكانی زمان بەشێوەیەكی دروست.

٧- ئاخاوتن، توانست و متمانە بەخۆبوون دەبەخشێتە تاك بۆ ڕووبەڕووبوونەوە و گفتوگۆ و قایلكردنی بەرانبەر (عطیة، ٢٠٠٨، لا ١١٦).

٨- ئاخاوتن بزوێنەری هۆش و وەرگێڕی بیر و بۆچوون و پێكهاتەكانیەتی.

٩- ئاخاوتن یارمەتیدەرە بۆزانینی بیر و ڕا و ئاراستەی خەڵك و ئاوێنەی ئاستی ڕۆشنبیریی تاك و توانستە زمانییەكانیەتی (عبدالباري، ٢٠١١، لا ١٠٠) .

١٠- ئاخاوتن چالاكییەكی مرۆییی هەموو چین و توێژێكی كۆمەڵە، بوار بۆ تاك دەڕەخسێنێت لەپێناو مامەڵەكردن لەگەڵ ژیاندا.

١١- ئاخاوتن سەرچاوەی دەستەبەركردن و فێربوونی زمانە، چونكە زمان بە دابڕان لە كۆمەڵ دەستەبەر نابێت، بەڵكو بەگوێگرتن و كارلێككردن لەگەڵیدا

بۆیـە (یسپرسـن)ی زمانـەوان دەڵـێ: (زمـان لـەڕێگای دەم و گوێـوە تەماشـا دەکرێت نەك کەرەستەکانی نووسین)، (عبدالهادي وآخرون، ۲۰۰۳، لا ۱۷۲).

**کارامەیییەکانی ئاخاوتن :**

کارامەییی ئاخـاوتن لەلایـەن تاکـەکانی کۆمـەڵ بـەهۆی چـەند فاکتەرێکـەوە جیاوازییان تـێ دەکـەوێت، لەوانـە: ڕەگـەزی ئـاخێوەر، تەمـەن، ئاسـتی خوێنـدن .....هتد. لەم خاڵانەی خوارەوە، گرینگترین کارامەییی ئاخاوتن دەخەینە ڕوو:-

١- گۆکردنی پیتەکان لە سازگەکانیانەوە بەشـێوەیەکی ڕاسـت و دروسـت، تـاکو بەڕەوانی بگەنە گوێگر، بۆ وشە و ڕستە و دەستەواژەکانیش بەهەمان شێوە.

٢- ڕیزبەندیی دروست و دیاریکراو لە ئاخاوتندا، بەشێوەیەك یارمەتیـدەر بێـت بـۆ جێبەجێکردنی مەبەست و ئامانجی ئاخێوەر و گـوێگر، وەکـو: ڕوونکردنـەوەی بیرۆکـە و قـایلکردنی گـوێگر، واتـە ئەگـەر ئـاخێوەر کارامـە نـەبێت لـە پێشکەشکردنی بیر و بۆچوونەکانی بەشێوەیەکی ڕێکوپێك، ناتوانێ مەبەستی پەیامەکەی بپێکێ.

٣- ڕیزبەندییەکی مەنتیقی بۆ بیر و بۆچوونەکان، وێـڕای یـەکگرتوویی بابەتەکـە بەشـێوەی پلەبەنـدی بـۆ تێگەیانـدنی گـوێگران و دەرنەچـوون لـە بابـەتی سەرەکی بـۆ بابـەتی لاوەکـی، چـونکە گـوێگر لـە بابەتـە سـەرەکییەکە دوور دەخاتەوە. (عبدالهادي وآخرون، ۲۰۰۳، لا ١٧٥-١٧٦).

٤- ئاخـاوتن بـەدەنگێکی پێویسـت و خێرایـی و ئـاواز و ڕیتمێکـی گونجـاو بـۆ سروشتی بابەتەکە، لەگەڵ ڕەچاوکردنی ئاستی جەماوەری گوێگر .

٥- زیادەڕۆیی نەکردن لە گوزارشتکردن بۆ واتای پێویست.

٦- دوورکەوتنەوە لە دووبارەکردنەوەی بێزارکەر لە کاتی ئاخاوتندا.

٧- بێ دەنگ بوون و وەستان هەندێك جار بەمەبەستی بیرکردنەوە (هەنـدێ بـیر و بۆچوون یان هەندێ لایەنی بابەتەکە).

٨- بەکارهێنانی زمانی جەستە بەشێوەیەك، کە تەواوکـەری ئاخاوتنەکـە بێـت بـۆ تێگەیاندنی بەرانبەر.

٩- بەکارهێنانی ڕێزمانی زمانەکە بەشێوەیەکی ڕاست و دروست .( عبدالباري، ٢٠١١،  لا ٢٣٨-٢٣٩).

**جۆرەکانی ئاخاوتن :**

بەشێوەیەکی گشتی  ئاخاوتن بۆ دوو جۆر دابەش دەبێت :

١-  ئاخاوتنی ئەرکی

٢-  ئاخاوتنی داهێنراو

١- ئاخاوتنی ئەرکی: ئەو شێوەیەی ئاخاوتنە، کە ئەرکی ڕۆژانەی  تاك لەپرۆسەی پێوەندیکردندا جێبەجێ دەکات، بەمەبەستی ڕێکخستنی کاری ڕۆژانە و دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی ژیان، وەکو: گفتوگۆ و کۆبوونەوەکان، کڕین و فرۆشتن، سیمینار و کۆنفراس، پێشکەشکردنی هەواڵ و زانیاری و سەرنج ......هتد.

٢- ئاخاوتنی داهێنراو: ئەو شێوەیەی گوزارشتکردنە، کە ئاخێوەر  زۆر بەوردی هەست و سۆزی خۆی بەپەیڤ و دەستەواژەی هەڵبژێردراو دەردەبڕێ، بەمەبەستی دروستکردنی کاریگەرییەکی گەورە لە دەروونی  گوێگردا، بۆیە ئەو کەرەستە و پێکهاتە زمانییانەی کە بۆ ئەم مەبەستە  بەکاردێن دەبێ شیرین و نەرمونیان بن و هەموو ڕەگەزەکانی جوانی لە خۆ بگرن و لە ڕووی داڕشتنەوەش پتەو و ڕێزمانبەند بن.

کاریگەری  دروستکردن بەسەر گوێگردا پێویستە، بۆ ئاڕاستەیەکی دیاریکراو.

جێگای ئاماژە پێکردنە، کە ئەم دوو جۆرەی ئاخاوتن بەشێوەیەکی بنبڕ لەیەکتری جیا نابنەوە، بەڵکو لە هەندێ باردا بەیەك دەگەن و گوزارشتی داهێنراو دەبێتە بەشێك لە گوزارشتی  ئەرکی. (عبدالباري، ٢٠٠٣، لا١٧٨).

# تەوەری دووەم

# ڕاگەیاندن

**چەمك و پێناسەی ڕاگەیاندن :**

لێرەدا گرینگە زۆر بەکورتی ڕوونکردنەوەیەك دەربارەی ڕاگەیاندن بخەینە ڕوو، چونکە لایەنێکی توێژینەوەکە پێوەندی بەجۆرێك لە جۆرەکانی ڕاگەیاندنەوە هەیە، ئەویش ئەو جۆرەی ڕاگەیاندنە کە دەنگ و ئاخاوتنی تێدا بەکاردێت، کە خۆی لەڕاگەیاندنی (بیستراو)دا دەبینێتەوە.

ئەمڕۆ ڕاگەیاندن لەسەر ئاستی جیهاندا، گرینگییەکی زۆری پێ دەدرێت، ئەمەش لەئەنجامی بەرەوپێش چوونی هۆکارەکانی و جۆراوجۆربوونی شێوازەکانییەتی.

ڕاگەیاندن بەفەلسەفە فراوانەکەی و هۆکارە پێشکەوتووەکانییەوە بە بەهێزترین هۆکاری پەیوەندیکردنی هاوچەرخ لەقەڵەم دەدرێت و ڕۆڵێکی گەورە لە بەدەستهێنانی شارستانییەت و ڕۆشنبیریدا دەگێڕێ، ڕاگەیاندن ئەو دەسەڵاتەیە، کە ڕۆژ بەڕۆژ باڵادەستی زیاتر دەبێت و خۆی دەگەیەنێتە هەموو لایەکی ئەم جیهانە فراوانە و ئامرازێکی سەرەکیی بەدیهێنانی سیستەمی بەجیهانیکردنە.

ژمارەیەکی زۆر لە شارەزایانی ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەنووسی لەژێر تیشکی ئەو ئەرکانەی کە ڕاگەیاندن جێبەجێیان دەکات، هەوڵی دیاریکردنی چەمك و پێناسەی ڕاگەیاندنیان داوە، ئەم دیاریکردنە بەگوێرەی ئەو ئایدۆلۆژیایەی بیرۆکەکەی لێ هەڵقوڵاوە، بۆچوونی جیاجیای لێ کەوتۆتەوە، لەوانە:

- ڕاگەیاندن بریتییە لە پێشکەشکردنی هەواڵی ڕاست و زانیاریی دروست و ڕاستی نەگۆڕ بەخەڵك، کە یارمەتییان دەدات بۆ پێکهێنانی بیر و ڕایەکی ڕاست و تەواو دەربارەی ڕووداوێك لە ڕووداوەکان یان گرفتێك لە گرفتەکان، بەشێوەیەك کە ئەو بیر و ڕایە گوزارشتێکی بابەتی بێت لەبیرکردنەوە و ئاکاری جەماوەر (حمزة، ١٩٦٨، ل٧٥) .

• ڕاگەیاندن گوزارشتێکی بابەتییانەی هۆش و ڕۆح و ئارەزووی جەماوەرە (امام ۱۹۸۳، لا۱۲).

• ڕاگەیاندن هۆکارێکی رامیاری و هێزێکی ئابووری و سەرچاوەیەکی پەروەردەیی شاراوە و بزوێنەرێکی کارای ڕۆشنبیرییە (رایەن ژ۱، لا٤٤) کەواتە ڕاگەیاندن جگە لەوەی کە خۆی وەك دەسەڵاتی چوارەم لەپاش سێ دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکاری و دادوەری (تشریع وتنفیذ وقضاء) کاریگەری و قەوارەی گەورە لە کۆمەڵگاکاندا دیاری دەکات، زۆرجار دەچێتە بونیادی لایەنەکانی ترەوە و بە ئەرێنی یان نەرێنی کاریان تێ دەکات.

زیاتر لەمانە ڕاگەیاندنی هاوچەرخ بە تەکنەلۆژیا و پێشکەوتنی تازەوە هاتۆتە مەیدان و توانیویەتی بەئاسانی سنوور و شووره پۆڵاییەکان ببڕێت و دوورییەکان کورت بکاتەوە و زۆر لە ڕووداوە ناوچەیی و ناوخۆییەکان بکاتە ڕووداوی جیهانی و دەیەوێت سیستەمێکی مەعریفی چوون یەك بەسەر جیهاندا باڵ پێ بکێشێ.

**بەشێوەیەکی گشتی ڕاگەیاندن سێ جۆری سەرەکی هەیە:**

١- نووسراو (خوێندراو).

٢- بیستراو.

٣- بیستراو و بینراو.

## کارامەیی شێوازی ئاخاوتنی بێژەرانی ڕاگەیاندنکار:

لەو جۆرانەی ڕاگەیاندن، ئەوەی ئێمە مەبەستمانە، ئەو جۆرەیە کە لە ڕێگای ئاخاوتنەوە پەیامەکانی ئاڕاستەی جەماوەر دەکرێت، جەماوەریش بەهۆی بیستنەوە وەری دەگرن، کە لە جۆری دووەم و سێیەمدا بەرجەستە دەبن، بابەتی ڕاگەیاندراویش لەڕێگای ئاخاوتنەوە، پێوەندی بە بێژەری بەرنامە جیاجیاکانی (ڕادیۆ و تەلەفیزۆن ....هتد)یەوە هەیە، کە هەواڵ و گفتوگۆ و.....هتد دەگرێتەوە.

بۆیە لێرەدا کارامەیی و شێوازی دەربڕین و ئاخاوتن بۆکەسانی کارمەند لەم بوارانەدا پێویستە. بۆ ئەم مەبەستەش چەند ڕێنمایی و ڕاسپاردەیەکی زمانیی بۆ بێژەران دەخەینە ڕوو بەمەبەستی شارەزابوونیان و باشترکردنی شێوازی تەکنیکیی ئاخاوتنیان لە بواری ڕاگەیاندنی بیستراودا.

(www.rfi.fr/talentplusar/articles/073/article-172.asp. برنار شونیو)

١- دەربڕین و گوزارشتکردن (نطق)ی چاك .
٢- کۆنترۆڵکردنی خێرایی ئاخاوتن.
٣- دۆزینەوەی هێز (نبرە)یەکی دەنگیی ڕاست و دروست.
٤- شارەزابوون لە چۆنیەتی ئاخاوتن و بەردەوامبوون لە ئاخاوتندا.
٥- کۆنترۆڵکردنی دانیشتن، وەستان، هەناسە.

**١- دەربڕین و گوزارشتکردن ( نطق )ی چاك:**

یەکێك لە نیشانەکانی بێژەر یان قسەکەری سەرکەوتوو ئەوەیە، کە ڕواڵەتی لەکاتی قسەکردندا بکەوێتە بەرچاوی خەڵك و ڕەنگی تێك نەچێ و قسەی نەبزرکێ، چونکە ئەمانە نیشانەی دوودڵی و بێ باوەڕبوون بەخۆ( هێرش، ٢٠٠٧، لا ١١). زۆربەمان وا ڕاهاتووین، کە لەکاتی قسەکردندا بەتایبەتی ئەوکاتەی لەمێشکماندا بەدوای وشە یان دێڕێکی گونجاودا دەگەڕێین، دەنگی وەك: ئا.... ئم ...ئە... لەگەڵ قسەکانماندا لە قوڕگمان دێتە دەرەوە. زۆربەشمان لە سەرەتای هەر قسەیەکدا دێڕی پشتیوانە بەکاردێنین، وەك: بە برای خۆم بڵێم، هەروەها بێتەوە، عەرزی برای خۆم بکەم .........هتد، کە هیچ پێوەندییەکی بەبابەتی قسەکانمانەوە نییە. ئەنجامەکەی درێژکردنەوەی قسەکە و ماندووبوونی گوێگرە ئەو گومانەش دروست دەکات، کە بێژەر ئامادەیی قسەکردنی نییە و دەسەڵاتی بەسەر باسەکەدا ناشکێ و زیاتر کات بەفیڕۆ دەدات، بەتایبەت ئەگەر وا ڕاهاتبین، کە هەندێك باس بە وشەی چوون یەك یان جیاواز دووبارە بکەینەوە. ئینجا ئەگەر بێژەرەکەش بە شل و شێواوی قسە بکات و کۆتایی دێڕەکانیش بمرێنێت، ئەوە خراپتریش.(شەیدا ٢٠٠١، لا ٢٢) بۆ ئەوەی دەنگی پڕ لەناو زاراوە

بێتە دەر، دەبێت بەشی خوارەوەی چەناگە تەواو ئازاد و خاو بێت، هەر بۆیە بەر لە دەستپێکردن بۆ خوێندنەوەی نووسراوێك، دەبێ تاقی بکەنەوە کە ئایا چەنەو ژێر چەنە ئازاد و شلن، دادەکەونە خوارێ یان نا (هێرش، ۲۰۰۷، لا ۳۸-۳۹) هەروەها دەربڕینی وشەو ڕستە و بڕگەکان بەشێوازێکی ڕوون و ڕەوان و میوزیکانە و گونجاو بێت و توانای جەخت لەسەرکردنی هەندێ وشە یان ڕستە تەنانەت پیت لە هەندێ شوێندا دەیخوازێ و پێویستە، واتا توانای دەرخستن و زەقکردن و هەڵکشانی پەیژە موزیکییەکان و پیادا هاتنە خوارەوە، بەپێی پێداویستیی حاڵەت و واتا.

هەروەها توانای کەرتکردن و وەستانی لەئاستی واتا و ڕەوانبێژیدا، هەر چۆن دەقەکە دەیخوازێ و خولقاندنی تەبایی و گونجانی نێوان ئەوەی هەستی پێ دەکات و ئەوەی مەبەستێتی و ئەوەی دەیبێژێ ( سالار، ۲۰۰٦، لا ۱۱۸-۱۱۹) بۆیە گرینگە بێژەر ئاگاداری گرینگترین مەرج و تایبەتییەکانی هونەری دەربڕین بێت، کە لەم خاڵانەی خوارەوەدا دیارن (خلیل وآخرون، ۱۹۹۹، لا ۸٤).

١- ئاخاوتنێکی ڕوون و گوزارشتکردنێکی ڕاستگۆیانە.
٢- ڕوون و ڕەوانیی واژە و دوور لە خەوشی دەربڕین.
٣- ڕوونیی ئەو واتایەی ئاڕاستەی گوێگر دەکرێت، بەمەبەستی تێگەیاندنیان و جێبەجێکردنی ئامانجێکی دیاریکراو.
٤- ئاخاوتنێکی گونجاو و پابەند بە ڕێساکانی وەستان، بەمەبەستی وەرگرتنی بڕێکی گونجاو لە هەوا، واتە ڕێکخستنی کرداری هەناسەدان و هەناسە وەرگرتن.
٥- گونجاو بێت لەگەڵ شێوازەکانی (تجوید) و زمان.
٦- دوورکەوتنەوە لە دیاردەی یەك ئاوازەیی (الرتابە) واتە ئاخاوتنەکە بەیەك ئاست بێت، بەرز و نزمی و لەسەرخۆیی و خێرایی .....هتد تێدا نەبێت، کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا دەبێتە هۆی بێزاربوونی گوێگر.
٧- بێژەر لە چوارچێوەی قسەکانیدا کەسایەتیی خۆی پیشان بدات.
٨- دیاردەی ڕاهێنانی هونەریی تێدا بەدەرکەوێت.

### ٢- کۆنترۆڵکردنی خێرایی ئاخاوتن:

خێرایی ئاخاوتن یەکێکە لە خەوشەکانی قسەکردن و بریتییە لە تێکچوونی شێوازی ئاخاوتنی ئاسایی ئاخێوەر و قسەکردن بەخێرایی نائاسایی و پچڕانی دیار لە ڕەوانیی قسەکردندا گەلێك جار ناتەواویی زمانەوانی لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، وەك ناتەواویی پێکهاتە دەنگییەکانی زمان و ناتەواویی دەربڕینی دەنگ ...... هتد.

گرفتەکانی ئاخاوتن بەشێوەیەکی گشتی سێ بەشی سەرەکین: گرفتەکانی دەنگ، گرفتەکانی زمان، گرفتەکانی ئاخاوتن خۆی، کە خێرایی ئاخاوتن یەکێکە لەگرفتەکانی ئاخاوتن، ئەمەش لەبەر چەند هۆکارێك دروست دەبێت (www.sef.ps/fornm/mn44662. غدیر محمد الحارس)

١- هەبوونی چەند بیرۆکەیەك لە هزردا و ململانێی ئەو بیرۆکانە بۆ دەرکەوتنیان بەخێراییەکی زۆر.

٢- زاڵ نەبوون بەسەر ڕێکخستنی سیستەمی هەناسەدان و هەناسە وەرگرتن.

٣- شەرمنیی کەسی ئاخێوەر بۆ ڕزگاربوون بەزووترین کات لەوەی دەیەوێ بیڵێ.

٤- لە ئەنجامی ڕاهاتن بەو شێوازەی ئاخاوتن لە چوارچێوەی خێزاندا.

دەشێ بڕیار لەسەر کەسێك بدەین، کە گرفت لە دەربڕینیدا هەیە بەهۆی خێراییەکی زۆر لەکاتی ئاخاوتندا، ئەگەر هاتوو ئەم تایبەتییانەی خوارەوەی لەکاتی ئاخاوتندا لێ بەدی کرا:

١- هەبوونی پچڕانێکی ئاشکرا لە ڕەوانیی قسەکردندا، واتە وا دەردەکەوێ کە قسەکەر باوەڕی بەخۆی نییە لەوەی کە دەیڵێت و نازانی چۆنی دەڵێ.

٢- نا ڕوونییەکی زۆر لە قسەکانیدا، کە وەستان لەکاتی قسەکردندا و هەوڵدان و ڕێکخستنی قسەکانی و دووبارە ڕۆنان و وتنەوەی هەندێك لە بڕگە و وشە سادەکان دەگرێتەوە.

٣- هیچ گرفتێکی لە قسەکردندا نییە، وەکو ئەو کەسانەی کە زمانیان دەگیرێت.

٤- لە دەستپێکی ئاخاوتندا هەندێ دیاردەی لابەلای لێ بەدی دەکرێت، وەك، ترووکاندنی پێڵووی چاو و سەر وەشاندن ..... هتد. ئاخاوتنی خێراش لەلای ئەو کەسانەی کە شڵەژانی دەربڕینیان هەیە لەئەنجامی خێراییەکی زۆر لە قسەکردندا، ئەم تایبەتمەندییانەی خوارەوەی هەیە:

أ - زۆری ژمارەی ئەو بڕگە و وشانەی کە دەیڵێت، لە ڕادەی ئاساییدا، بەتایبەتی ئەگەر هاتوو ژمارەی ئەو بڕگە و وشانە لەماوەی خولەکێکدا کە دەیڵێت، بەراوردی بکەین لەگەڵ کەسێکی تر کە بەشێوەی ئاسایی قسە دەکات.

ب - وەستانەکان لەکاتی ئاخاوتندا یان کورتن یان درێژ، لە شوێنی نەگونجاویشن، واتە بۆ ماوەیەکی زۆر کەم دەوەستێت و بەشی ئەوە ناکات هەناسەیەك وەربگرێت، تاکو قسەکانی تەواو بکات، یان ماوەیەکی درێژی ناسروشتی وەردەگرێت پاشان دەست دەکات بەقسەکردن. هەروەها وەستان لە شوێنێکی نەگونجاو، بۆنموونە: وەستان لە کاتی پرسیارکردن لەپێش کۆتایی هێنان بەڕستەی پرسیارەکە، ترس و خواست و ویست بۆ گوتنی هەموو شتێك بەخێراترین کات، وا دەکات کە ڕیتمی خێرا لەکاتی ئاخاوتندا، بەتایبەتی ڕاگەیاندنکار بەرانبەر مایکرۆفۆن بەکاری بهێنێت، بۆیە گرینگە ڕاگەیاندنکار (بێژەر) خێرایی ئاخاوتنی بەشێوەیەك نەبێت، کە پشێوی و شێواندن دروست بکات، بەشێوەیەکیش خاو نەبێت کە بێزاری دروست بکات .

### ٣ - دۆزینەوەی هێز (نبرە)یەکی دەنگیی ڕاست و دروست:

لەکاتی ئاخاوتندا هەندێ بڕگەی وشە درێژتر و بەهێزتر گۆ دەکرێن، مەبەست لەو هێزەیە کە دەکەوێتە سەر بڕگەیەك لە بڕگەکانی وشە، واتە ئەو وشەیەی کە بریتییە لەدوو یان زیاتر لە دوو بڕگە، بڕگەیەکیان هێزی دەکەوێتە سەر و بەگۆڕینی ئەو هێزە لەو بڕگەیەوە بۆ بڕگەیەکی تری ئەو وشەیە، دەبێتە هۆی گۆڕینی واتای ئەو وشەیە، یان دەبێتە هۆی گۆڕینی ئەو وشەیە لەڕووی ڕێزمانەوە (وەیس، ١٩٨٤، ل٨٤). بەڵام واش ڕوو دەدات، کە گواستنەوەی هێز کار ناکاتە سەر گۆڕینی مانا. (حاجی مارف، ١٩٧٦، ل ٧٢).

بەم جۆرە گرینگیی بڕگە لە زماندا بەدی دەکرێ، ئەمە لە لایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە شکڵ و ناوەڕۆکی وشە لە زۆر شوێندا بەستراوە بە سترێسەوە، چونکە ئەگەر وشەیەك بەپێچەوانە بدرکێنرێ لەڕووی هێزەوە، ئەوا دەبێتە هۆی ونکردنی تایبەتییەکانی ئەو وشەیە. (وەیس، ١٩٨٤، لا٨٤) لەبواری ڕاگەیاندندا هەر دەق و بابەتێك بۆ مەبەست و مەرامێکی تایبەت نووسراوە و دەخوێندرێتەوە، ئەو مەبەست و مەرامەش دەبێت گوێگر لە زمانی ڕاگەیاندنکار یان بێژەر ببیستێت و تێی بگات. گوێگر دەبێت ئەوەی کە بێژەر مەبەستییەتی تێی بگات، نەك ئەوەی بەلێکدانەوەی ئەقڵی خۆی بۆی دەچێت، بۆیە پێویستە ئەو وشە و بڕگانەی کە مەبەستن یان گەیەنەری مەبەستەکەن، لەخوێندنەوەی بێژەردا دانیان پیابنرێت و بەرجەستە بکرێن. بۆیە یەکێك لەو دیاردە زمانییانەی کەلە دەربڕینی بڕگە و وشەدا دەردەکەوێت و ڕۆڵی گرینگی لەو بوارەدا هەیە، هەروەك ئاماژەمان پێ کرد (هێزە)، ئەگەرچی مرۆڤ هەر لە منداڵییەوە فێری چۆنیەتی بەکارهێنانی هێز دەبێ و دەبێتە بەشێك لەو دەستوورانە لەگەڵ فێربوونی زماندا فێریان دەبێت، بەڵام گرینگە کە ڕاگەیاندنکار (بێژەر) زۆر ئاگاداری شوێنی هێزی سەر بڕگە و وشەکان بێت، بەتایبەتی لەکاتی خوێندنەوەی هەر بابەتێکی ڕاگەیەنراودا، بەزانین و ناسینی بڕگەکانی وشە، ئاگاداری سنووری دەرکەوتنی هێز (سترێس) دەبێت، چونکە سنووری شوێن و سنووری هێز لەسەر بڕگەکانی وشە لە نووسیندا دەرناکەوێت بەڵکو لە مێشکی مرۆڤدایە.

**٤ – شارەزابوون لە چۆنیەتی ئاخاوتن و بەردەوامبوون لە ئاخاوتندا:**

ئاخاوتن دووەم کارامەیی زمانە لەدوای بیستن، کە مرۆڤ وەری دەگرێت و فێری دەبێت و چاکترین دیاردەی جێبەجێکردنی پەیوەندیکردنە لە نێوان هاوزماناندا. بۆیە ئاخاوتن دیاردەیەکی ڕاستەقینەی زمانە، کە ئەگەر زمان ئەو دەنگانە بن و هەر نەتەوەیەك گوزارشت لە پێداویستییەکانیانی پێ بکەن، ئەوە ئاخاوتن چوارچێوەیەکی گشتییە بۆ ئەم دەنگانە، کە لێیانەوە وشە و ڕستەی واتادار بەرهەم دێت.(عبدالباري، ٢٠١١، لا ٨٩).

شـارەزابوون لـە چـۆنیەتی ئاخـاوتن و هونـەری ئاخـاوتن بـۆ ڕاگەیانـدنکار بەتایبەتی بێژەر، یەکێکە لە پێویستییە گرینگەکان، کە ئەمەش بە ئاشنابوون لـە کارامەیییـەکانی ئاخـاوتن دەسـتەبەر دەبێـت، ئـەو کارامەییانـەش لـە تـەوەری یەکەمدا ئاماژەمان پێ کردوون، سەرەڕای ئەمانـەش هەنـدێك فاکتـەر هـەن دەبنـە مایەی بە هێزکردنی توانای مرۆڤ لە ئاخاوتندا و بەردەوامبوون لە ئاخاوتن وەکو:

١- ڕۆشـنبیریی گشـتی: زەمینـە خۆشـکەر دەبێـت بـۆ فراوانکردنـی ئاسـۆی ڕۆشنبیریی ڕاگەیاندنکار (بێژەر) لە بوارە جیاجیاکاندا، کە ئەمـەش لـەڕێگای خوێندنەوە و بەدواداچوونی بەردەوام بۆ بابەتی جۆراوجۆری ڕۆشنبیری بـەدی دێت.

٢- بەشـداربوون لـە کـۆڕ و سـیمینارە جۆراوجۆرەکـان، بەمەبەسـتی گـوێگرتن و پاشان ئاخاوتن دەربارەی ئەو بابەتانەی لەم بوارەدا ڕۆڵیان هەیە، بـەئامانجی بەهێزبوونی شێوازی ئاخاوتنی ڕاگەیاندنکار.

٣- ئاشنابوون بـە هـەموو لایەنـەکانی ئـەو زمانـەی قسـەی پێدەکات بەتایبـەتی لایەنی دەنگسازی و ڕێزمان و واتاسازی، بەهەموو وردەکارییانەوە.

**٥ - کۆنترۆڵکردنی (دانیشتن، وەستان، هەناسەدان )**

دانیشتن و وەستان و هەناسەدان، سـێ لایـەنی زۆر گـرینگن کـە پێوەنـدییان بەباری جەستەیییەوە هەیە و ڕۆڵی گرینگیان لە بواری ئاخاوتندا هەیە. بەشێك لـە ڕاگەیەندکاران کاتێك ڕووبەڕووی جەماوەرێکی زۆر یان کۆنگرەیەکی ڕۆژنامـەوانی، یان ئەنجامدانی گفتوگۆی ئیزگەیی ..... هتد بۆ قسەکردن دەبنەوە، گرفت لەگەڵ جەستەی خۆیاندا پەیدا دەکەن و نازانن چۆن لەگەڵ جەسـتەی خۆیانـدا، لـەکاتی قسەکاندا هەڵسـوکەوت بکـەن، لـە ئەنجامـدا دووچـاری شـڵەژان و شـێوان دەبـن و پەیامەکەیان وەك پێویست ناگاتە گوێی وەرگر. بـۆ زاڵبـوون بەسـەر ئـەم کێشـانە گرینگە لەکاتی وەستاندا قورسایی لەش بەشێوەیەکی هاوسـەنگ بەسـەر هـەردوو لاقدا دابەش بێت و لاقەکان هێندە لەیەك دوور نەبن، کە بەلای تەنیشـتدا نەکـەون و لەکاتی پێویسـتدا بتـوانن قورسـایی جەسـتە بـۆلای ڕاسـت و چـەپ بگوێزنـەوە،

هەروەها قۆڵ و باسکیش، ئازاد و خاوبن، نەبادا توند و گرژی ڕێگری ڕەوانی ئاخاوتن بن.

دەربارەی هەناسەش، هەروەك لەمەوپێش ئاماژەمان پێ کرد، کە پرۆسەی هەناسە بەدوو سیستەمدا تێ دەپەڕێ، سیستەمی هەناسە وەرگرتن و هەناسەدانەوە. پرۆسەی ئاخاوتن لەڕێگای هەناسەدانەوە جێبەجێ دەبێت، بەڵام هەناسە وەرگرتنیش ڕۆڵی خۆی هەیە بۆ ئاخاوتن، بۆیە گرینگە ڕاگەیاندنکار هێندە بەسەر ئەم پرۆسەیەدا زاڵ بێت، کە بتوانێت زۆرترین سوودی لێ وەربگیرێت بۆ قسەکردن و ئامادەی خوێندنەوەی هەر جۆرە نووسینێك بێت، بە تایبەتی هەندێك پەرەگراف سەرەڕای درێژییان، وشەی درێژ و قورسیشیان تیایە. گرینگیشە لەکاتی خوێندنەوەی هەر بابەتێك بۆ ڕادیۆ یان تەلەفیزۆن دەنگی هەناسەش نەبێت.

بەداخەوە زۆر کەس هەست بەگرینگیی هەناسەدان و وەرگرتن ناکەن لە خۆشکردن و جوانکردنی دەنگ و پێدانی ئاوازێکی جوان، چونکە هەندێ جار هەناسەدان و وەرگرتنی بە هەڵە کاریگەریی پێچەوانەی لەسەر جوانیی دەنگ دەبێت، بەڵام هەناسەدان و ڕاگرتنی دروست شڵەژان لە قوڕگدا ناهێڵێ، پاڵ بە ماسوولکەکانی زگ و ناوپەنچکدا دەنێ بۆ بەخشینی توانایەکی بەهێز بەمەبەستی وەرگرتنی دەنگ بەشێوەیەکی ئاسان (www.addustour.com/16123/. زین غنما، تهاني حلمي).

ڕێگای دروست بۆ کرداری هەناسەدان و وەرگرتن لەکاتی ئاخاوتندا، کرداری هەناسەی زگە، ئەم شێوەیەی هەناسەدان و وەرگرتنە هەر لەگەڵ لەدایکبوونماندا دەست پێ دەکات، بەڵام لەگەڵ زیاتر پێویستیمان بۆ خێرا قسەکردن، بەرە بەرە وازی لێ دەهێنین و هەناسەدان و وەرگرتنی سنگ ئاسانتر دەبێت. ئەمەش وادەکات ئەندامە دەنگییەکان وەك پێویست هەوایان بۆ دەستەبەر نەبێت و بەئاسانی جووڵە نەکەن بۆ ناردنی دەنگ، بۆیە هەوڵێکی زیاتر دەدات بۆ ناردنی دەنگ بەشێوەیەکی دروست، ئەمەشیان دەنگ ڕووبەڕووی گۆڕان دەکات و ئەندامە دەنگییەکانیش دووچاری پێکانی جۆراوجۆر دەبن وەکو: دروستبوونی

زیدەگۆشتی بچووك بچووك و شتی تر لەسەریان، هەروەها پێویستە ئەوەش بزانین كە لە پرۆسەی دەنگ ناردندا گەلێك فاكتەری تر بەشدار دەبن، هەر هێزی هەناسە تەنها فاكتەر نییە بۆ دەنگ، بەڵكو تەڕوتۆڵی و تەندروستیی قوڕگ و كاریگەریی زۆر خواردن بەسەر هەناسە....هتد فاكتەری كاریگەرن لەم بوارەدا. (ejubat.google.com/ejubat/thread) دۆخ و شوێنی دانیشتن كاریگەرییان بەسەر هەناسە و ناردنی دەنگەوە هەیە، چونكە باری چەمانەوەی ئەندامانی ئاخاوتن و ناڕێكیی شوێنی دانیشتن فاكتەرن بۆ ڕێكی و ناڕێكیی ئاخاوتن.

## ئەنجام

لەم لێکۆڵینەوەیەدا، گەیشتووینەتە ئەم ئەنجامەی خوارەوە:

گرینگیی زمان و کارامەییەکانی ئەو زمانە بۆ ڕاگەیاندنکار کە کاری ڕاگەیاندنی پێ ئەنجام دەدات و ئاگاداربوون لە هەموو وردەکارییەکانی ئەو زمانە لە ڕووی دەنگسازی و ڕێزمان و واتا و .........هتد، کارێکی پێویستە، چونکە کارامەبوون لەم بوارەدا بە ئاسانی دەستەبەر نابێت، بەڵکو ماندووبوون و مەشق و ڕاهێنان و بەدواداچوونی پێویستە.

ئاخاوتن، کە یەکێکە لە کارامەییە گرینگەکانی زمان پێوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ یەکێك لە جۆرەکانی ڕاگەیاندندا هەیە، کە ئەویش ڕاگەیاندنی (بیستراو)ە، کارامەبوونی ڕاگەیاندنکار لەم بوارەدا ئەرکێکی پێویستی سەرشانیەتی، بۆیە لەم پێناوەدا پێویستە ڕاگەیاندنکار ئاگاداری هەموو ئەو ڕاسپاردە و ڕێنماییانەی کەسانی پسپۆڕ بێت کە لەم لایەنەوە خراونەتە ڕوو. ئەگەرچی ئەم لێکۆڵینەوەیە تەنها لێکۆڵینەوەیەکی وەسفییە و نەچووینەتە بواری پراکتیك و مەیدانییەوە، تاکو بە داتا زۆربەی ئەو هەڵانەی لە بواری ئاخاوتندا لەم جۆرەی ڕاگەیاندن کە لەلایەن ڕاگەیاندنکارانی کوردەوە دەکرێن بخرابانە ڕوو، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی بەهۆی ئاگادار نەبوونی هەندێ لە ڕاگەیاندنکارانی کورد لە ئەم جۆرەی ڕاگەیاندن و لەو ڕێنماییانە، چونکە بەشێکیان بە شێوەیەکی خۆڕسك هاتوونەتە ناو ئەم بوارە یان بەهۆیەك لە هۆیەکان بۆ ئەم کارە (بێژەری، پێشکەشکاری بەرنامە......هتد) هەڵبژێردراون، گوێمان لە دەیان هەڵەی ئاخاوتن و شێوازی ئاخاوتن دەبێت و لە ئەنجامدا پەیامی ڕاگەیەندراو بەشێوەی پێویست ناگاتە گوێی وەرگر و کاریگەریی خۆی نابێت.

## سەرچاوەکان

**سەرچاوەکان بەزمانی کوردی:**


١- حاجی مارف، ئەوڕەحمان، زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٦.
١- سالار، ئەحمەد، دەنگسازی، هەولێر، ٢٠٠٠.
٢- سالار ئەحمەد، زانستی دەنگ و ئاخاوتن، کۆمەڵگای چاپەمەنی شەهاب، هەولێر، ٢٠٠٦ .
٣- شەیدا، حەسەن، هونەری بێژەری لە ڕادیۆ و تەلەفیزیۆندا. وەرگێرانی باسط حمەغەریب، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢ .
٤- فەتاح، محەمەد مەعرووف، زمانەوانی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر ٢٠١١ .
٥- هیرتش گوندۆلا، تەکنیك و هونەری ئاخاوتن، وەرگێڕانی برایم فەرشی، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧ .
٦- وەیس، غازی فاتح، فۆنەتیك، چاپخانەی ئەدیب، بەغدا ١٩٨٤ .
٧- گۆڤاری ڕایەن، ساڵی یەکەم، ژ ١، سلێمانی.


**سەرچاوەکان بەزمانی عەرەبی:**


١- امام، ابراهيم، ألاعلام وألاتصال بالجماهير، مكتبة ألانجلو، مصر ١٩٨٤ .
٢- حمزة، عبداللطيف، ألاعلام والدعاية،، مطبعة المعارف ، بغداد ١٩٦٨ .
٣- عبد الهادي، نبيل وآخرون، مهارات في اللغة والتفكير، دار المسيرة للنشر والتوزيع والطباعة، الاردن، ٢٠٠٣ .
٤- عبد الباري، ماهر شعبان، مهارات التحدث، العملية وألاداء، دار المسيرة للنشر والتوزيع والطباعة، الاردن، ٢٠١١ .
٥- عطية، محسن علي، مهارات الاتصال اللغوي وتعليمها، دار المناهج للنشر والتوزيع، ألاردن، ٢٠٠٨ .
٦- خليل، محمود وآخرون، أنتاج اللغة ألاعلامية في النصوص ألاعلامية، مركز جامعة القاهرة للتعليم المفتوح، القاهرة، ١٩٩٩.


**ئینتەرنێت:**


١- www.addustour.com/16123/
٢- ejubat.google.com/ejubat/threa
٣- www.rfi.fr/talentplusar/articles/073/article-172.asp.(برنار شونيو)

## ملخص البحث

المهارة في أي عمل من الأمور اللازمة للوصول الى الأبدا واللغة كظاهرة بشرية ووسيلة مهمة لاتصال الانسان ببيئته، التي تتكون من مهارات أربع (الاستماع، الكلام، الكتابة، القراءة) وكل واحدة منهما تلعب اليوم دوراً أساسياً في عملية الاتصال وخاصةً الاعلام كنوع من هذا الاتصال، واللغة بجميع مهاراتها تعد الركيزة الأساسية لهذا النوع من الأتصال– الاعلام –. ان خبرة الاعلامي وتخصصه في اللغة ومهاراتها عامل أساسي لأعماله ونشاطاته في هذا المجال.

يتناول هذا البحث التحدث عن احدى هذه المهارات وهذه المهارة هي مهارة (الكلام) وعلاقتها بالاعلامي، وهذا النوع من الاعلام، الذي يلعب هذه المهارة دوراً رئيسياً فيها، وتم توضيح مدى أهمية الاعلامي لكل التوصيات والتعليمات التي تتعلق بهذا المجال أي – الكلام – .

يتكون البحث من محورين : المحور الأول يتضمن العناوين التالية : (تعريف ومفهوم المهارة، اللغة والمهارات اللغوية والكلام من حيث المفهوم وأهمية الكلام والمهارات اللغوية وأنواع الكلام). يتضمن المحور الثاني (الاعلام ومهارة أسلوب التكلم عند الاعلامي  وبعض التوصيات اللغوية حول أسلوب وتقنية التكلم في مجال الاعلام المسموع، والذي يتكون من النطق والتعبير الجيد والسيطرة على سرعة التكلم وتحديد مكان النبرة بصورة صحيحة وايجاد الخبرة عن كيفية التكلم والاستمرار فيه والسيطرة على وضع الجلوس والقيام والتنفس أثناء التكلم).

ويختتم البحث بعرض النتائج التي توصل اليها الباحث مع قائمة من المصادر باللغة الكوردية والعربية، ومن ثم ملخص البحث باللغتين العربية والانجليزية.

## Abstract

In any profession, skills are needed to reach the level of creation. Language as a human phenomenon and as an important means of communication consists of four skills: listening, speaking, writing and reading. Each of these skills has important roles in communication. Media is a type of communication that depends on language skills. Journalists need to know about these skills in order to perform their tasks and activities successfully.

In general, this study deals with the speaking skills of journalists, since this skill has an important role in the work of journalists. They need to be familiar with this skill and all the rules of speaking.

The study is divvied into two parts. The first part tackles the concept and the definitions of skills, language skills, the concept of speaking, the importance of speaking, and types of speaking. The second part tackles the concept of media, journalists' speaking skills, the style and techniques of speaking in audio media. The techniques include good pronunciation, intonation and stress, ability in continuous speaking, the way of seating, standing, and breathing.

At the end of the study a list of Kurdish and Arabic references is provided.

# کۆمەڵەی مارکسیی – لینینیی کوردستان
## ١٩٧٠ – ١٩٧٤

**پ.د. خەلیل عەلی موراد**
کۆلێژی ئەدەبیات/ بەشی مێژوو
زانکۆی سەلاحەددین

**م. ئەحمەد حەمەدئەمین ئۆمەر**
کۆلێژی پەروەردەی بنیات
زانکۆی سەلاحەددین

### پێشەکی

کۆمەڵەی مارکسیی– لینینیی کوردستان وەك ڕێکخراوێکی سیاسی لە ژێر کاریگەریی ئایدیۆلۆژیای مارکسیزم– لینینزم و فکری ماو تسی تۆنگ لە باشووری کوردستاندا لە ١٠ی حوزەیرانی ١٩٧٠ هاتۆتە دامەزراندن. سەرەتاش لەبەر هەلومەرجی ئەو سەردەمی عێراق بە گشتیو باشووری کوردستان بە تایبەتی بە شێوەیەکی نهێنی کار و چالاکییەکانی ئەنجامداوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تا دەستپێکردنەوەی شەڕی چەکداری لە نێوان سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلوول و ڕژێمی بەعس لە ١١ی مارتی ١٩٧٤دا، توانیویەتی ژمارەیەکی بەرچاو لە کەسانی کاریگەر بە فکری چەپ لە دەوری خۆیدا کۆبکاتەوە و گەشە بە ڕێکخستنەکانی بدات.

شایەنی باسە، هەر چەندە توێژینەوە لە وەها قۆناغێکی مێژوویی ڕێکخراوێکی وەك کۆمەڵە گرنگ و پێویستە، بەڵام گەیشتن بە ڕاستییە مێژووییەکان ئاسان نین، لەبەر ئەوەی زانیارییەکان هەموو بەردەست نین و فەوتاون. بۆیە دەبێت بە ناچاری پەنا بۆ دیمانەی ئەو کەسایەتییانە بەرین کە ڕۆڵیان لە دامەزراندن و ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەدا بینیوە، کە ئەمەش دیسانەوە ئاسان نییە، چونکە بەشێکیان لە ژیاندا نەماون، یاخود ماون، بەڵام بە تەمەندا چوون و یادەوەرییان یارمەتییان نادات بۆ دروست گێڕانەوە و بەستنەوەی بابەتەکان بە یەکتری. بەمەش لە هەردوو حاڵەتەکەدا پێویست دەکات توێژەر

پشوو درێژ و ماندوونەناس بێت بۆ ئەوەی توێژینەوەکەی بە ئەنجامێك بگات. بۆیە سەرباری ئەو ئاستەنگانەی ئاماژەیان بۆ کرا هەوڵدراوە بە پشت بەستن بە میتۆدی توێژینەوە مێژووییە زانستییەکان لەسەر بنچینەی شیکردنەوە و هەڵێنجان و بە تێڕامان و وردبوونەوە لە سەرچاوەکان، توێژینەوەکە بگاتە ئەنجامێك.

توێژینەوەکە لە دوو تەوەر پێکهاتووە، لە تەوەری یەکەمدا باس لە زەمینەی ئەو بارودۆخە کراوە کە کۆمەڵەی تێدا دامەزراوە، بەمەش سەرەتای هەنگاوەکان و ڕۆڵی کەسایەتییەکان شەنوکەو کراوە.

لە تەوەری دووەمدا، تیشك خراوەتە سەر کار و چالاکییەکانی کۆمەڵە لە دوای دامەزراندنییەوە، لەگەڵیدا باس لەو کێشە و گرفتانەش کراوە کە لەو قۆناغەدا ڕووبەڕووی ڕێکخراوەکە بووەتەوە.

ئەم توێژینەوەیە لەبەر ئەوەی هەوڵێکی جیدی و سەرەتاییە سەبارەت بە بابەتەکە، بۆیە لافی کامڵبوون لێ نادات و لە کەموکوڕی بە دەر نییە، ڕەخنە و سەرنج لە خۆی دەگرێت. هیوادارین خزمەتێکی بچووکمان لەم بارەوە پێشکەش کردبێت.

## تەوەری یەکەم: زەمینەی ئەو بارودۆخەی کۆمەڵەی تێدا دامەزرا

دامەزراندنی ڕێکخراوێکی سیاسیی هەڵگری بیری چەپگەرایی، زادەی ئەو بارودۆخ و پێشهاتە سیاسییە بوو کە لە ناوچەکە بە گشتی و باشووری کوردستان بە تایبەتی هاتبووە پێشەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئایدیۆلۆژیای چەپ و چەپگەرایی ڕەواجێکی زیاتری پەیدا کردبوو.

هەڵبەت ئەوە بە ڕوونی بەدی دەکرێت کاتێك دەبینین بارودۆخی ناوخۆی ئەو دەمەی باشووری کوردستان جۆرێك لە بێ ئومێدی لە لای کەسایەتییە سیاسی و ڕۆشنبیرەکان لەو پێکهاتە پارتایەتییە دروست کردبوو، چونکە لە گۆڕەپانی سیاسیدا پارتی دیموکراتی کوردستان هەبوو، کە پێکهاتبوو لە باڵی مەکتەبی سیاسی و باڵی بارزانی، لەگەڵ پارتی کۆمۆنیستی عێراق، کە ئەمانیش دابەش

ببوون بۆ سەرکردایەتی ناوەندی (القیادة المرکزیة) و لیژنەی ناوەندی (اللجنة المرکزیة)[1]. لێرەشدا بارودۆخە سیاسییەکە زیاتر مەسەلەکەی بەرەو بێ ئومێدی بردبوو، چونکە پارتی بە هەردوو باڵەکەوە ماوەیەك بوو کەوتبوونە شەڕ و ململانێی چەکداری لە دژی یەکتر و، کۆمۆنیستەکانیش لە شەڕی ڕێکخراوەیی و سیاسیی یەکتردا بوون. ئەنجام ناوچەکانی باشووری کوردستانی تووشی جۆرێك لە پاشاگەردانیی سیاسی و ئایدیۆلۆژی کردبوو، ئیتر ئەم بارودۆخە لە دواجاردا سەری بۆ ئەوە کێشا ژمارەیەکی بەرچاو لە لاوانی پێشکەوتنخواز و سیاسییە خاوەن ئەزموونەکان و نیشتمانپەروەرەکان و خوێندکارانی کورد لە بەغدا، بکەونە ژێر کاریگەریی خەباتی شۆڕشگێڕیی ناودارانی ئەو سەردەمە، وەکو: ئەرنستۆ تشی گیڤارا (١٩٢٨– ١٩٦٧)، ماو تسی تۆنگ (١٨٩٣–١٩٧٦)، شۆڕشەکانی دیکەی دونیا و هەوڵی لاساییکردنەوەیان بدەن[2]، کە ئەمەش زەمینەی بۆ گردبوونەوەی کەسانێك خۆش کرد لەناو چەند ئەڵقەیەکی ڕۆشنبیریدا کە دواتر بیریان لە ئەڵتەرناتیڤێکی تازە دەکردەوە.

لەو سەروبەندەدا، جەلال تاڵەبانی وەکو کارەکتەرێکی کاریگەر لە لایەك کەوتە هەوڵی پەیوەندیکردن و کۆکردنەوەی کەسایەتییە هۆشیارەکان بۆ ئەوەی بە نهێنی بکەونە کارەوە[3] ، لە لایەکی دیکەشەوە کەوتە هەوڵی ئاسانکاری بۆ دەرچوونی گۆڤاری (ڕزگاری)[4]، کە دوای دەرچوونی وەك مینبەرێکی گرنگ ڕۆڵی هەبوو لە بڵاوکردنەوەی بیری مارکسیی– لینینی بە گشتی و فکری ماوی بە تایبەتی، ئەگەر بزانین لە زۆربەی ژمارەکانیدا پڕوپاگەندەی بۆ ماویزم کردووە و نووسراو و وتەکانی ماوی تیادا وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی[5]. ئەمەش دواجار ڕۆڵی هەبووە لە کۆکردنەوەی گرووپێك لە کەسانی گۆشکراو بە بیری چەپ بە دەوری خۆیدا.

بارودۆخ و پێشهاتەکان سەری بۆ ئەوە کێشا لە ناوچە جیاجیاکان و لە کۆڕ و کۆبوونەوە جیاوازەکاندا دەست کرا بە دەمەتەقێ و گفتوگۆی تایبەت بە بیروباوەڕی چەپگەرایی، هەروەها ئەوانەشی کە زیاتر کەوتبوونە ژێر کاریگەرییەوە دەستیان کرد بە خوێندنەوەی کتێبەکان، لەم چوارچێوەش کتێبخانەی (بیری نوێ) کە شەهاب شێخ نووری (١٩٣٢– ١٩٧٦) سەرپەرشتی دەکرد، ڕۆڵی

کاریگەری هەبوو لە هێنانی کتێبەکان و دواتر دابەشکردنی بە نرخێکی گونجاو، کە ئەمەش زەمینەی بۆ دروستبوونی ئەڵقەی ڕۆشنبیری بۆ خوێندنەوەی کتێب خۆش کرد و، خوێنەدەوارێکی زۆری بە دەوری کتێب و بڵاوکراوە مارکسییەکان بە گشتیو، نووسینەکانی ماوی بە تایبەتی کۆکردەوە و کەوتنە شرۆڤەکردنییەوە[٦].

لەسەر ئاستی عێراقیش، دوای دووبارە هاتنەوە سەر دەسەڵاتی بەعسییەکان لە ١٧ی تەمووزی ١٩٦٨ و هەنگاوەکانی لەسەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوە، کاریکردە سەر ئەوەی کە کوردە چەپەکان بە شیکردنەوەی ناسنامەی چینایەتیی بەعس و هەڵسەنگاندنی ئایدیۆلۆژیای ناسیۆنالیستیانەوە، بەوە بگەن کە بەعسییەکان بە هیچ شێوەیەك نەڕۆژێك لە ڕۆژان مل بۆ داوا ڕەواکانی کورد دادەنێت، نە ئامادەی پێکهێنانی حکومەتێکی دیموکراسی دەبێت، بۆیە پێویستە هەنگاو بۆ خەباتێکی شۆڕشگێڕیی درێژخایەن بنرێت لە بەرانبەر ئەو دەسەڵاتەدا[٧].

جگە لە وانەی ئاماژەمان بۆ کردن، ئەوەی زیاتر پەلەی لە دامەزراندنی ڕێکخراوێکی تازەی چەپی کوردستانی کرد، دەرچوونی بەیاننامەی ١١ی مارتی ١٩٧٠ بوو، کە هاوکێشە سیاسییەکانی لە عێراق و ناوچەکەدا گۆڕی. بە تایبەت چەپەکانی ناو باڵی مەکتەبی سیاسی هاتنە پێشەوەی بارودۆخەکەیان بە شکست بۆ بەرەی بۆرژوازی لێکدەدایەوە[٨]. بەمەش دەتوانرێت بووترێ کەوتنی مێژووی سەرکردایەتی بۆرژوازی لە شۆڕشی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی و، ئاڵۆزبوون و مانەوەی کێشەی نیشتمانیی کوردستان و نەدۆزینەوەی ڕێگەچارەی بنەڕەتی و، گەشەسەندنی بیروباوەڕی پێشکەوتنخوازانەی کۆمەڵگای کوردستان و بەهێزبوونی سەنگی ڕۆشنبیران و ڕەنجدەران لە خەباتی گەلی کوردستاندا لە پاڵ پێویستییەکی مێژووکرد بۆ سەرکردایەتییەکی لێوەشاوە، کە هەڵگری بیروباوەڕی چەپگەرایی بێت، مایەی بیرکردنەوە بوو لە دامەزراندنی ڕێکخراوێکی تازەدا کە هەڵگری ئایدیۆلۆژیای چەپ بێت.

جێگای ئاماژە بۆ کردنە، کاتێك باس لە دامەزراندنی کۆمەڵە دەکرێت، ئاماژە بۆ بوونی سێ گرووپ دەکرێت کە لە لایەن هەر یەك لە: جەلال تاڵەبانی،

نەوشیروان مستەفا و شەهاب شێخ نوورییەوە سەرپەرشتی كراون و ڕۆڵیان بینیوە لـە گردكردنـەوەی چـەپەكاندا بـە دەوری خۆیانـدا و، دواتـریش لـە دامەزرانـدنی كۆمەڵەدا، كە ئەمەش وەكو مەسەلەیەكی مێژوویی لە كۆنفرانسی یەكـەمی كۆمەڵـە بە شێوەیەكی فەرمی دانی پێدانراوە[٩]. بەڵام كاتێك لە زانیاریی نێو سەرچـاوەكان ورد دەبینــەوە و شــرۆڤەیان دەكـەین، جۆرێـك لـە جیـاوازی و تێكـەڵاوی بـەدی دەكەین.

لێرەشدا سەرچاوەیەك وەكو كارەكتەرێكی بەشداربوو، پێی وایـە مەسـەلەكە لە ئەنجامی شەپۆلێكی بەرفراوانی چەپخوازی لـە كوردسـتاندا پـەرەی سـەندووە، دەستەیەك لە دەوری جەلال تاڵـەبانی كۆبوونەتـەوە و، دەسـتەیەكی دیكـەیش لـە دەوری گۆڤاری (ڕزگـاری)، كـە نەوشـیروان مسـتەفا ڕۆڵـی دیـاری تیایـدا بینیـوە، دەستەكەی دیكەیشیان لەو خوێندكارانە پێكهاتبوون كە لە زانكـۆ و پـەیمانگاكانی ئـەو كاتـەی بەغـدا بـوون كـە شـەهاب شـێخ نـووری ڕۆڵـی كاریگـەری لـە ناویانـدا هەبووە[١٠]. بەڵام فوئاد قەرەداغی كە بەشداری زۆرێك لە ڕووداوەكان بـووە دەڵـێ:

**"لە بنەڕەتدا دوو گرووپ بوون، گرووپی نەوشیروان مستەفا، كە پێكهاتبوون لـە نەوشیروان مستەفا، مەحموودی مەلا عزەت، حەمە چاوشین، شازاد سائیب، كـە ئەمانە لە دەوری گۆڤاری ڕزگاری گردببوونەوە...، گرووپی دووەم پێكهاتبوون لە شەهابی شێخ نووری، فازلی مەلا مەحموود، فەرەیدوون عەبـدولقادر، كـە لەسـەر ڕاسپاردەی ئەوان، مـن چـووم قسـەم لەگـەڵ مـام جـەلال كـرد، بـەڵام ئاگـاداری پەیوەندیی نێوانیان نەبووم، بۆیە ڕەنگە لەم مەسەلەیە مەبەستیان ئەوە بووبێت من و مام جەلال لـە یـەكتر ئاشكرا بكـەن، لەبـەر ئـەوەی مـن ئەوكاتـە ئەنـدامی كۆمیتەی ناوەندی پارتی باڵی مەكتەبی سیاسی بووم. كە لەگەڵ مام جەلال قسەم كرد، ئەویش ڕازی بوو وتی با ئێمە گرووپێك بین لە ئەندامانی كۆمیتەی ناوەندی و هەوڵی یەكخستنی گرووپەكان بدەین، ئەنجام كۆبوونەوەیـەكمان كـرد لـە ئوتێـل ڕەشید لە بەغدا، بە ئامادەبوونی ڕەفعەتی مەلا و بەكر حوسێن و مـام جـەلال و من، بڕیاری ئەوەمان دا پشتگیری لە بابەتەكـە بكـەین، كەواتـە گرووپـی سـێیەم ئەگەر هەبووبێت ئەوا بەم شێوەیە دروست بووە، نەوەك پێشووتر هەبووبێت"**[١١]،

هەروەها ڕەفعەتی مەلاش وەك پشت ڕاستکردنەوە بۆ قسەکانی فوئاد قەرەداغی ئاماژە بۆ بوونی دوو گرووپ دەکات و دەڵێ: **"...مام جەلال مەوعیدێکی لە ئوتێل ڕەشیدی بەغدا بۆ دانابووین، کە چووم فوئاد قەرەداغی و بەکر حسێن لەوێ بوون مام جەلال باسی ئەوەی کرد کە (٢) گرووپ هەیە چاکتر وایە هەوڵی یەکخستنەوەیان بدەین... پێم وایە مام جەلال پەیوەندی لەگەڵ هەردوو گرووپەکەدا هەبوو، پاش قسەکردن ئێمەش پێمان چاك بوو..."**[١٢]. ئەوە لە لایەك، لە لایەکی دیکەشەوە سالار عەزیز دەڵێ: **" مام جەلال و کاك شەهاب وەکو هێڵێك بەیەکەوە بوون، هیچ بۆشاییەك لە نێوانیاندا نەبوو"**[١٣]. بەڵام ئاوات عەبدولغەفوور پێی وایە کە جەلال تاڵەبانی هێڵی نەبووە، بەڵکو بە ناڕاستەوخۆ ڕۆڵی هەبووە لە ڕێگای ئەو هەنگاوانەی ناویەتی چ بە کۆڕەکانی بێت یاخود بە نووسینەکانی بێت کە باسی دامەزراندنی بەرەی نیشتمانی و بیروباوەڕی ماوی کردووە[١٤]. لێرەشدا دەتوانرێت بووترێت لەبەر ئەوەی سەرچاوەکان لە گێڕانەوەی ڕووداوەکاندا پشت بە ئەرشیف و دۆکۆمێنت نابەستن، بۆیە کەم تا زۆر جۆرێك لە تێکەڵاوی و دژیەکی لە زانیارییەکان و هەندێك جار هەڵەش بەدی دەکرێت لەبەر ئەوەی ماوەیەکی باش بەسەر مەسەلەکاندا تێپەڕیوە و یادەوەرییان یارمەتیدەر نییە لە دروست گێڕانەوەی زانیارییەکان بەیەکترییەوە.

شایەنی باسە، لە ناو هەریەك لەو گرووپانەی کە ئاماژەمان بۆ کردن گەڵاڵەبوونی بیرۆکەی دامەزراندنی ڕێکخراوێکی سیاسیی گۆشکراو بە بیری مارکسیی– لینینیی ببوو بە مەسەلەیەك کە هەمیشە بیری لێ کراوەتەوە. بەڵام پێویستی بە جۆرێك لە دەستپێشخەری کەسانێك هەبووە، بۆ ئەوەی گرووپ و کەسایەتییەکان لە یەکتر نزیك بکاتەوە، تا جیاوازییەکانی نێوانیان کەمتر بکەنەوە و چالاکییەکانیان یەك بخەن. لێرەشدا فەرەیدوون عەبدولقادر دەڵێ: **" ...یەکێ لە ڕۆژانی سەرەتای مایس ١٩٧٠ لە وەزارەتی بەلەدیات کارمەند بووم کاك فازڵ [مەبەستی فازڵی مەلا مەحموودە– توێژەر] میوانم بوو کە خاڵە شیهاب سەردانی کردم لە ژوورەکەمدا بە درێژی قسەکانی ڕۆژی ڕابردوو دامەزرایەوە و هەر لەوێ خاڵە شیهاب وتی: ئەبێ ڕێکخراوێکی سیاسیی نوێ دابمەزرێنین..."**[١٥]، کەواتە

دەستپێشخەرییەکە پێکهاتبوو لە هەر یەك لە: شەهاب شێخ نووری، فازڵی مەلا مەحموود و فەرەیدوون عەبدولقادر[١٦]. لە بەرانبەر ئەوەشدا یەکێك لە سەرچاوەکان پێی وایە کە دەسپێشخەرییەکە لە لایەن جەلال تاڵەبانیو شەهاب شێخ نوورییەوە کراوە[١٧]. کەچی جەلال تاڵەبانی خۆی دەڵێ:"... **خۆی و [مەبەستی شەهاب شێخ نوورییە– توێژەر] چەند هەڤاڵێکیش هاتبوونە سەر بیروڕای دامەزراندنی رێکخراوێکی تایبەتی( م – ل)ی [مەبەست مارکسی لینینییە– توێژەر] هاتنە لام و پرسیان پێکردمو پێکەوە بناغەی کۆمەڵەمان دارێژت"**[١٨]. کەواتە ڕاستە دەستپێشخەرییەکە لە لایەن شەهاب شێخ نووری و فەرەیدوون عەبدولقادر و فازڵی مەلا مەحموودەوە کراوە.

دوای ئەوەی گرووپەکەی شەهاب شێخ نووری دەسپێشخەری دەکەن، ئەوکات دەکەونە هەوڵ و تەقەلا بۆ ئەوەی لەگەڵ لایەنەکانی دیکە قسە بکەن، لەم بارەیەوە فەرەیدوون عەبدولقادر دەڵێ:"... **بڕیارمان دا بچین لەگەڵ هەڤاڵ مام جەلال قسە بکەین، هەر ئەو ڕۆژە گرێی رازەکەمان بۆ کاك (دلێر سدیق)ی ئەندازیار کردەوە لەگەڵمان هات، پاش باسکردنی نیازەکەمان بۆ مام جەلال و ڕەزامەندی ئەویش لەسەر بیری ئەو کارە شۆڕشگێڕییە ئامۆژگاری کردین کە لەگەڵ هەموو برایانی تر قسە بکەین ئەوسا کۆبوونەوەیەك بکەین بۆ دانانی بەرنامەیەکی ڕۆشن بۆ خەبات و ڕێبازی ڕێکخراوەکە"**[١٩]. لێرەشدا لە مەسەلەی پەیوەندیکردن بە جەلال تاڵەبانی بیروڕای جیاواز دێتە پێشەوە، کاتێك سەرچاوەی یەکەم بابەتەکە بە شێوەیەك باس دەکات کە هەموویان پەیوەندییان پێوە کردبێت، کەچی سەرچاوەیەکی دیکە پێی وایە کە فازڵی مەلا مەحموود (١٩٤٨ –١٩٨٩) بەو کارە ڕاسپێردراوە تا قسە لەگەڵ تاڵەبانیدا بکات[٢٠]. هەروەها لە سەرچاوەیەکی دیکەدا هاتووە کە لەسەر ڕاسپاردەی شەهاب شێخ نووری و هاوڕێکانی، ئەویان ڕەوانە کردووە و چووە گفتوگۆی لەگەڵ جەلال تاڵەبانی کردووە[٢١].

دوای ئەوەی هەردوو گرووپی تاڵەبانی و شەهاب شێخ نووری لە یەکتر ئاشکرا بوون، هەوڵی پەیوەندیکردن بە گرووپەکەی نەوشیروان مستەفاوە

دەدرێت، دیسانەوە لە مەسەلەی چۆنییەتی پەیوەندیکردن پێیان و هۆکاری بە دەنگەوە نەهاتنیان لەنێو سەرچاوەکاندا زانیاریی جیاواز بەدی دەکرێت. کاتێك یەکێك لە سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لە ڕێگای فازڵی مەلا مەحموودەوە پەیوەندی بە نەوشیروان مستەفاوە کراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی تاڵەبانییان قبوڵ نەبووە، بەشداربوونیان لە مەسەلەکە ڕەت کردۆتەوە[22]. کەچی تاڵەبانی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە نەوشیروان مستەفاوە کردووە، بەڵام ئەوان لە سلێمانی گرووپێك بوون شەهاب شێخ نوورییان قبوڵ نەبووە[23]. هەروەها سەرچاوەیەکی دیکە هۆکارەکە بۆ ئەوە دەگێڕێتەوە بە ئاشکرا ناوهێنانی مارکسیزم– لینینزم، بیری ماوییان قبوڵ نەبووە و، سەرباری ئەوەش تێبینییان لەسەر هەڵسووڕاوێکی گرووپەکەی شەهاب شێخ نووری (فازڵی مەلا مەحموود) هەبووە، هەروەها پێشیان وابووە کە دوو گرووپەکەی دیکە بەبێ ئەوان کاری ڕێکخراوەییان کردووە[24]. کەچی نەوشیروان مستەفا لە بارەی ئەو مەسەلەیەوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەوان لەسەر چەند خاڵێك جیاوازییان لەگەڵ گرووپەکانی دیکە هەبووە، وەك ئەوەی کە دەڵێ:" **فکری ئێمە جیاوازییەکەی لەگەڵ برادەرەکانی تر لەوەدابوو، یەکەم: ئێمە پێمان باش بوو ڕێکخستنەکە کادیری بێت، واتە بە ژمارە کەم بێت و بە نەوعییەت زۆر باش بێت، بۆ ئەوەی بتوانن لە کاتی پێویست بێنە پێشەوە، بەڵام ئەوانەی تر پێیان وابوو ڕێکخستنەکە جۆرێك لە فراوانی پێوە دیار بێت، بۆ ئەوەی دەستمان بگات بە هەموو لایەك. دووەم: جیاوازییەکان لەسەر ئەوە بوو کە ئێمە مارکسی لینینیی– بیری ماوتسی تۆنگ تەبەنی دەکەین، کە برادەران هەموو لەگەڵ ئەوەدا بوون، بەڵام ئێمە پێمان وابوو کە تەجروبەی ماوتسی تۆنگ، تەجروبەیەکی ناوخۆیی چینە دەشێ سوودی لێ وەربگرین بۆ هەندێ شت، بەڵام ناشێت وەك تیۆریی مارکسی– لینینی چاوی لێ بکەین، هی سێیەم، ئێمە پێمان باش نەبوو مام جەلالی تیابێت، هەروەها پێمان باش نەبوو هیچ کام لە سەرکردەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی تیا بێت، چونکە پێمان وابوو باڵی مەکتەبی سیاسی لە ڕوویی سیاسی شکستی هێناوە، هەر کەسێکیش لەوانە بێت ئەوە شکستەکە لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، بۆیە کە هاتە سەر ئەوەی**

**ڕێكخراوەكە دروست بكەین... ئێمە كشاینەوە دواوە، كە دەڵێم كشاینەوە دواوە مەبەستم سەركردایەتییە، ئەگینا هەموو گرووپەكەی خۆمان لەگەڵ ئەواندا تێكەڵاو كرد"**[٢٥]. لێرەشدا ئەو سەرچاوەیەی كە مەسەلەی بەدەنگەوە نەهاتنی نەوشیروان مستەفا بۆ بوونی تاڵەبانی لە ڕێكخراوەكە دەگێڕێتەوە، پێی وایە هەڵوێستەكەی نەوشیروان مستەفا بەرانبەر بە تاڵەبانی جۆرێك لە ڕەوایەتی پێوە دیار بووە، چونكە هەڵوێستەكەیان بەرانبەر تاڵەبانی مانای ئەوە نەبوو كەسایەتییەكی خراپە، بەڵكو لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو وەكو ڕێكخراوێكی تازە، بۆ خۆیان بكەن بە میراتگری سەركردایەتی كۆن؟ كە خاوەنی پێشینەیەكی شەڕی ناوخۆ بوون، هەروەها بۆ كارە نێگەتیڤەكانی ئەوان بۆ خۆیان بێنن؟، یاخود بۆ تاڵەبانی قبوڵ بكەین كە لە هەموو شتێكدا دەبێت كەسی یەكەم بێت؟!، بەڵام لەبەر ئەوەی مەسەلەكە لە جەلال تاڵەبانی گەیاندرابوو، جگە لەوەش پێیان وابووە كە ڕۆڵی باشی لە پێگەیاندنی گەنجە چەپەكاندا بینیوە، ئەنجام بۆیان نەكراوە سوود لە هەوڵ و تواناكانی نەبینین[٢٦].

ئەنجامی هاتنە پێشەوەی بابەتەكان، دوو گرووپەكەی كە لە دەوری جەلال تاڵەبانی و شەهاب شێخ نووری كۆببوونەتەوە كەوتوونەتە گفتوگۆوە، بۆ ئەو مەبەستەش زنجیرەیەك كۆبوونەوەیان ئەنجام دا. لەوانە دوو لە كۆبوونەوەكان لە ماڵی فەرەیدوون عەبدولقادر لە بەغدا لە كۆتایی مایس و سەرەتای حوزەیرانی ١٩٧٦ ئەنجام دران، تیایدا گەیشتوون بەو ئەنجامەی ناوێك بۆ ڕێكخراوەكە هەڵبژێرن. لێرەشدا یەكێك لە سەرچاوە بەشداربووەكان ئاماژە بۆ ئەوە دەكات، هەڵبژاردنی ناوی كۆمەڵەیان لە دوو مەسەلەی مێژوویی لە خەباتی چینایەتی و نەتەوایەتی وەرگرتووە، ئەویش كۆمەڵەی كۆمۆنیستەكان كە ماركس و ئەنگلز وەك بەرنامە (مانیفێست)یان بۆ نووسیبوو. ئەوەی تریش لە ژێر كاریگەریی ناوی كۆمەڵەی (ژ—ك) بوو، كە لە ڕۆژهەڵاتی كوردستان ڕۆڵی دیاری لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی كوردیدا بینیبوو[٢٧].

دیارە لەو كۆبوونەوانە جگە لەوەی كە لەسەر مەسەلەی ناونانی ڕێكخراوەكە بە ئەنجامێك دەگەن، بە هەمان شێوەش بیر لەوە دەكرێتەوە بەرنامە و پێڕەوێكی

ناوخۆش بۆ ڕێکخراوەکە بنووسرێت. لەم بارەشەوە فوئـاد قـەرەداغی دەڵـێ:"... **بۆ ئەو مەبەستەش ئەرکەکە بە من سپێردرا، لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا بەرنامـە و پێڕەوەکەم گەڵاڵە کرد، کە تیایدا سوودم لە بەرنامە و پێـڕەوی نـاوخۆیی چـەند حیزبێك وەرگرتبوو...**"[28]، بەڵام بە پێچەوانەوە فەرەیـدوون عەبـدولقادر دەڵـێ: "**لە مەسەلەی نووسینەکانی ئەو کاتە هەرچی بووە و، لە کۆبوونەوەکان وتـراوە دواتر من و کاك فوئاد قەرەداغی نووسیومانە، جا نازانم بە خەتی ئەو بووە یان نا، بەڵام داڕشتنەکەی هەردووکمان بووینە**"[29]. لێرەشدا زانیاری ئەم دوو سەرچاوەی سەرەوە ئەو مەسەلەیە ڕەت دەکاتەوە کە گوایە تاڵـەبانی پێـڕەو و پرۆگرامەکـەی نووسیوە و دواتر بـە (کوردایـەتی) ناسـراوە[30]، بـە بەڵگـەی ئـەوەی تاڵـەبانی زۆر پێشـتر کتێبێکـی بـە نـاوی (کوردایـەتی و بزووتنـەوەی ڕزگـاری نەتەوایـەتی گـەلی کوردستان) [31] نووسیوە، کە لە ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکاندا خوێندراوە.

دوای زنجـیرە کۆبوونەوەیـەك کـە ئاماژەیـان بـۆ کـرا، سـەرئەنجام لـە مـاڵی شەهاب شێخ نووری بە ئامادەبوونی هەر یەك لە: جـەلال تاڵـەبانی، شـەهاب شـێخ نووری، فوئاد قەرەداغی، فـازڵی مـەلا مـەحموود، فەرەیـدوون عەبـدولقادر و دلێـر سـدیق لـە ١٠ی حـوزەیرانی١٩٧٠ بڕیـار لـە دامەزرانـدنی کۆمەڵـە درا[32]. لێرەشـدا ئەوەی کە لە جیهانی سیاسەت و پارتایەتی باوە، دامەزراندنی فەرمی ڕێکخستنێك لەو دانیشتنەوە دەست پـێ دەکـات کـە بڕیـار لـە دەسـت بـەکاربوونی دەدرێـت و بەرنامـە و پێـڕەوی نـاوخۆ بڕیـاری لەسـەر دەدرێـت، هـەروەها تیایـدا کۆمیتـەی ناوەندی کارەکان دیاری دەکات. بەمەش ئەوەی بەشداری لەو دانیشتنە دەکات بە دەستەی دامەزرێنەر هەژمار دەکرێت، بەڵام کاتێك دەمانەوێت لە بارەی دەسـتەی دامەزرێنەری کۆمەڵە و دیاریکردنی ناوەکانیان بە ئەنجامێك بگـەین، لـەوەدا ئـەوە بەدی دەکرێت کە لە سەرچاوەکاندا ڕایەك هەیە مافی دامەزراندنەکە بۆ هەموو ئەو کەسانە دەگێڕێتەوە کە هەڵگری بـیری چـەپگەرایی بـوون، لەبـەر ئـەوەی زۆربـەی ئەوانە لەگەڵ دامەزراندنی ڕێکخراوێکی لەو شێوەیە بوون و پرسیان پـێ کـراوە[33]. بەمەش دەتوانرێت بووترێ ئەو بیروڕایە جۆرێك لە ڕاستیو ڕەوایەتی پێوە دیـارە،

چونکە لەم سەروبەندەدا ئاسان نەبووە کۆمەڵێکی زۆر لە کەسایەتی لـە شـوێنێکی دیاریکراودا کۆببنەوە و بڕیار لە دامەزراندنی ڕێکخراوێك بدەن.

لە ڕاستیدا، وەکو چۆن زۆرێك لە مەسەلە سەرەتاییەکان بیروڕای جیاوازیـان بە دوای خۆیاندا هێناوە، بە هەمان شێوە ناسنامەی ڕێکخراوەکەش هەروایە. ئایـا کۆمەڵەی مارکسیی– لینینی ئەندێشـەی ماوتسـی تـۆنگ بـووە؟ یـاخود کۆمەڵـەی مارکسیی– لینینیی کوردستان ئەندێشـەی مـاو تسـی تـۆنگ بـووە؟ یـا کۆمەڵـەی مارکسیی– لینینیـی کوردسـتانی عـیراق ئەندێشـەی مـاو تسـی تـۆنگ بـووە، یـان کۆمەڵەی مارکسـیی – لینینیـی کوردسـتان– عێـراق ئەندێشـەی مـاو تسـی تـۆنگ بووە؟

لەم بارەشدا، فوئاد قەرەداغی دەڵێ: **"...من دڵنیام کە داش عێراقی لەگەڵدا بووە"**[34]. کەچـی فەرەیـدوون عەبـدولقادر دەڵـێ: **" کۆمەڵـە بـە نـاوی کۆمەڵـەی مارکسیی لینینیی کوردستانی عێراق ئەندێشەی ماوتسی تۆنگ دامەزرا،... کۆمەڵە کوردستانی بوو، چونکە زیاتر جووڵانەوەیەکی چەپی نیشتمانی بوو وەك لـەوەی ئینتەرناسیۆنالیزمی بێـت وەك پارتـە کۆمۆنیسـتەکان، هـەروەها لـە گرفتـەکانی جووڵانەوەی ڕزگاریی کوردستان و لـە هـەناوی کۆمـەڵی کوردسـتانەوە هـاتبووە کایەوە، نەوەکو لە ئەنجامی بە هێزبوون و گەشـەکردنی جووڵانـەوە کرێکـاری و کۆمۆنیستی..."** [35]. بەڵام سەرچاوەیەکی دیکە، بە جیاوازی ئەو دوو سەرچاوەیە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ناوی کۆمەڵـە نـە پاشـگری کوردسـتانی و نـە پاشـگری عێراقی پێوە نەبووە، بەڵکو ناوەکـەی کۆمەڵـەی مارکسـیی لینینیـی– ئەندێشـەی ماوتسی تـۆنگ بـووە[36]. کەچـی سەرچـاوەیەکی دیکـە پێیوایـە، تەمومـژ لەسـەر ناسنامەی کۆمەڵە نەبووە، چونکە کۆمەڵە ڕێکخراوێکـی مـاوی بـووە و، بـڕوای بـە خەباتی نەتەوەیی و چینایەتی هەبووە و، تێکۆشاوە بۆ ئەوەی بیروبـاوەڕی مـاوی لەبەر ڕۆشنایی تایبەتمەندییە نەتەوەییەکانی گەلی کورد لە کوردستاندا بە گشـتی و باشووری کوردستان بە تایبەتی پیادە بکات[37].

جێگای ئاماژە بۆ کردنە، کۆبوونـەوەی ١٠ی حـوزەیرانی ١٩٧٠ ، سـەرباری ئەوەی بڕیاری دامەزراندنی کۆمەڵەی تیـادا درا، لەگـەڵ ئەوەشـدا پەسـندی ئـەو

پێـڕەو و پرۆگرامـەش کـرا کـە ئامـادە کرابـوو، ئینجـا بڕیـاری دیـاریکردنی سەرکردایەتی و دابەشکردنی کارەکان درا، کە لە سەرچاوەکاندا بە جیاواز باس لە یەکەم سکرتێری کۆمەڵە و ئەندامانی سەرکردایەتی دەکرێت. لـەم بارەشـەوە فوئاد قەرەداغی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە تاڵەبانی وەکو سکرتێر دیاری کراوە و، لەسەر ڕاسپاردەی تاڵەبانیش ئەویان وەکو جێگر دەستنیشان کردووە[38]، کەچی سەرچاوەیەکی دیکە بەم شێوەی خوارەوە ئاماژەی بۆ دەستەی سەرکردایەتی کردووە:

یەکەم: شەهاب شێخ نووری سکرتێری لێژنەی سەرکردایەتی. دووەم: نەوشیروان مستەفا ئەندام. سێیەم: جەعفەر عەبدولواحید ئەندام و سەرپەرشتیاری هەولێر. چوارەم: فەرەیدوون عەبدولقادر ئەندام و سەرپەرشتیاری کەرکووک. پێنجەم: ئاوات عەبدولغەفوور ئەندام و سەرپەرشتیاری سلێمانی. شەشەم: محەمەد میرزا سەعید مەلا عەباس ئەندام و سەرپەرشتیاری بەغدا. حەوتەم: ئەرسەلان بایز ئەندامی سەرکردایەتی[39].

لێرەشدا دەتوانرێت بووترێ، زانیارییەکانی نێو ئەو سەرچاوەیە و، ئەوانەشی پشتیان بە زانیارییەکانی بەستووە کەوتوونەتەوە هەڵەوە، چونکە لە بارەی سکرتێرەوە زۆربەی سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە یەکەم سکرتێری کۆمەڵە جەلال تاڵەبانی بووە[40]، بەڵام لەبەر ئەوەی بە ماوەیەکی کەم تاڵەبانی چۆتە دەرەوەی وڵات، شەهاب شێخ نووری وەکو برا گەورەیەك کۆمەڵەی بەڕێوە بردووە نەك وەکو سکرتێر، تەنانەت تاڵەبانی خۆشی لەو بارەیەوە دەڵێ:" ... **دوای دوو ساڵ لە دامەزراندنی کۆمەڵە پێشنیارم کرد بۆ هاوڕێیان کە بیکەنە سکرتێری کۆمەڵە [مەبەستی شەهاب شێخ نوورییە– توێژەر]**"[41]. هەرچی لە بارەی ئەندامێتی نەوشیروان مستەفایە لە سەرکردایەتیی کۆمەڵە، ئەوە ناوبراو خۆی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات لە سەرکردایەتی کشاونەتەوە و دواتریش چۆتە دەرەوەی عێراق[42]. سەبارەت بە جەعفەر عەبدولواحید و محەمەد میرزا سەعید و ئاوات عەبدولغەفووریش، دوای ئەوەی هەریەك لە تاڵەبانی و دواتریش شەهاب شێخ نووری کە چوونەتە دەرەوە، ناچار بوونە هەندێ کەسی دیکە بخەنە ناو

سەرکردایەتییەوە، کە ئەنجام محەمەد میرزا سەعید، جەعفەر عەبدولواحید و ئاوات عەبدولغەفور هاتوونەتە پێشەوە[٤٣]. هەرچی ئەرسەلان بایزە ئەوە ناوبراو لە یاداشتەکانیدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لە پایزی ١٩٧٠ تێکەڵاوی کۆمەڵە بووە، جگە لەوە باسی ئەوەشی نەکردووە لەم ماوەیەدا ئەندامی سەرکردایەتی بووبێت[٤٤]. کەواتە دەتوانرێت بووترێ یەکەم سەرکردایەتیی کۆمەڵە پێکهاتبوو لە: جەلال تاڵەبانی سکرتێر، لەگەڵ ئەندامێتی هەریەك لە شەهاب شێخ نووری، فوئاد قەرەداغی، فازڵی مەلا مەحموود، فەرەیدوون عەبدولقادر و دلێر سدیق.

کۆمەڵە دوای دامەزراندنی بە دید و بۆچوونێك و ئاسۆیەکی ڕوونەوە کەوتە جێبەجێکردنی ئەو بەرنامەیەی، کە لانی کەمی بەرپاکردنی شۆڕشێکی دیموکراتی نوێ بوو، تا ئەوەی ئەرکەکانی شۆڕشی نیشتمانیی دیموکراتی بەدی بێنێت و زەمینە بۆ بنیادنانی یەکسانیی کۆمەڵایەتی خۆش بکات، لێرەشدا وەك هەر ڕێکخراوێکی چەپی ماوی ئەرکەکانی شۆڕشکردنی کردبوو بە دوو بەشەوە کە دوا ئامانجی گەیشتن بوو بە کۆمۆنیزم. جگە لەوەش لە ناو بەرنامەکەیدا ئاماژە بە چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوایەتیی گەلی کورد کردبوو، کە دواجار ئەو ئەرکەش دەکەوێتە چوارچێوەی ئەرکەکانی شۆڕشی دیموکراتیی نوێوە، هەروەها کۆمەڵە لە ڕووی ئایدیۆلۆژییەوە خۆی وەك ڕێکخراوێکی کۆمۆنیستی ناساندبوو، چوارچێوەی خەباتکردنیشی بە مارکسیزم— لینینیزم بیروباوەڕی ماوی گرێدابوو. هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا مەسەلەی پێکهێنانی پارتی پێشڕەو بۆ سەرکردایەتی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد و، دامەزراندنی بەرەی نیشتمانیی یەکگرتوو و، لەشکری گەلو، شۆڕشی درێژ خایەنی بێ دوودڵی قبوڵ بوو[٤٥]. ئەوە لەلایەك، لە لایەکی دیکەشەوە لە بارەی مەسەلەی ڕێکخستنەوە، پێڕەوی ناوخۆکەی بە تەواوەتی مەسەلە بنەڕەتییەکانی لە بابەت ناوەندییەتی دیموکراتی و، ئازادیی ڕادەربڕین و، گوێڕایەڵیی کەمینە بۆ زۆرینە و، گوێڕایەڵیی ڕێکخستنەکان بۆ بڕیارەکانی کۆمیتەی سەرکردایەتی و، پەیڕەوکردنی هێڵی جەماوەری و پرەنسیپی لە جەماوەرەوە بۆ جەماوەر و، شێوازی هەڵبژاردن بۆ دانانی کۆمیتەکان و،

پاراستنی مافی تایبەتی کەسایەتی و، شێوازی خەباتی نهێنی کە بگونجێت لەگەڵ هەلومەرجی ئەو کاتە دیاری کردبوو[٤٦].

ئیتر لە چوارچێوەی ئەو بەرنامانەی کە دای ڕشتبوون، کۆمەڵە بۆ ئەوەی بتوانێت گەشە بە ڕێکخستنەکانی بدات، بە شێوەیەکی نهێنی کەوتە کارکردن. بەمەش هەنگاوە سەرەتاییەکانی لە گەشەکردن و فراوانکردنی ڕێکخستنەکانی لە ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکانەوە دەستی پێکرد، کە لە تەوەری داهاتوودا باس لە ڕۆڵی ڕێکخستنەکان و ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکان دەکەین.

## تەوەری دووەم: چالاکی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە و ڕۆڵی ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکان

دامەزراندنی کۆمەڵە لە ١٠ی حوزەیرانی ١٩٧٠ هاوکات بوو لەگەڵ ئەو ڕووداو و پێشهاتانەی کە بەیاننامەی ١١ی مارت لە عێراق و باشووری کوردستان لەگەڵ خۆیدا هێنابوویە پێشەوە، لە کاتێکدا کە پارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرکردایەتی بارزانی و ڕژێمی عێراق سەرمەستی سەرکەوتنەکانیان بوون و، باڵی مەکتەبی سیاسییش بەری شکستی خۆی دروێنە دەکرد، بەڵام ئەوەی بارودۆخەکەی لەبار کردبوو جۆش و خرۆشی لاوان و خوێندەوارانی ئەو دەمە بوو، کە ئامادەیی ئەوەیان تیادابوو بیروباوەڕی شۆڕشگێڕی بە ئاراستەی مارکسی کە بەسترابێتەوە بە مەسەلەی نەتەوەییەوە قبوڵ بکەن، چونکە ئەو کاتە شەپۆلێکی لەو شێوە بابەتە ناوچەکەی بە گشتی گرتبۆوە.

لە چوارچێوەی ئەمەشدا، سەرکردایەتیی کۆمەڵە هەر لەسەرەتاوە کەوتە دابەشکردنی کار و سەرکردایەتییەکەی بەسەر شارەکانی باشووری کوردستاندا، تا ئەوەی بە نهێنی بکەونە پەیوەندیگرتن بەو کەسایەتییانەی زۆر لێیانەوە نزیکن و متمانەی ئەوەیان پێیان هەیە کە کارکردن لە ناو ڕێکخراوێکی چەپدا قبوڵ دەکەن[٤٧]. ئەم مەسەلەی بە نهێنی کارکردنەش زیاتر لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو، چونکە لەم سەروبەندەدا پارتی دیموکراتی کوردستان و دەزگای (پاراستن) زۆر بالادەست بوون و ڕێکخراوێکی لەم شێوەیان قبوڵ نەدەکرد، هەروەها دەزگای هەواڵگری و ئاسایشی سەر بە ڕژێمی ئەوکاتەی عێراقیش

بەبوونی ڕێکخراوێکی ئاوا ڕازی نەدەبوو، ئەوە سەربارى ئەوەی دەبوو کۆمەڵە لە قۆناغی سەرەتای کارکردنیدا زەمینەسازی بۆ پتەوکردنی ڕێکخستنەکانی بکات، تا بە تەواوەتی خۆی بۆ قۆناغی بانگەشەی ئاشکرا ئامادە بکات[٤٨]. بەمەش سەرکردایەتیی کۆمەڵە لە هەنگاوی یەکەمیدا توانی لە هەر یەك لە شارەکانی بەغدا، سلێمانی، کەرکووك، خانەقین، هەولێر و ناوچەی بادینان، ژمارەیەك کەسایەتی بە دەوری خۆیاندا کۆبکاتەوە و لە ڕێکخستنە سەرەتاییەکانی کۆمەڵەدا ڕێکیان بخات[٤٩].

دوای ئەوەی سەرکردایەتیی کۆمەڵە لە هەنگاوی یەکەمی ڕێکخستنەکانی توانی بەشێك لەو کەسایەتییانەی کە جێگای باوەڕن بە دەوری خۆیدا کۆیان بکاتەوە، هەنگاوی دوای ئەوە گرنگیدان بوو بە بازنەی ڕۆشنبیری، کە ئەمەشیان هەنگاوێك بوو لەوەوە دەستی پێدەکرد کە کەسێك یاخود دووکەس بە یەکەوە لە لایەن کادیرێکی کۆمەڵەوە دەستنیشان دەکران و، دەست دەکرا بە خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی کە زیاتر پەیوەندییان هەبوو بە بیروباوەڕی چەپ و، مێژووی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلان و هۆکارەکانی سەرکەوتنیان، لەگەڵ خوێندنەوەی شۆڕشەکانی کورد و هۆکارەکانی سەرنەکەوتنیان. بەمەش گفتوگۆکان درێژەی دەکێشا تا ئەوەی لە ناو دانیشتنەکاندا بیروڕای ئەوە گەڵاڵە دەبوو یاخود پرسیاری ئەوە دەکرا، دەبێت چی بکەین؟ یان چۆن هەنگاو بۆ دامەزراندنی ڕێکخراوێکی چەپی مارکسی بهاوێین؟ ئەنجام ئەو کەسە ئاگادار دەکرایەوە لەوەی کە ڕێکخراوێك هەیە بە ناوی کۆمەڵەی مارکسیی – لینینیی کوردستان گۆشکراو بە بیروباوەڕی ماوی، بەمەش کە قبوڵی دەکرد تیایدا کار بکات، ئیدی ئەو کەسە دەبوو بە ئەندام[٥٠]. ئیتر بەم شێوەیە مەسەلەی ڕێکخستنەکان وردە وردە فراوان بوون و ڕیزبەندی کران بۆ بازنەی ڕۆشنبیری، شانە و شانەی سەرەکی، کۆمیتەی شارەکان و ناوەند یاخود سەرکردایەتیی کۆمەڵە[٥١].

کۆمەڵە لە سەرەتای دامەزراندنییەوە، لە ژێر کاریگەریی ئایدیۆلۆژییەتی مارکسیزم – لینینزم و بیروباوەڕی ماوی و، بە مەبەستی لێکترگرێدانی خەباتی

نیشـتمانی و چـینایەتی دروشمـی (ئـەی کرێکـاران و گـەلانی زۆرلێکـراوی جیهـان یەکگرن)ی بەرز کردەوەو کەوتە خەباتکردنەوە[٥٢]. بەڵام ئەوەی وای کـرد زۆر بـە زەقی مەسەلەی بیری ماویزم بە سەرەتاکانی کۆمەڵـەوە دیـار بێـت، بـوونی چـەند خاڵێکی بوو کە سەرکردایەتی کۆمەڵە کەوتبوونە ژێر کاریگەرییەوە.

یەکەم: زەقبوونەوەی خـەباتی نیشـتمانی و زاڵبـوونی لـە شـۆڕش و خـەباتی گـەلی چـین بـە سـەرۆکایەتی مـاو تسـی تـۆنگ، زیـاتر لـە خـەباتی پرۆلیتاریـای نێونەتـەوەیی، وا دەکـات لـە سـۆنگەی گرنگـی گرێـدانی خـەباتی نیشـتمانی و چینایەتی لە باشووری کوردستان ، کۆمەڵە وەك ڕێکخراوێکی بڕوابـوو بـە خـەباتی ڕزگاری نیشتمانی، فکری ماوی قبوڵ بکات[٥٣].

دووەم: شتێکی سروشتییە خەباتی پرۆلیتاریا کە بریتییە لە نـاکۆکیی نێـوان کـار و سـەرمایە، سەرچـاوە و بنکـەی هەڵگیرسـانەکەی لـە نـاو شـارەکان لەسـەر دەستی کرێکاران لە ناو کارگەکان سەر هەڵدەدات، کـە پێویسـتی بـە ژمارەیـەکی زۆری کرێکار هەیە، بەڵام ماو تسی تۆنگ تێزەکەی خۆی وا داڕشـتبوو کـە خـەبات لە لادێکانەوە گەمارۆی شـارەکان بـدرێت. ئەمـەش شـێوەیەکی دیکـە بـوو کـە لـە خەباتی گەلی کورد لەو دەمەدا نزیك بوو، لەبەر ئـەوەی لـە کوردسـتان نـە کرێکـار بـەو زۆرییـە هـەبوو، نـە کارگـەی گـەورەی وەهـاش لـە کوردسـتاندا هـەبوو، بۆیـە سەرکردایەتیی کۆمەڵە لە ژێر ئەو کاریگەرییە و بە بڕوابوون بـە دامەزرانـدنی بنکـە لە لادێکانەوە و دواتریش گەمارۆدانی شارەکانەوە کەوتە ژێر کاریگەریی تێزەکانی ماو تسی تۆنگەوە[٥٤].

سێیەم: تاکتیکێکی دیکـە، کـە بـەلای چـینییەکانەوە بـە گشـتی و، ماوتسـی تۆنگ بە تایبەتی گرنگ بوو، مەسەلەی دامەزراندنی بەرەی یەکگرتووی نیشـتمانی بوو، کە جێگای گرنگیپێدانی سەرکردایەتیی کۆمەڵە بوو، چـونکە پێیـان وابـوو لـە خــەباتی ڕزگــاریی نیشــتمانیی کوردســتاندا پێویســتی بــە کۆکردنــەوەی چــینە شۆڕشگێڕەکان لە جووتیاران، کرێکـاران و، ڕووناکـبیرانی شۆڕشـگێڕ هەیـە، ئـەوە سەرەڕای ئەوەی سەرکردایەتیی کۆمەڵە پێیان وابوو ناکرێـت لـەو سـەردەمەدا کـە

خەبات بۆ ڕزگاریی نیشتمانی دەکرێت، شەڕێکی چینایەتیش لە کوردستان بەرپا بکرێت[٥٥].

چوارەم: هاوکات لەگەڵ ئەمانەشدا لەو ماوەیەدا گلەیی و گازاندەیەکی زۆر و ڕەخنەی بێزارکەر ڕووی کردبووە یەکێتیی سۆڤیەت، چونکە لەبەر بەرژەوەندییەکانی پشتی کردبووە شۆڕشەکانی دنیا و کەوتبووە هاوکاریکردنی هێزە دەسەڵاتدارەکان، بەمەش وای لێ هاتبوو دەورێکی ئەوتۆی لە گۆڕەپانی سیاسیی کوردستاندا نەمێنێت. تەنانەت ئەو مەسەلەش ڕەنگدانەوەی بەسەر پارتە کۆمۆنیستەکانی سەر بە سۆڤیەت لە وڵاتانی دیکەی دونیادا هەبوو، کە باشووری کوردستانیش لەم مەسەلەدا بەدەر نەبوو. ئیدی بۆ ئەوەی کۆمەڵە خۆی لە هێڵی سۆڤیەت جیابکاتەوە کەوتە ژێر کاریگەریی هێڵی چینەوە[٥٦]. کە ئەوەش جگە لە هەڵوێستێکی جیاواز، شتێکی دیکە نەبوو.

پێنجەم: خۆگرێدان بە ماویزمەوە هەم بۆ کەڵک وەرگرتن بوو لە ئەزموون و ڕێباز و ناو و دەنگەکەی، هەمیش هەوڵێك بوو بۆ بە دەستهێنانی پشتیوانی ئەو بلۆکە بەهێزە تازە شکڵگرتووە، چونکە تیورەکانی ماو لەگەڵ مەرام و ئامانجەکانی ناسیۆنالیستەکانی ئەو دەمەدا دەگونجا، کە خۆی ناو نابوو چەپ و قسەی بۆ شارنشینی و خوێندەواران دەکرد، بە ئامانجی ئەوەی بزووتنەوەی ڕزگاریی نیشتمانی و هاوکاریی چینەکانی کۆمەڵگای کوردستانی پێ تیۆریزە بکات[٥٧].

کۆمەڵە بە ماوەیەکی کەم دوای دامەزراندنی ڕووبەڕووی کێشە و ململانێیەکی فکریی ناوخۆی هاتۆتەوە، ئایا کۆمەڵە خەبات لە پێناو دامەزراندنی ڕێکخراوێکی چەپی عێراقی دەکات؟. یاخود خەبات لە پێناو دامەزراندنی ڕێکخراوێکی چەپی کوردستانی دەکات؟ لەم بارەیەوە یەکێك لە سەرچاوەکان دەڵێت:**"...خاڵێك کە ناڕۆشنی لەسەر هەبوو، مەسەلەی ناسنامەی ڕێکخراوەکە و سنووری کارکردنی بوو، ئایا ڕێکخستنەکە ناسنامەیەکی ناسیۆنالیستی دەبێت یان ناسنامەیەکی ئینتەرناسیۆنالیستی؟ ئایا ستراتیژی کاری ڕێکخراوەکە لە بواری ڕێکخستندا کارکردن دەبێت بۆ بنیادنانی حیزبێکی کۆمۆنیستی عێراقی یان حزبێکی**

**کۆمۆنیستی کوردستانی؟. ستراتیژی، کۆمەڵە ڕزگاریی کوردستانە لە چوارچێوەی شۆڕشی دیموکراتیی نوێی عێراقدا یان تەنیا ڕزگارییە لەسەر ئاستی کوردستان؟ ئیتر وردەکاریی ئەو ناڕۆشنییە لە سەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەدا بە تەواوی و بەم شێوەیە نەبوو، کەسێك بە وردی لەم رووەوە باری سەرنجێکی تایبەتی هەبێت، مشتومڕیشی لەسەر بکرێت، بەڵام دوای تێپەڕبوونی ماوەیەك لە کارکردن، ناکۆکیی لەم ڕووەوە سەری هەڵدا..."** [٥٨]. ئەوە لە لایەك، لە لایەکی دیکەوە سەرچاوەیەکی دیکە بەم شێوەیە لە سەرهەڵدانی ناکۆکییەکە دەدوێت و دەڵێت: **"مەسەلەی دەرکەوتنی ناکۆکییەکان ئاسایی بوو، لەبەر ئەوەی تێگەیشتنی تیۆری و ڕووناکبیریمان لەو ئاستەدا نەبوو... هەروەها مەسەلەی بوونی ڕێکخراوێکی چەپی مارکسی لینینی لەو کاتەدا وا باو بوو کە دەبێت حزبێکی چینایەتی بێت، ... بەڵام مارکسیزم لە دونیادا زانست و فەلسەفەیەك بوو تەفسیری بۆ ژیان بۆ گۆڕینی ژیان هەبوو، شتێك نییە تەنیا پەیوەندی بە چینێکەوە هەبێت و چینەکەی دیکە فەرامۆش بکات، بەمەش ئێمە پێمان وابوو ئەوە چرایەکە لە تاریکیدا ڕێگاکانت بۆ ڕووناك دەکاتەوە. بۆیە لەوکاتە بیروڕای ئێمە وابوو بوونی ڕێکخراوێك بۆ کوردستان پێویستە لەبەر ئەوەی کوردستان وڵاتێکی پارچە پارچە کراوە و، لە کوردستانی عێراقیش مافەکان زەوت کراون،...، ئیتر بیرکردنەوەی ئێمە لە چوارچێوەی گیروگرفتەکانی کوردستاندا بوو. کەچی برادەرانی دیکە وای تێگەیشتبوون کە لە کوردستاندا چینی کرێکاران جیا نین لە چینی کرێکارانی عێراق،...، لەبەر ئەوە دەبێت خەباتەکەمان خەباتێکی چینی کرێکاری بێت لەسەر ئاستی عێراق"** [٥٩].

وادیارە ئەو مەسەلەیە لە سەرەتاوە لەسەر ئاستی سەرکردایەتیی کۆمەڵە وەکو ناکۆکی و گفتوگۆ لەسەرکردن دەستی پێکردووە، بەڵام دواتر بۆ ناو ڕێکخستنەکانی خوارەوە شۆڕبۆتەوە و بۆتە جێگای گفتوگۆی نێوان کادیران، لێرەشدا هەڵگرانی هەردوو بیر و بۆچوونەکە بۆ پاڵشتی بۆچوونەکانیان، لە کاتی گفتوگۆکاندا بەڵگەی پێویستیان هێناوەتەوە. ئەوەتە یەکێك لەو کەسایەتییانەی کە بیروڕای عێراقییانەی هەبووە دەڵێت:" ... **ئێمە لە ڕووی تیۆرییەوە سەیرمان**

**دەکرد کە مارکس دەڵێت: لە وڵاتێکدا ئەگەر دوو حیزبی شیوعی هەبێت دەبێت یەکێکیان ئینتیهازی بێت، بۆیە ئێمە دەمان وت نابێت دوو حیزبی شیوعی هەبێت لە عێراقدا..."** [٦٠]. بەڵام لایەنگرانی کوردستانی وا بۆ مەسەلەکە چووبوون کە کوردستان بارودۆخێکی جیاوازی هەیە، لەبەر ئەوەی ئەرکەکانی قۆناغی ڕزگاریی نیشتمانی تەواو نەبووە، بەڵام لە ناوەڕاست و خوارووی عێراق هەندێك لە ئەرکەکانی قۆناغی نیشتمانی تەواو بووە، بۆرژوازی بچووك (بۆرژوازی نیشتمانی) هەنگاوی بۆ سەربەخۆیی خۆی ناوە و هەندێ لە کاری ئابووری جێبەجێ کردووە، بەڵام لە کوردستاندا ئەو شتانە نەکراون، هەروەها کوردستان بووە بە پاشکۆی دەوڵەتی عێراق، بەمەش ناکۆکییەکان چڕبوونەتەوە، بۆیە دەبوو خەباتی چینایەتی و خەباتی نەتەوایەتی بە یەکەوە گرێ بدرێن، چونکە لە عێراقدا نەتەوەی سەردەستە کە عەرەبە کار بۆ تواندنەوەی نەتەوەی ژێر دەستە دەکات، کە کوردە. بۆیە لە باشووری کوردستانی ژێر دەستەدا، پێویستە کار بۆ ڕێکخراوێکی پتەو بکرێت تا لەو ڕێگایەوە وەڵامی بارودۆخ و پێشهاتەکان بدرێنەوە [٦١].

مەسەلەی ناکۆکی و ململانێیەکان ماوەیەك ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەیان بە خۆیانەوە خەریك کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش هەوڵی چارەسەرکردن و یەکلاکردنەوەی مەسەلەکە دراوە، لەم بارەیەوە بیروڕای جیاواز لە سەرچاوەکاندا بەدی دەکرێن، کاتێك بەشێك لە سەرچاوەکان پێیان وایە کە ئەو مەسەلەیە بە شێوەیەکی ئاسایی و دیموکراتییانە چارەسەر کراوە، بەوەی کە سەرکردایەتیی کۆمەڵە لە ناو ڕێکخستنەکانیدا بابەتەکەی خستووەتە ڕاپرسییەوەو، ئەنجامی ڕاپرسییەکەش بەوە کۆتایی هاتووە کە زۆربەی زۆری ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لەگەڵ ئەوەدا بوون، کە ڕێکخراوەکەیان ڕێکخراوێکی کوردستانی بێت و خەبات لەسەر ئاستی کوردستان بکات [٦٢]. کەچی سەرچاوەیەك پێیوایە کۆمەڵە یەك لایەنانە بڕیاری خۆی داوە، بابەتەکەی لە بەرژەوەندیی کوردستانییەکان یەکلا کردۆتەوە [٦٣]. لێرەشدا دەتوانرێت بووترێت ئەوەی یەکەمیان ڕاستترە، لەبەر ئەوەی سەرباری ئەوەی کە زۆربەی ئەوانەی هەڵگری بیری کوردستانین ئاماژە بە

بوونی ڕاپرسییەکی لەو شێوەیە دەکەن، تەنانەت فوئاد قەرەداغیش کە یەکێك بووە لەوانەی لەگەڵ دامەزراندنی ڕێکخراوێکی سەرتاسەری عێراقی بووە، ئەنجامدانی ڕاپرسییەکە پشت ڕاست دەکاتەوە(٦٤).

لە ڕاستیدا، بە چوونە دەرەوەی گرووپی (عێراقییەکان)، مانای ئەوە نییە کێشە و جیاوازییە فکرییەکان و ناکۆکییەکان لە ناو کۆمەڵەدا کۆتاییان هاتووە و، هەموو بەیەك شێواز بیریان کردۆتەوە. بەڵکو لە ناو کۆمەڵەدا هەم کێشە و هەمیش بیروڕای جیاواز بوونیان هەبووە، وەك:

یەکەم: دوورکەوتنەوەی جەلال تاڵەبانی سکرتێری کۆمەڵە و چوونی بۆ دەرەوەی وڵات، کە وای کردووە پەیوەندی و ڕاسپاردەکانی تەنیا لە ڕێگای گۆڕینەوەی نامەوە بێت، کە ئەمەش یەکێك لە کێشەکانی کۆمەڵە بووە.

دووەم: سەردانی شەهاب شێخ نووری لە کۆتاییەکانی ١٩٧٢ بۆ بەیرووت و شام (دیمەشق) بۆ لای جەلال تاڵەبانی، کە یەکێك لە سەرچاوەکان هۆکاری سەردانەکە بۆ تێڕوانینی جیاوازی هەر یەك لە جەلال تاڵەبانی و شەهاب شێخ نووری دەگێڕێتەوە، لەبەر ئەوەی دووەمیان مەسەلەی خەباتی چینایەتی بە لایەوە گرنگتر بووە و، لە ژێر کاریگەریی (تێزی سێ جیهانی) (٦٥)یشدا لە ڕیزبەندی ناکۆکییەکاندا ڕژێمی ئەوکاتەی عێراقی بە ناکۆکی لاوەکی زانیوە، کە ئەمەشیان لای تاڵەبانی جێگای نیگەرانی بووە، چونکە لای تاڵەبانی مەسەلەی خەباتی نەتەوایەتی زاڵتر بووە(٦٦). لەم بارەشەوە تاڵەبانی دەڵێت:**"ساڵی ١٩٧٢ لە بەیرووت بووم نامەیەکم نارد بۆی [مەبەستی شەهاب شێخ نوورییە— توێژەر] تا سەردانێك بکات، نیازم ئاڵوگۆڕی بیروڕا و شێوەی نوێ کارکردن بوو"**(٦٧).

سێیەم: لە نێو کادیرەکاندا گفتوگۆی چڕ لەسەر بابەتە فکرییەکان کراوە، ئەمەش وای کردووە بەشێك پێیان وابێت کە پشت بەستن بە تێزەکانی ماو تسی تۆنگ بەس نییە بۆ وەڵامدانەوەی هەموو پرسەکان، بۆیە پێویست دەکات بگەڕێنەوە بۆ سەرچاوە ڕەسەنەکانی مارکسیزم— لینینزم. لەم بارەیەشەوە یەکێك لە سەرچاوەکان دەڵێت:**" لە یەکێك لە کۆبوونەوەکاندا بابەت و باسێك هاتە پێشەوە لەسەر بورجوازی نیشتمانی، ئایا بوونی هەیە، لەبەر ئەوەی خاوەنی**

**بەشێك لە سەرمایەیە ئەگەرچی سەرمایەكە كەمیش بێت، ئیتر وا دەركەوت كە ئێمە دژی ئەو شیكردنەوەی چینایەتییەین كە ماوتسی تۆنگ باسی دەكات، چونكە ئێمە پێمان وابوو چینی بۆرجوازی خەسڵەتی نیشتمانی لە دەست نامێنێت...ئەبو شەهاب وتی بۆ ئەوەی لەو مەسەلەیە تێ بگەین دەبێت واز لە ماوتسی تۆنگ بێنین، چونكە ماو و ستالین لقن. دەبێت بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوە ڕەسەنەكانی ماركسیزم و لینینزم، بەمەش من گەڕامەوە بۆ خوێندنەوەی سەرچاوە سەرەكییەكان..."** (٦٨). هەروەها هەر لەم ڕووەوە سەرچاوەیەكی دیكە ئاماژە بۆ ئەوە دەكات و دەڵێ: **"...من ئەو كاتە هەندێ حەزەرم لەسەر ماوتسی تۆنگ هەبوو، پێم وابوو دەبێت كۆمەڵە كتێبەكانی ماركس و لینین بخوێنێتەوە، بەڵام كاك نەریمان مەحموود [بەرپرسی ڕێكخستنەكانی ئەو كاتەی كۆمەڵە لە خانەقین– توێژەر] ئەو قسانەی بەدڵ نەبوو، ... هەر ئەوەش وای كرد لەسەر بیروڕای جیاواز ناكۆك بین..."** (٦٩).

چوارەم: بە تەنگەوە نەهاتنی ئەندامانی كۆمەڵە لەسەر مەسەلەی پاراستنی نهێنییەكان، هەم لە بێ باكی ئەندامەكانییەوە، هەمیش لە تێخزینی جۆرە كەسانێك كە دەنگوباسی ڕێكخستنەكانی كۆمەڵەیان دەگواستەوە، ئەمەش وای كرد هەم حكومەت و دەزگا هەواڵگرییەكانی گومان دروست بكەن، هەمیش دەزگاكانی پارتی دیموكراتی كوردستان و (پاراستن) بكەونەوە هەواڵ پرسین و لێكۆڵینەوە لە كارو چالاكییەكانیان(٧٠).

ئەگەرچی ناكۆكییە ناوخۆییەكان ماوەیەك ڕێكخستنەكانی بە خۆیانەوە خەریك كرد، بەڵام كۆمەڵە بەردەوام بوو لەسەر پەرەپێدان بە ڕێكخستنەكانی، بە تایبەت لە ڕێگای ئەڵقە ڕۆشنبیرییەكانییەوە، كە هەم مەبەست تیایدا گەشەكردنی ڕێكخستنەكان بوو، هەمیش زیاتر پەروەردەكردنی كادیرەكان بوو بە بیری چەپگەرایی. لەم چوارچێوەیەشدا لە چەندین وێستگەی جیاوازەوە دەستكرا بە خوێندنەوە و لێكۆڵینەوە لەو كتێبانەی كە تایبەت بوون بە فكری چەپ. لێرەشدا دەتوانرێت بووترێت بەرنامەی خوێندنەوەی كتێبەكان چەندە مەبەست ئاشنابوون بوو بە بیروباوەڕی چەپگەرایی، هێندەش بە گرنگ ناساندنی ئەو بەرنامەیە بوو كە

کۆمەڵـە لـە سـەرەتاوە بـڕوای پێـی بـوو و هـەنگاوی بـۆ هـەڵهێنا، کـە ئـەویش دامەزرانـدنی پـارتێکی پێشـڕەو، بەرەیـەکی نیشـتمانی و لەشـکرێکی ڕزگـاریی نیشتمانی بوو، تاوەکو جڵەوی خەبات و تێکۆشانی شۆڕشێکی درێژخایەن بگرێـتە دەست.

هـەر لـەم ماوەیـەدا کۆمەڵـە بەمەبەسـتی پەرەسـەندیی لایـەنی چـۆنایەتی ڕێکخسـتنەکانی جگـە لـە خوێندنـەوە لـە نـاو ئەڵقـە ڕۆشـنبیرییەکان، خـولی بـۆ کادیرەکان کردۆتەوە. لە چوارچێوەی ئەم هەنگاوەشدا لە تەمووزی ١٩٧٢ یەکـەم خولی کادیران لە ماڵی کادیرەکانی کۆمەڵەدا لە سلێمانی کراوەتـەوە و بـۆ مـاوەی زیاتر لە سێ مانگ بەردەوام بوو، کە تیایدا هەم سەرچـاوەکانی تایبـەت بـە بـیری چەپ دەخوێندرا، هەمیش بابەتە فکرییەکان تاوتوێ دەکرا[٧١]. ئەوە لە لایەك، لـە لایەکی دیکەشەوە لەبەر ئەوەی زۆرێـك لـە ئەنـدامی کۆمەڵـە لـە نـاو ئۆرگانـەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان ڕۆڵیان هەبوو، کەوتوونەتە هـەوڵی ئـەوەی سـوود لـە پێگەکانیان وەربگرن بۆ مەبەسـتی بڵاوکردنـەوەی بـیر و بۆچـوون و پەرەسـەندنی ڕێکخستنەکانیان، بە تایبەت ئەگەر بزانین لە کاتی ئەنجامدانی ئۆردوگای هاوینـان لە لایەن یەکێتی قوتابیانی کوردستانەوە، سەرباری ئەوەی ئەنـدامانی کۆمەڵـە لـە ناو ڕێکخراوەکـەدا ڕۆڵیـان لـە ئەنجامدانیانـدا هـەبووە، هـانی ئەندامانیشـیان داوە بەشداری تیادا بکەن[٧٢]. لەم بارەشەوە یەکێك لە سەرچاوەکان دەڵێت:" **لە ساڵی ١٩٧٢ کـە بڕیـاری کردنـەوەی ئۆردوگـای قوتابیـان لـە ناوچـەکانی کـەرکوك و خانەقین درا، بە مەبەستی هۆشیارکردنەوە و تێگەیاندنی خەڵکانی ئەو ناوچانە لە مەسەلەی گەلەکەمان، داڕێژەری فیکرەکە لە ڕاستیدا ئێمـە بـووین [مـە بەسـتی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەیە– توێژەر]، دیارە ئەوەشمان بۆیە هەڵبژارد بەو نیازەی لەم ڕێگایەوە زیاتر بچینە ناو جووتیارانی کوردستانەوە هەم لەگـەڵ ژمارەیـەکی زۆر قوتابیاندا شەوانە و ڕۆژانە تێکەڵاو ببین و بەو تێکەڵاوبوونـەمان بیروبـاوەڕی کۆمەڵە لەناویاندا بڵاوبکەنەوە**"[٧٣].

جێگای ئاماژە بۆ کردنە، کۆمەڵە لە سەرەتاوە خاوەنی بڵاوکراوەیەك نەبووە کـە وەك زمانحـاڵی ڕێکخراوەکـە هەڵوێسـتەکانی تیایـدا دەربـبڕێـت، بـەڵام دواجـار

سەرکردایەتی بڕیاری دەرکردنی بڵاوکراوەیەك بە ناوی (ئاڵای سوور)ەوە دەدات و سێ ژمارەی لێ بڵاودەکاتەوە[٧٤]. لێرەشدا لە سەرچاوەکاندا دەربارەی ڕێکەوتی دەرچوونی ژمارەکانی ئاڵای سوور و سەرپەرشتیارەکەی جیاوازیی بەدی دەکرێت، لە کاتێکدا یەکێك لە سەرچاوەکان پێی وایە کە ڕۆڵی سەرەکی لە دەرکردنی ئەو بڵاوکراوە شەهاب شێخ نووری بووە[٧٥]، بەڵام سەرچاوەی دیکە هەن ڕۆڵەکە بۆ فەرەیدوون عەبدولقادر دەگێڕنەوە[٧٦]. ئەوە لە لایەك، لە لایەکی دیکەوە سەرچاوەیەك پێی وایە یەکەم ژمارەی ئاڵای سوور لە تەمووزی ١٩٧٣ و دووەم ژمارەی لە تشرینی دووەمی هەمان ساڵ و، سێیەم ژمارەشی لە کانوونی دووەمی ١٩٧٤ دەرچووە[٧٧]، کەچی سەرچاوەیەکی دیکە مێژووی دەرچوونی یەکەم ژمارە بۆ کۆتاییەکانی ١٩٧٢ و، ژمارەی دووی بۆ شوباتی ١٩٧٣ و ژمارە سێیەمیش بۆ شوباتی ١٩٧٤ دەباتەوە[٧٨]. لێرەشدا دەتوانرێت بووترێت ئەو سەرچاوەی کە سەرپەرشتیاری بڵاوکراوەکە بۆ فەرەیدوون عەبدولقادر دەباتەوە ڕاستترە، بە بەڵگەی ئەوەی یەکەم ژمارەی بڵاوکراوەکە لە کەرکووك دەرچووە، کە ئەو کاتە فەرەیدوون عەبدولقادر سەرپەرشتیاری ڕێکخستنەکانی کەرکووك بووە[٧٩]، هەروەها لە کۆتاییەکانی ١٩٧٢ تا کۆتاییەکانی ١٩٧٣ شەهاب شێخ نووری لە بێرووت و شام لای جەلال تاڵەبانی بووە، ئەوە سەرباری ئەوەی فەرەیدوون عەبدولقادر خۆیشی دەڵێت ئاڵای سوور لە لایەن ئەوەوە بەڕێوەبردراوە[٨٠]. ئەوە لەلایەك، لە لایەکی دیکەوە زانیارییەکانی ئەو دوو سەرچاوەیە کە ئاماژە بە مێژووی دەرچوونی ژمارەکانی ئاڵای سوور دەکەن، جێگای هەڵوەستە لەسەر کردنن، لەبەر ئەوەی یەکێکی وەك سەلاح خرسان ئەندامی ئەو ڕێکخراوە نەبووە، بەڵکو زانیارییەکانی لە دەستی دووەم وەرگرتووە و ژمارەکانی نەبینیوە، هەروەها برایم جەلالیش کە باس لە بڕیاری دەرکردنی بڵاوکراوەکە دەکات، ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە لە کۆبوونەوەیەك لە کەرکووك لە حوزەیرانی ١٩٧٣ بە ئامادەبوونی شەهاب شێخ نووری و ژمارەیەکی دیکەی سەرکردایەتی و کادیرانی کۆمەڵە بڕیاری لەسەر دراوە[٨١]، کە بە قسەی زۆرێك لە سەرچاوەکان شەهاب شێخ نووری ئەوکاتە لە دەرەوە لای جەلال تاڵەبانی بووە.

کۆمەڵــە بــەر لــە دەرکردنــی ئــاڵای ســوور و دواتــریش، بــۆ دەرخســتنی هەڵوێستەکانی لـە بەرانبـەر ڕژێمـەکانی ناوچـەکە و جیهـان و ئـەو ڕووداوانـەی کـە دەهاتنە پێشەوە، ڕێچکەی دەرکردنی نامیلکە و نووسینی بابەتی گرتبووە بەر بـۆ هەریـەك لـە ڕووداوەکـان، بـۆ ئـەوەی هـەم ڕای خـۆی لـە بارەیانـەوە دەربخـات، هەمیش ڕێکخستنەکانی لێ ئاگادار بکاتەوە. لـەم چوارچێوەیەشـدا هەڵسـەنگاندنی بۆ هەر یەك لە وڵاتە داگیرکارەکانی کوردستان (عێراق، ئێران و تورکیا) کردووە و، سەرنجی خۆی لە بارەی دەسەڵاتدارانی وڵاتانی عەرەبی و هەڵوێستیان لە بەرانبەر کێشەی فەڵەستین نووسیوە. ئەوە سەرباری ئەوەی تێڕوانینی خۆی بـۆ هـەر یـەك لە سیاسەتی وڵاتـانی بلـۆکی ڕۆژئـاوا و بلـۆکی ڕۆژهـەڵات دەربڕیـوە[٨٢]. لێرەشـدا ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەیە، سەرباری ئەوەی کۆمەڵە فکری ماوی قبـوڵ بـووە و، پێشی وابووە کە چاکترین نموونە ئەزموونی چینە- بۆ ئەوەی کورد لـە خـەباتی ڕزگاریی نیشـتمانیی خۆیـدا پـەیڕەوی بکـات، کەچـی هـەم لەسـەر ئاسـتی نـاوخۆ هەمیش لەسەر ئاستی دەرەوە ڕەخنەی لە سیاسـەتی چـین گرتـووە، بـە تایبـەت لەسەر مەسەلەی شۆڕشی ڕۆشنبیری، بەستنی پەیوەندیی دیپلۆماسی لەگـەڵ ئێـران و[٨٣]، پشـتیوانیکردن لـە کودەتـای (پێنۆشـێ) و قەسـابخانەکەی سـاڵی (١٩٧٣)ی چیلی[٨٤].

جێگای ئاماژە بۆ کردنە، هەر لە سـەروبەندی کـارو چـالاکییەکانی کۆمەڵـە و دەرخستنی هەڵوێسـتەکانی، کۆمەڵـە بـە نووسـینی نامیلکەیـەك هەڵوێسـتی خـۆی لەسەر هەنگاوی خۆماڵیکردنی نەوت دەردەبڕێت، کاتێك حکومـەتی عێـراق لـە ١ی حوزەیرانی ١٩٧٢ بڕیاری خۆمـاڵیکردنی نـەوت دەدات. سەرچـاوەیەك پێیوایـە لـە نامیلکەکەدا، کۆمەڵە پشتگیریی خۆماڵیکردنی نەوتی کردووە و بە دەسـتکەوتێکی گرنگـی دانـاوە[٨٥]، بـەڵام سەرچـاوەیەکی دیکـە ئەمـە ڕەت دەکاتـەوە و دەڵێـت: **"کۆمەڵە ڕەتی خۆماڵی کردنی نەوتی کرد و بە ٣ بەڵگە ڕوونی کردەوە، کە نەوتی عێراقی خۆماڵی نەکراوە، بەڵکو بە بەعسی کراوە"**[٨٦]. چونکە کۆمەڵە پێی وابوو خۆمـاڵیکردنی نـەوت وەك یـەکێك لـە ئەرکـەکانی شۆڕشـگێڕی نیشـتمانی کاتێـك دەکرێت، کە شۆڕشێکی ئابووری، سیاسـی، کۆمەڵایـەتی و فەرهـەنگی بـە ئـەنجام

دەگەیـەنرێت، واتـە لـە ڕووی ئابوورییـەوە شـێوەی بەرهـەمهێنان و پەیوەنـدی بەرهەمهێنان دەگـۆڕدرێن بـۆ هێـزی بەرهـەمهێنان. بـەڵام ئـەوەی لـەو هـەنگاوەی حکومەتەوە تێبینی دەکرا، خۆماڵیکردنی نەوت لە لایەن چینێکی باڵا دەستی نـاو پارتی دەسەڵات بە شێوەیەکی تاکڕەوانە بڕیاری لێدراوە، بێ ئـەوەی بـۆ بـیروڕای گـەل بگەڕێنـەوە و، هـیچ جـۆرە گۆڕانێـك لـە شـێوەی هێزەکـانی بەرهـەمهێنان و پەیوەندیی بەرهەمهێنان ئەنجام بدەن، بەڵکو بە پێچـەوانەی ئـەوەوە کەوتوونەتـە دەرکردنی کرێکارە کوردەکان و نیشتەجێکردنی کرێکارە عەرەبەکان لە شوێنیان، ئەمە سەرباری ئەوەی سەرمایەی نەوتەکەش تەنیا بۆ کڕینی چـەك و بـەهێزکردنی جبەخانـەکانیان بـەکار دەهێـنن، هـەروەها کۆمەڵـە پێـی وابـوو کاتێـك سـامانی سروشتی بە نەوتیشەوە خۆماڵی دەکرێت، کە بـە حـوکمی گـەل و یاسـای گـەل و بڕیاری گەل ئەنجام درابێت و، لـە پێنـاوی سـوود و بەرژەوەنـدیی زۆرینـەی گەلـدا بێت، چونکە ئەو دەمە بە شێوەیەکی تەواو لە ژێر دەستی کۆمپانیـا مۆنۆپۆلـەکان دەهێنرێتە دەرەوە. لە ڕوویەکی دیکەوە کۆمەڵە پێی وابووە خۆمـاڵیکردنی نـەوت کاتێك دەکرێت کە پێشەکی نەخشەی بۆ چۆنییەتی دۆزینەوەی بازاڕی ئـازاد و بـێ داسەپاندنی دانرابێت و، بۆ ئـەوەی بتوانرێـت سـەربەخۆیی و سەربەسـتی کـڕین و فرۆشـتنی لـە دەسـت نـەدرێت و، تاسـەر بەرانبـەر بـەپلان و نەخشـەی وڵاتـانی سـەرمایەدار بوەسـتێت و تووشـی گەنـدەڵی و قـەیرانی ئـابووری نەیـەت. بەمـەش کۆمەڵە وای بۆ دەچـوو کـە حکومـەتی عێراقـی نـەك هـەر خـاوەنی ئـەو نەخشـە و بیرکردنەوەیـە نـەبووە، بـەڵکو خۆماڵیکردنەکـەش تـەنیا بـۆ هەڵوێسـت فرۆشـتن و بڕیارێکی سەر پێیی بووە. ئەوە لە لایـەك، لـە لایـەکی دیکـەوە ئـەوەی (کۆمەڵـە) تێبینـی لەسەر هەبوو بەزرکردنەوەی دروشمـی (نـەوتی عـەرەب بـۆ عـەرەب) بـوو، ئەمەش لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کـە نـەوتی عـەرەب تـەنیا هـی عـەرەب نییـە، بەڵکو هی گـەلانی عێراقیشـە، هـەروەها بـوونی نـەوت لـە عێـراق تـەنیا لـە ناوچـە عەرەبییەکاندا نییە، بەڵکو لە ناوچـە کوردستانییەکانیشـدا هەیـە، بۆیـە ڕەوا بـوو بووترایە (نەوتی عێراق بۆ عێراقییەکان)ە [٨٧].

شایەنی باسە، کۆتاییەکانی ١٩٧٣ بە گەڕانەوەی شەهاب شێخ نووری ڕێکخستنەکان و پەیوەندییەکان گەرموگوڕییەکی دیکەیان تێ کەوتەوە، لە کاتێکدا شوێنی حەوانەوە بۆ شەهاب شێخ نووری لە کەرکووك وەکو ناوەندی کاری کۆمەڵە دیاری کرا و، ناوبراویش کەوتەوە سەرپەرشتیکردنی کۆبوونەوەکان و چارەسەرکردنی کێشەکان. بە تایبەت ئەگەر بزانین لەم ماوەیەدا ژمارەیەکی بەرچاو کۆبوونەوە لە کەرکووك کراوە، هەروەها بۆ هەمان مەبەستیش شەهاب شێخ نووری سەردانی سلێمانی و هەولێری کردووە و، هەوڵی پەرەپێدانی ڕێکخستنەکانی لە ناو چینی کرێکاران و جووتیاران داوە[٨٨]. بەڵام بارودۆخەکە هێندەی نەخایاندووە پەیوەندییەکانی نێوان ڕژێمی عێراق و سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول بارگرژی تێ کەوتووە و ئەنجام لە ١١ی مارتی ١٩٧٤ شەڕ لە نێوان هەردوولا دەستی پێکردۆتەوە، لەم چوارچێوەیشدا کۆمەڵە بڕیاری بەشداربوون لە خەباتی چەکداریدا لە تەك شۆڕشی ئەیلوولدا دەدات.

**ئەنجام**

كۆمەڵەی ماركسیی– لینینیی كوردستان لە سەرەتای دامەزراندنییەوە لە ژێر ناوی پەیوەستبوون بە ئایدیۆلۆژیای ماركسیزم– لینینزم، فكری ماو تسی تۆنگ دەستی بە كارەكانی كردووە، بەڵام بێ ئەوەی بەرنامەی كاركردنی ئەنجامدانی بزووتنەوەی چینایەتی بێت و، ئامانجی دەستەبەركردنی مافی كرێكاران و زەحمەتكێشان بێت. بەڵكو ئامانجی بریتی بووە لە ئەنجامدانی بزووتنەوەیەكی ڕزگاریی نیشتمانی، بەمەش تەنیا ئەو خاڵەی كە ئەو ڕێكخراوە لەوانەی پێش خۆی جیا دەكاتەوە داننان بووە بەوەی كە جووتیاران و كرێكاران و زەحمەتكێشان هێزی كاریگەر و لە بن نەهاتوون، ئەوانن دەتوانن بزووتنەوەی ڕزگاریی نیشتمانی سەربخەن.

لەگەڵ ئەوەی لەدایكبوون و دامەزراندنی كۆمەڵە لە سەرەتای حەفتاكانی سەدەی بیستەمدا وەرچەرخانێكی گرنگ بووە لە ڕەوتی بزووتنەوەی فكری چەپ لە باشووری كوردستاندا، بەڵام هەر لە سەرەتاوە لە ناو هەناوی خۆیدا دەیان كێشمەكێش و ناكۆكی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە، ئەمەش وای كردووە هەر لە قۆناغی یەكەمی كاركردنیدا تووشی جیابوونەوەی بەشێك لە ئەندامەكانی بێت.

كۆمەڵە لەگەڵ ئەوەی بڕوای بە دامەزراندنی پارتی پێشڕەو، بەرەی نیشتمانی و لەشكری ڕزگاریی نیشتمانی هەبووە، وەك سێ كۆڵەگەی سەرەكیی سەركەوتنی بزووتنەوەی نیشتمانی سەیری كردووە، بەڵام لەم قۆناغەدا لەبەر نهێنیی كاركردنی نەیتوانیوە بە كردارەكی هەنگاو بۆ هیچ یەكیان بهاوێت و كاریان بۆ بكات.

## پەراوێز و سەرچاوەکان

(١) لە ١٧ی ئەیلوولی ١٩٦٧ پارتی کۆمۆنیستی عێراق لە ژێری کاریگەریی ململانێ و ناکۆکییەکانی نێوان چین و یەکێتیی سۆڤیەت لە ناوخۆیاندا بوون بە دوو بەشەوە، بەشێکیان لە ژێر ناوی سەرکردایەتی ناوەندی (القيادة المركزية)، ئەوەکەی تریشیان لە ژێر ناوی لێژنەی ناوەندی (اللجنة المركزية) لە کارەکانیان بەردەوام بوون. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: عزيز سباهي، عقود من تاريخ الحزب الشيوعي العراقي، الجزء الثالث، (دمشق، ٢٠٠٥)، ص ص ٧١–٧٢؛ جاسم الحلوائي، محطات مهمة في تاريخ الحزب الشيوعي العراقي، (دون مكان وسنة الطبع)، ص ص٢٤٢–٢٤٥.

(٢) "بۆچی وەرزەنامەکەمان ناوی نراوە کۆمەڵە"، گۆڤاری "کۆمەڵە"، ژمارە (٢)، وەرزی یەکەم، ئۆرگانی ناوەندی کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان، بێ شوێنی چاپ، زستانی ١٩٧٨، ل١١؛ "فوئاد قەرەداغی، مێژووی دامەزراندنی کۆمەڵەی مارکسی– لینینی دەگێڕێتەوە"، بەشی یەکەم، سازدانی: کەمال رەئووف، ڕۆژنامەی "هاوڵاتی"، ژمارە (٤١١)، سلێمانی، ٢٠٠٨/٤/٦، ل٤؛ "چاوپێکەوتن لەگەڵ ئاسۆ شێخ نووری"، ئامادەکردنی: محەمەد مێرگەسۆری، ڕۆژنامەی "کوردستانی نوێ"، ژمارە (٥٦٤٧)، سلێمانی، ٨/١٢/ ٢٠١١، ل ل١٢ –١٣.

(٣) عارف کەریم، یەکیەتی نیشتمانیی کوردستان دوێنێ، ئەمڕۆ و سبەی! چەند وێستگەیەك لە ئەزموونی سیاسیمدا، (ستۆکهۆڵم، ٢٠٠٩)، ل١٦.

(٤) ڕزگاری گۆڤارێکی گشتی هەفتانە بوو لە سلێمانی دەردەچوو، خاوەنی ئیمتیازی نەوشیروان مستەفا و سەرنووسەرەکەشی شازاد سائیب بوو، ژمارەی یەکەمی لە ٢٠ی نیسانی ١٩٦٩ دەرچوو، دواتر بەردەوام بوو تا دوا ژمارەی کە (١٥) بوو لە ٢٧ی مارتی ١٩٧٠ دەرچوو. جەمال خەزنەدار، رابەری رۆژنامەگەری کوردی، (بغداد، ١٩٧٣)، ل١٠٤.

(٥) ڕێبوار ئەحمەد، لە ماویزمەوە بۆ حیکمەتیزم: ڕەوتی سەرهەڵدان و گەشەی چەپ و کۆمۆنیزمی هاوچەرخی عێراق لە کۆتایی ساڵانی ١٩٦٠ تا ٢٠٠٠، (بێ شوێنی چاپ، ٢٠١١)، ل٢٠.

(٦) "فوئاد قەرەداغی مێژووی دامەزراندنی کۆمەڵەی مارکسی– لینینی دەگێڕێتەوە"، بەشی یەکەم، ل٤؛ تالیب مۆریاسی، گەڕان بەدوای ڕاستیدا یاداشتنامەی پێشمەرگەیەکی ماندوونەناس، ڕووداوەکانی نێوان ساڵانی ١٩٥٣– ١٩٩٦، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، (هەولێر، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، ٢٠٠٨)، ل٨٦.

(٧) محەمەد شێخ عەبدولکەریم سۆڵەیی، ئارام و بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی کورد، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، (سلێمانی، چاپخانەی کارۆ، ٢٠٠٨)، ل ل٢٧٨–٢٧٩؛ برایم جەلال، چەپکێك لە مێژووی کۆمەڵە، (سلێمانی، چاپخانەی ڕوون، ٢٠١١)، ل ١٧.

(٨) فوئاد قەرەداغی، "دیسان دەربارەی نووسینەوەی مێژووی کۆمەڵە"، بەشی دووەم، ڕۆژنامەی "هاوڵاتی"، ژمارە (٤٣٧)، سلێمانی، ٢٠٠٨/٧/٦، ل١٨.

(٩) پشکۆ نەجمەدین، دیوی ناوەوەی ڕووداوەکان وەڵامێك بۆ نۆشیروان مستەفا، (هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ١٩٩٧)، ل٢٧؛ مەلا بەختیار، چۆن چەپکێك و کام مێژووی کۆمەڵە؟! خوێندنەوەیەکی مێژوویی بۆ (چەپکێك لە مێژووی کۆمەڵە)، بەرگی یەکەم، (سلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، ٢٠١٢)، ل٨٠.

(١٠) دیمانەیەك لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٣ی تەمموزی ٢٠١٢.

(١١) دیمانەیەك لەگەڵ فوئاد قەرەداغی، سلێمانی، ٣ی تەمموزی ٢٠١٢.

(١٢) ڕەفعەتی مەلا، ڕۆژە تەماوییەکان، پێداچوونەوە و داڕشتنەوەی: عەبدوڵڵا کەریم مەحمود، چاپی یەکەم، (سلێمانی، چاپخانەی کارۆ، ٢٠٠٨)، ل ٢٧.

(١٣) دیمانەیەك لەگەڵ سالار عەزیز، سلێمانی، ٣٠ی مایسی ٢٠١٢.

(١٤) دیمانەیەك لەگەڵ ئاوات عەبدولغەفور، سلێمانی، ٣٠ی مایسی ٢٠١٢.

(١٥) فەرەیدوون عەبدولقادر، لە بیرەوەرییەکانم لەگەڵ خاڵە شیهاب و هاوڕێکانی، چاپی یەکەم، ( کەرکووك، چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی، ٢٠١١)، ل ل ٢٥– ٢٦.

(١٦) دیمانەیەك لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٣ی تەمموزی ٢٠١٢.

(١٧) دیمانەیەك لەگەڵ سالار عەزیز، سلێمانی، ٣٠ی مایسی ٢٠١٢.

(١٨) مام جەلال، "چەند بیرەوەرییەك و شەهید شەهاب"، ڕۆژنامەی "کوردستانی نوێ"، ژمارە ( ٢٤٨)، هەولێر، ٢٢/١١/ ١٩٩٢.

(١٩) فەرەیدوون عەبدولقادر، لە بیرەوەرییەکانم لەگەڵ خاڵە شیهاب و هاوڕێکانی، ل ٢٦.

(٢٠) دیمانەیەك لەگەڵ ئاوات عەبدولغەفور، سلێمانی، ٣٠ی مایسی ٢٠١٢.

(٢١) دیمانەیەك لەگەڵ فوئاد قەرەداغی، سلێمانی، ٣ی تەمموزی ٢٠١٢.

(٢٢) دیمانەیەك لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سازدانی: ئاوات مەحمود سەعید، ڕۆژنامەی"میدیا"، ژمارە (٣٣٤)، ١٥/٤/٢٠٠٨، ل١١.

(٢٣) فەرەیدوون عەبدولڕەحیم عەبدوڵڵا، بارودۆخی سیاسیی کوردستان– عێراق ١١ی مارتی ١٩٧٠– ١١ی مارتی ١٩٧٤ "توێژینەوەیەکی مێژوویی– سیاسییە"، چاپی یەکەم، (هەولێر، چاپخانەی منارە، ٢٠٠٨)، ل١١٩.

(٢٤) دیمانەیەك لەگەڵ فوئاد قەرەداغی، سلێمانی، ٣ی تەمموزی ٢٠١٢.

(٢٥) دیمانەیەك لەگەڵ نەوشیروان مستەفا، سلێمانی، ٢٩ی مایسی ٢٠١٢.

(٢٦) دیمانەیەك لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٣ی تەمموزی ٢٠١٢.

(٢٧) دیمانەیەك لەگەڵ فوئاد قەرەداغی، سلێمانی، ٣ی تەمموزی ٢٠١٢.

(٢٨) "فوئاد قەرەداغی مێژووی دامەزراندنی کۆمەڵەی مارکسی– لینینی دەگێڕێتەوە"، بەشی دووەم، ڕۆژنامەی "هاوڵاتی"، ژمارە (٤١٢)، ل٤.

(٢٩) دیمانەیەك لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٣ی تەمموزی ٢٠١٢.

(٣٠) صلاح الخرسان، التيارات السياسية في كردستان العراق قراءة في ملفات الحركات والاحزاب الكردية في العراق ١٩٤٦–٢٠٠١، (بيروت، مؤسسة البلاغ للطباعة والنشر والتوزيع، ٢٠٠١)، ص ٣٢٨؛ سەروەر عەبدولڕەحمان عومەر، یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دامەزراندن و دەستپێکردنەوەی شۆڕش ١٩٧٥– ١٩٧٦، چاپی یەکەم، (سلێمانی، سەنتەری چاپ و پەخشی تەما، ٢٠٠٢)، ل ٨٥.

(٣١) بۆ زانیاریی زیاتر لەمەڕ ئەو کتێبە و ناوەڕۆکەکەی بڕوانە: جەلال تاڵەبانی، کوردایەتی و بزووتنەوەی ڕزگاری نەتەوایەتی گەلی کوردستان، چاپی سێیەم، (بێ شوێنی چاپ، چاپخانەی خەبات، ١٩٦٦).

(٣٢) دیمانەیەك لەگەڵ فوئاد قەرەداغی، سلێمانی، ٣ی تەمموزی ٢٠١٢؛ فەرەیدوون عەبدولقادر، لە بیرەوەرییەکانم لەگەڵ خاڵە شیهاب و هاوڕێکانی، ل ٢٨. صلاح الخرسان، لە کتێبی (التيارات السياسية في كردستان العراق) ١٠ی تەمموزی ١٩٧٠ بە مێژووی دامەزراندنی لە قەڵەم دەدات، کە لەوەدا نووسەر بە هەڵەدا چووە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: ص٣٢٨. سەرچاوەیەکی دیکە کەوتۆتە هەڵەوە و ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ساڵانی ١٩٧٠ –١٩٧١ بە شێوەی ئەڵقەی ڕۆشنبیری دامەزراوە. كاظم حبيب، لمحات من نضال حركة التحرر الوطني للشعب الكردي في كردستان العراق، الطبعة الثانية، (اربيل، دار ئاراس للطباعة والنشر، ٢٠٠٥)، ص٣٨٨. هەروەها سەرچاوەیەکی دیکە مێژووی دامەزراندنی کۆمەڵەی بە ٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٠ لە قەڵەمداوە، ئەوەشیان کەوتۆتە هەڵەوە و جێگۆڕکێی بە ڕۆژ و مانگەکە کردووە. تاڵیب مۆریاسی، گەڕان لە دوای ڕاستیدا...، ل١١٣.

(٣٣) دیمانەیەك لەگەڵ فوئاد قەرەداغی، سلێمانی، ٣ی تەمموزی ٢٠١٢؛ دیمانەیەك لەگەڵ ئاوات عەبدولغەفور، سلێمانی، ٣٠ی مایسی ٢٠١٢؛ دیمانەیەك لەگەڵ سالار عەزیز، سلێمانی، ٣٠ی مایسی ٢٠١٢.

(٣٤) دیمانەیەك لەگەڵ فوئاد قەرەداغی، سلێمانی، ٣ی تەمموزی ٢٠١٢.

(٣٥) دیمانەیەك لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٣ی تەمموزی ٢٠١٢.

(٣٦) دیمانەیەك لەگەڵ ئاسۆ شێخ نووری، سلێمانی، ٢٨ی مایسی ٢٠١٢.

(٣٧) عارف کەریم، من کۆمەڵە و یەکێتی، ل ١٥.

(٣٨) دیمانەیەك لەگەڵ فوئاد قەرەداغی، سلێمانی، ٣ی تەمموزی ٢٠١٢. دلێر سدیق، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لە یەکێك لە کۆبوونەوەکان پرسیار لە جەلال تاڵەبانی کراوە بۆ دەستنیشانکردنی جێگری سکرتێر سەرەتا ئاماژەی بە ناوی فوئاد قەرەداغی و شەهابی شێخ نووری کردووە، بەڵام دواتر شەهابی شێخ نووری دانراوە. ناوەندی مێژوو: مەکتەبی سیاسی (ی.ن.ك)، کۆمەڵە لە سێدارەوە بەرەو راپەرین، (سلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، ٢٠١٢)، ل ٢١٥.

(٣٩) صلاح الخرسان، التیارات السیاسیة في کردستان العراق، ص ٣٢٨.

(٤٠) دیمانەیەك لەگەڵ فوئاد قەرەداغی، سلێمانی، ٣ی تەمموزی ٢٠١٢؛ دیمانەیەك لەگەڵ نەوشیروان مستەفا، سلێمانی، ٢٩ی مایسی ٢٠١٢؛ فەرەیدوون عەبدولقادر لە زەمینە و سەرەتا و دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دەدوێ، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، چاپی دووەم، (سلێمانی، مەکتەبی رووناکبیری، ٢٠٠٥)، ل٥٥.

(٤١) مام جەلال، چەند بیرەوەرییەك و شەهید شەهاب.

(٤٢) دیمانەیەك لەگەڵ نەوشیروان مستەفا، سلێمانی، ٢٩ی مایسی ٢٠١٢.

(٤٣) دیمانەیەك لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٣ی تەمموزی ٢٠١٢؛ کۆمەڵە لە زیندانەوە بۆ راپەرین، ل ٢١٤.

(٤٤) د. ئەرسەلان بایز، رۆژانی سەخت، (سلێمانی، ٢٠٠٥)، ل ٥.

(٤٥) "تیشکێك لەسەر خەبات و رێبازی کۆمەڵە"، گۆڤاری "راپەرین"، ژمارە (١)، ساڵی یەکەم، بێ ساڵ و شوێنی چاپ، ل ل ١–٢؛ راپەرین ئۆرگانی کۆمەڵەی مارکسی– لینینی کوردستان لە لایەن لقی ئەوروپاوە دەرچووە– ١٩٧٨، نەوزاد عەلی ئەحمەد کۆی کردۆتەوە و لەسەری نووسیوە، (کەرکووك، چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی، ٢٠١٣)، ل١٧.

(٤٦) "فوئاد قەرەداغی مێژووی دامەزراندنی کۆمەڵەی مارکسی– لینینی دەگێڕێتەوە"، بەشی دووەم، ل٤؛ "بۆچی وەرزەنامەکەمان ناوی نراوە کۆمەڵە"، ل١٢؛ رەوا، کومەلە والحزب الطليعي، من منشورات عصبة شغيلة كردستان (كومەڵە)، (دون مكان طبع، مطبعة الشهيد ابراهيم عزو، ١٩٨١)، ص ص٢١–٢٢.

(٤٧) دیمانەیەك لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٣ی تەمموزی ٢٠١٢؛ دیمانەیەك لەگەڵ ئاوات عەبدولغەفور، سلێمانی، ٣٠ی مایسی ٢٠١٢؛ دیمانەیەك لەگەڵ ئاسۆ شێخ نووری، سلێمانی، ٢٨ی مایسی ٢٠١٢.

(٤٨) دیمانەیەك لەگەڵ برایم جەلال، سلێمانی، ٢٦ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٢؛ دیمانەیەك لەگەڵ ئیحسان نەجم (ئەبو شەهاب)، سلێمانی، ٣ی تەمموزی ٢٠١٢.

(٤٩) کۆمەڵە لە سێدارەوە بەرەو راپەڕین، ل ل ٨٤،١٠١، ١٣٩، ١٤٥، ١٧٩، ٢١٣، ٣١٧؛ محەمەد شێخ عەبدولکەریم سۆڵەیی، مامۆستا عەزیز ژیانی پاك و شەهیدی دەستێکی ناپاك، چاپی یەکەم، (سلێمانی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ٢٠٠٤)، ل ل ٣٦، ٦٣؛ محەمەد شێخ عەبدولکەریم سۆڵەیی، مامۆستا جەمال تاهیر قارەمانی شۆڕش و زیندان، چاپی یەکەم، (سلێمانی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ٢٠٠٤، ل ل ٦٣، ل٧٤.

(٥٠) دیمانەیەك لەگەڵ ئاوات عەبدولغەفور، سلێمانی، ٣٠ی مایسی ٢٠١٢؛ دیمانەیەك لەگەڵ سالار عەزیز، سلێمانی، ٣٠ی مایسی ٢٠١٢؛ دیمانەیەك لەگەڵ برایم جەلال، سلێمانی، ٢٦ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٢.

(٥١) دیمانەیەك لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٣ی تەمموزی ٢٠١٢؛ دیمانەیەك لەگەڵ ئاوات عەبدولغەفور، سلێمانی، ٣٠ی مایسی ٢٠١٢؛ دیمانەیەك لەگەڵ ئاسۆ شێخ نووری، سلێمانی، ٢٨ی مایسی ٢٠١٢.

(٥٢) دیمانەیەك لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٣ی تەمموزی ٢٠١٢؛ دیمانەیەك لەگەڵ برایم جەلال، سلێمانی، ٢٦ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٢.

(٥٣) دیمانەیەك لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٣ی تەمموزی ٢٠١٢؛ دیمانەیەك لەگەڵ عومەری سەید عەلی، سلێمانی، ٢٦ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٢.

(٥٤) دیمانەیەك لەگەڵ ئاوات عەبدولغەفور، سلێمانی، ٣٠ی مایسی ٢٠١٢؛ دیمانەیەك لەگەڵ موحسین عەلی ئەکبەر (مامۆستا موحسین)، سلێمانی، ٢٧ی تەمموزی ٢٠١٢.

(٥٥) دیمانەیەك لەگەڵ سالار عەزیز، سلێمانی، ٣٠ی مایسی ٢٠١٢؛ دیمانەیەك لەگەڵ نەجمەددین فەقێ عەوڵا، سلێمانی، ١ی تەمموزی، ٢٠١٢.

(٥٦) دیمانەیەك لەگەڵ فوئاد قەرەداغی، سلێمانی، ٣ی تەممووزی ٢٠١٢؛ دیمانەیەك لەگەڵ ئاسۆ شێخ نووری، سلێمانی، ٢٨ی مایسی ٢٠١٢.

(٥٧) ڕێبوار ئەحمەد، لە ماویزمەوە بۆ حیکمەتیزم...، ل ٢١.

(٥٨) دیمانەیەك لەگەڵ فوئاد قەرەداغی، سلێمانی، ٣ی تەممووزی ٢٠١٢.

(٥٩) دیمانەیەك لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٣ی تەممووزی ٢٠١٢.

(٦٠) گفتوگۆیەك لەگەڵ ئەشرەف تاڵەبانی، ٢٠١٢/٨/٢٨، لە: (کۆمەڵە لە سێدارەوە بەرەو ڕاپەڕین، ل١٤٥)، وەرگیراوە.

(٦١) دیمانەیەك لەگەڵ عومەری سەید عەلی، سلێمانی، ٢٦ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٢؛ دیمانەیەك لەگەڵ ئاوات عەبدولغەفور، سلێمانی، ٣٠ی مایسی ٢٠١٢؛ دیمانەیەك لەگەڵ برایم جەلال، سلێمانی، ٢٦ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٢.

(٦٢) دیمانەیەك لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٣ی تەممووزی ٢٠١٢؛ دیمانەیەك لەگەڵ سالار عەزیز، سلێمانی، ٣٠ی مایسی ٢٠١٢؛ دیمانەیەك لەگەڵ عارف کەریم، سلێمانی، ٢٤ی کانوونی یەکەمی، ٢٠١٢.

(٦٣) گفتوگۆیەك لەگەڵ ئەشرەف تاڵەبانی، ٢٠١٢/٨/٢٨. لە: ( کۆمەڵە لە سێدارەوە بەرەو ڕاپەڕین، ل١٤٥–١٤٦) وەرگیراوە.

(٦٤) دیمانەیەك لەگەڵ فوئاد قەرەداغی، سلێمانی، ٣ی تەممووزی ٢٠١٢.

(٦٥) تێزی سێ جیهانی، یەکێك بوو لە داهێنانەکانی ماو تسی تۆنگ کە لە ڕێگای ئەو تێزەوە جیهانی ئەو کاتەی دابەش کردبووە سەر سێ جیهانی جیاواز. جیهانی یەکەم: بریتی بوون لە هەر دوو وڵاتە زلهێزەکەی ئەو دەمە: وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتیی سۆڤیەت، کە پێی وابوو هیچ جیاوازییەك لە نێوانیاندا نییە، لەبەر ئەوەی یەکەمیان ئیمپریالیزمە و ئەوەی دووەمیشیان سۆسیاڵ ئیمپریالیزمە. جیهانی دووەم بریتی بوو لە وڵاتانی سەرمایەداری پێشکەوتوو وەك ئینگلتەرا، ئەڵمانیای فیدراڵ، فەرەنسا، یابان و وڵاتانی سۆسیالیستی دیکە، کە باوەڕی بە سۆسیالیستی ئەوانەش نەبوو. جیهانی سێیەم، بریتی بوو لە وڵاتانی هەژار و نیمچە پێگەیشتوو، بەمەش ماو تسی تۆنگ لەبەر ئەوەی چینی بە ناوەندی شۆڕشگێڕیی دەزانی، بۆ ئەوەی ئەو ناوەندەشی بۆ بچێتە سەر، هاو شانی تێزە سیاسی و عەسکەرییەکانی پێویستی بە جیهانبینیی فراوانتر هەبوو تا ئەوەی بتوانێت ئینتەرناسیۆنالیزمی نوێ لە دەوری خۆیدا کۆبکاتەوە. بۆیە لە ئەنجامی لێکدانەوەی باری ئابووری و ئەو ناکۆکییانەی لەو بارە ئابوورییە جیهانییەوە سەری هەڵدابوو، تا

سەرلەنوێ لە ژێر ڕێبازێکدا ڕێکیان بخاتەوە، ناکۆکییەکانی دابەش کردە سەر چوار چەشن: یەکەم: ناکۆکی لە نێوان نەتەوە چەوساوەکان لە لایەك و لە نێوان ئیمپریالیزم و سۆسیال ئیمپریالیزم لە لایەکی دی. دووەم: ناکۆکیی نێوان پرۆلیتاریا و بۆرژوای وڵاتانی سەرمایەداری و سەر بە ڕیڤیژنیزم. سێیەم: ناکۆکیی نێوان دەوڵەتانی ئیمپریالی و دەوڵەتانی سۆسیالە ئیمپریالی، لە نێو خودی دەوڵەتانی ئیمپریالیدا. چوارەم: ناکۆکی لە نێوان دەوڵەتانی سۆسیالیستی لەلایەك و لە نێوان ئیمپریالیزم و سۆسیال ئیمپریالیزم لە لایەکی دیکە. فەرهەنگی سیاسی، لە بڵاوکراوەکانی بەشی راگەیاندنی مەڵبەندی سلێمانی و کەرکووکی حزبی شیوعی عیراق، (بێ شوێن و ساڵی چاپ)، ل ل ٤٩–٥٠؛ حیکمەت محەمەد کەریم (مەلا بەختیار)، شۆڕشی کوردستان و گۆرانکارییەکانی سەردەم، چاپی سێیەم، (هەولێر، چاپخانەی رۆشنبیری، ١٩٩٤) ل ل١٨١–١٨٢.

(٦٦) دیمانەیەك لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٣ی تەممووزی ٢٠١٢.

(٦٧) مام جەلال، "چەند بیرەوەرییەك و شەهید شیهاب".

(٦٨) دیمانەیەك لەگەڵ نەجمەددین فەقێ عەولا، سلێمانی، ١ی تەممووزی، ٢٠١٢.

(٦٩) دیمانەیەك لەگەڵ مامۆستا جەعفەر، سلێمانی، ٢ی تەممووزی ٢٠١٢.

(٧٠) دیمانەیەك لەگەڵ ئاوات عەبدولغەفور، سلێمانی، ٣٠ی مایسی ٢٠١٢؛ دیمانەیەك لەگەڵ عومەری سەید عەلی، سلێمانی، ٢٦ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٢؛ ئەرسەلان بایز، رۆژانی سەخت، ل ٥.

(٧١) برایم جەلال، چەپکێك لە مێژووی کۆمەڵە، ل ل٣٩–٤٠؛ چاوپێکەوتن لەگەڵ ئاسۆ شێخ نووری، ئامادەکردنی: محەمەد مێرگەسۆری، رۆژنامەی "کوردستانی نوێ"، ژمارە (٥٦٤٧)، سلێمانی، ١٢/٨/ ٢٠١١، ل ل١٢–١٣.

(٧٢) ئەرسەلان بایز، رۆژانی سەخت، ل٦.

(٧٣) سالار عەزیز، مامۆستا مەردانە ژیا و نەبەردانە شەهید بوو. لە: (محەمەد شێخ عەبدلکەریم سۆڵەیی، مامۆستا عەزیز ژیانی پاك و شەهیدی دەستێکی ناپاك، ل٦٤)، وەرگیراوە.

(٧٤) سەرچاوە هەیە پێی وایە کە تەنیا دوو ژمارەی ئاڵای سوور دەرچووە. دیمانەیەك لەگەڵ ئاسۆ شێخ نووری، سلێمانی، ٢٨ی مایسی ٢٠١٢؛ کاکل ئەحمەد (کاکلە ڕەش)، یەکێتی و ململانێ – توێژینەوەیەکی سیاسیی ڕەخنەییە لە بەشێکی

گرنگی شۆڕشی ڕزگاریخوازی گەلی کورد، چاپی یەکەم، (هەولێر، چاپخانەی شەهاب، ٢٠١١)، ل٩٧.

(٧٥) "بە بۆنەی وەرزەنامەی کومەڵەوە"، گۆڤاری "کۆمەڵە"، ژمارە (١)، پایزی ١٩٧٨، ل٢.

(٧٦) کۆمەڵە لە سێدارەوە بەرەو راپەڕین، ل ل ١٦٦ و ٢٧٤؛ دیمانەیەك لەگەڵ حەمید محەمەد کاکەمەند (حەمید شورتە)، کەرکووك، ٩ی شوباتی ٢٠١٣.

(٧٧) برایم جەلال، چەپکێك لە مێژووی کۆمەڵە، ل٣٥.

(٧٨) صلاح الخرسان، التیارات السیاسیة في کردستان العراق، ص٣٣٢.

(٧٩) دیمانەیەك لەگەڵ حەمە کەریم عەلی ڕەزا (ئەحمەد کرێکار)، کەرکووك، ٣ی شوباتی ٢٠١٣؛ کۆمیتەی ئاگر، سەرەتای دروستبوون و چالاکی و ئەنجام، رۆژنامەی (کوردستانی نوێ)، ژمارە(٥٩٠٦) سلێمانی، ٢٠١٢/١٠/١٦.

(٨٠) دیمانەیەك لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٣ی تەمموزی ٢٠١٢.

(٨١) برایم جەلال، چەپکێك لە مێژووی کۆمەڵە، ل ٥٠–٥١.

(٨٢) دیمانەیەك لەگەڵ ئاوات عەبدولغەفور، سلێمانی، ٣٠ی مایسی ٢٠١٢؛ دیمانەیەك لەگەڵ برایم جەلال، سلێمانی، ٢٦ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٢؛ دیمانەیەك لەگەڵ ئاسۆ شێخ نووری، سلێمانی، ٢٨ی مایسی ٢٠١٢ .

(٨٣) لە ١٦ی ئابی ١٩٧١ سەفیری چین و ئێران لە پاکستاندا ڕێکەوتنێکیان واژۆ کرد، لە بارەی دەستپێکردنی پەیوەندیی دیبلۆماسیی لە نێوان هەردوولادا، بەمەش لەم ڕێکەوتنەدا ئێران دانی نا بە کۆماری گەلی چیندا بەوەی کە تاکە حکومەتی شەرعییە لە چیندا. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە:

John W. Garver, China and Iran: Ancient Partners in a post- Imperial world, (U.S.A-Washington University, press 2006), P. 48.

(٨٤) بۆ زانیاریی زیاتر لە سەر زیانەکانی ئەو ڕووداوە بڕوانە:

Javier Martinez & Alvaro Diaz, Chile: the Great Transformation, (Harrisonburg-R.R. Donnelly and Sons Co-1996), PP. 13-14.

(٨٥) عارف کەریم، من و کۆمەڵە و یەکێتی، ل٢٣. سەبارەت بە نووسەری نامیلکەکە عارف کەریم پێیوایە جەلال تاڵەبانی نووسیویەتی، بەڵام عەلی بچکۆڵ بەم شێوەیە ئاماژە دەکات و دەڵێ: **" تابیعەیەکم لە ماڵی کاك فەرەیدوون [مەبەستی فەرەیدوون عەبدولقادرە– توێژەر] کە ئەوکات ماڵیان لەسەر ڕێگەی بەغدا بوو وەرگرت و**

**هێنامە ماڵی خۆمان لە گەڕەکی جووت قاوە، بۆ بەیانییەکەی (تەئمیمی نەوت)مان بەو تایپە دەرکرد، کە کاک فەرەیدوون نووسیبووی"**. کۆمیتەی ئاگر، سەرەتای دروستبوون و چالاکی و ئەنجام، ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ)، ژمارە (٥٩٠٦) سلێمانی، ٢٠١٢/١٠/١٦.

(٨٦) دیمانەیەك لەگەڵ برایم جەلال، سلێمانی، ٢٦ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٢.

(٨٧) برایم جەلال، چەپکێك لە مێژووی کۆمەڵە، ل ٤٧– ٤٩؛ محەمەد مێرگەسۆری، "حزبێك لە شاخ و شۆڕشێك لە خوێن و ڕێبازێك بێ وچان"، گۆڤاری (K21)، ژمارە (٥–٦)، هەولێر، ٢٠٠٩، ل ٢٧٥.

(٨٨) دیمانەیەك لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٣ی تەممووزی ٢٠١٢؛ دیمانەیەك لەگەڵ ئیحسان نەجم (ئەبو شەهاب)، سلێمانی، ٣ی تەممووزی ٢٠١٢؛ دیمانەیەك لەگەڵ نەجمەددین فەقێ عەولا، سلێمانی، ١ی تەممووزی، ٢٠١٢.

## ملخص البحث

تأسست العصبة الماركسية اللينينية الكردستانية (كومهله) في ١٠ حزيران ١٩٧٠ في كردستان الجنوبية كتنظيم سياسي أيديولوجي ماركسي لينيني متأثرا بالفكر الماوي، ومارست هذه العصبة مهامها بصورة سرية في بداية نشأتها بسبب الظروف السياسية في العراق عموما، وفي كردستان خصوصا، وعلى الرغم من هذه الأوضاع الاستثنائية تمكنت من حشد أنصار لها وطورت تنظيماتها.

أن تأريخ العصبة في هذه المرحلة يستحق الدراسة، ولكن التوصل إلى الحقائق التأريخية مهمة صعبة بسبب عدم توفر المعلومات، لذا لامفر من اللجوء إلى المقابلات مع الأشخاص المعنيين الذين كان لهم دور في تأسيس وتطوير تنظيمات العصبة، واجراء هذه المقابلات ليس بالأمر اليسير، بسبب وفاة العديد من الذين ساهموا في إنشائها، أو إنهم باقون على قيد الحياة، ولكن بسبب كبرهم في السن لا تساعدهم ذاكرتهم على رواية الأحداث بدقة، وبالتالي يصعب ربط هذه المعلومات ببعضها. وفي كلتا الحالتين يجب على الباحث أن يتحلى بالصبر والأناة لكي ينجز بحثه. اعتماداً على منهج البحث العلمي التأريخي، وعلى أساس التحليل والتأمل والتدقيق في النتائج.

يتألف البحث من محورين، تناولنا في المحور الأول الظروف التي نشأت فيها العصبة، و تحليل دور الشخصيات التي ساهمت في تكوينها. اما المحور الثاني فقد خصص لدراسة نشاطات العصبة بعد تأسيسها مع المعوقات التي واجهتها في هذه المرحلة.

ان المصادر المعتمدة في هذا البحث متعددة، ولكن ابرزها هي المقابلات مع الأشخاص الذين رافقوا العصبة منذ نشأتها، وبسبب ذلك تتكرر هذه المقابلات أكثر من مرة في هوامش البحث.

# Abstract

Kurdistan Marxist-Leninist League (Known as 'Komalla' in Kurdish) was founded in 10th June 1970 as political organization in southern Kurdistan based on the ideology of Marx and Lenin and influenced by Maoist ideology. Due to the political circumstances in Iraq in general and Kurdistan at that time , "Komalla" worked as an underground organization at the beginning yet it has been able to attract people and developed its organization.

The history of this league deserves study , but reaching the historic facts is a very difficult task due to lack of documents and information. Thus, it is inevitable to depend on interviewing those who were involved and had a significant role in the establishment of the organization. This even makes it more difficult as many of them have already died, and some of those who are still alive their memory does not help them in remembering all the details. In short , the study needs a lot of patience and hard work. The research methodology adopted is a scientific research methodology based on analysis , synthesis and checking the results.

The research consists of two topics. The first one tackles the foundation of the "Komalla", and analyzes the role of its founders. The second topic studies the activities of the "Komalla" after its foundation and the main problems and obstacles faced it.

As for the sources, the researchers drew upon many of them, especially, personal interviews with those who played a prominent role in founding the "komalla" and its activities.

# ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و ئاوڕدانەوەیەك لە سەرهەڵدان و گەشەکردنیان لە کوردستاندا

پ. ی. د. دلێر ئیسماعیل حەقی شاوەیس

**پێشەکی:**

زاراوەی کۆمەڵگای مەدەنی و چالاکییەکانی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی ئەمڕۆ هێندە بەربڵاون، کە بوون بە بەشێك لە مەرجەکانی بوونی کۆمەڵگای شارستانیی سەردەم، تا ئەو ڕادەیەی ئاستی بەدیموکراسیبوون و پاراستنی مافەکانی مرۆڤ بەڕادەی چالاکیی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی دەپێورێت...

ئەو ڕێکخراوانەی پارێزگاری لە مافەکانی هاووڵاتیبوون دەکەن و گەشەی پێدەدەن و بوونەتە بازنەیەکی پەیوەندیی نێوان کۆمەڵ و دەزگا حکوومی و دەوڵەتییەکان بە چالاکییەکانیان باری سەرشانی دەوڵەت ئاسان دەکەن بۆ جێبەجێکردنی کارە سەرەکییەکانی خۆی و لە هەمان کاتیشدا دیموکراسی فراوانتر و پڕ ماناتر دەکەن.

دیارە کوردستانیش لەو هەلومەرجە بە دوور نییە، ئەم توێژینەوەیە هەوڵێکە بۆ تێڕوانینێك لە زەمینەی فەلسەفی و مێژوویی کۆمەڵگای مەدەنی و ڕێکخراوەکانی، شێواز و جۆر و تایبەتمەندییەکانی ئەو ڕێکخراوانە. لایەنێکی تری ئەم باسە تەرخان کراوە بۆ کۆمەڵگای مەدەنی و سەرهەڵدانی لە کوردستان، هەلومەرجی ئەو سەرهەڵدانە و گەشەکردنی، تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و ڕێکخراوەکانی لە کوردستاندا، هەوڵدراوە لایەك لە ئاستەنگەکانی بەردەم گەشەکردنی کۆمەڵگای مەدەنی و ڕێکخراوەکانی بدرێتەوە، دواجاریش هەوڵدراوە بەشێك لەو ئەنجامانەی ئەم توێژینەوە پێیان گەیشتووە بخرێنە ڕوو.

بە هۆی بەربڵاوی و فرەڕەهەندی و بوونی ڕای جیاواز و هەندێ جار دژ بە یەکیش سەبارەت بەو مەسەلانەوە کە قسەیان لێوە کراوە، خوێنەر ڕووبەڕووی

سەرچاوەکان کراوەتەوە تا بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێتەوە سەریان لە لایەك و لە لایەکی تریشەوە تا ئێمە لە بابەتە سەرەکییەکەی خۆمان دوور نەکەوینەوە.

**زەمینەی فەلسەفی و مێژوویی:**

مەدەنییەت ـ شارنشینی لە Civisەوە کە وشەیەکی لاتینیی کۆنە وەرگیراوە و مانای کۆمەڵە شارییەکان دەگەیەنێت، مەبەست لەو کۆمەڵە مرۆڤەیە کە لە شاردا کۆدەبنەوە و دامودەزگای نوێ بۆ بەڕێوەبردن و ڕێکخستنی پەیوەندییە ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتوورییەکانیان دادەمەزرێنن، لە دەرەوەی خێزان و بەرەباب و خێڵ ـ واتە دامەزراندنی دەوڵەتی شار، کە سەرەتا لە میزۆپۆتامیا و دۆڵی نیل سەری هەڵداوە و گەشەی کردووە[1].

کەواتە کۆمەڵگەی مەدەنی Civil Society بەشێوە سەرەتاییەکەی ئەو کۆمەڵگایەیە کە لە شاردا دەژی و لە سایەی ڕێکخراوە کلاسیکییەکانی وەك خێزان و بەرەباب و خێڵ تاڕادەیەك خۆی ڕاپسکاندووە و دەوڵەت و دەزگاکانی پەیوەندی کۆمەڵگای مەدەنی ڕێکدەخەن. بەجۆرێکی تر دەتوانین بڵێین: کۆمەڵگای مەدەنی ئەو کۆمەڵگایەیە کە لە سایەی سەروەریی یاسادا دەژی.

ئەفلاتۆن ٤٢٨–٣٤٧ پ. ز. پێی وابوو "دەسەڵاتدار نابێ تەنیا لە بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیەوە بڕوانێ، بەڵکو هەرچی دەیڵێ و دەیکا دەبێ لە بەرژەوەندیی بندەستەکانیدا (رعیە) بێت"[2]. بەلای ئەفلاتۆنەوە خۆپەرستی لە سەرکردایەتییەوە ڕۆدەچێتە نێو خەڵك و نایەکسانی و لێکترازان دەبێتە هۆی ڕکوکینە لەنێو خەڵکدا و لە ئەنجامیشدا دەبێتە شەڕی نێوخۆ و تێکچوونی کۆمەڵگای مەدەنی[3] .

ئەرستۆ وای دەبینی دەستوورەکان بەهێز نابن ئەگەر دان نەنێن بە فرەییدا، کە ڕەگوڕیشەی لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا داکوتاوە، بۆیە دەبێ دەسەڵات ـ حکومەت پێکبێت لە: دیموکراسی و ئۆلیگارشی، لە یەکەمیاندا بەرژەوەندیی زۆرینەی هەژار و لە دووەمیشیاندا دەسەڵاتی کەمینە نوێنەرایەتی دەکرێت[4]. بەڵام ئەوەی جێگەی ئاماژە پێکردنە بەلای ئەرستۆوە ژنان، کۆیلە، منداڵ و بێگانە و ئەو کەسانەی لە دەرەوەی ئەتینا دەژیان نەدەچوونە خانەی هاونیشتمانیانەوە و مافیان نەبوو لە کۆمەڵگەی مەدەنیدا.

سیسرۆنیش Ciceron ١٠٦-٤٣ پ. ز. دەستەواژەی کۆمەڵگەی مەدەنی بۆ پێناسەی دەوڵەتی شارستانی بەکارهێناوە، کە بە مانای دەسەڵاتێك دێت لە چوارچێوەی یاسادا ڕێکخرابێت[٥].

لە سەدەکانی ناوەڕاستیشدا Saint Augustine ئۆگۆستین. ٣٥٤-٤٣٠ هەوڵی دەدا بیر و بۆچوونەکانی ئەفلاتۆن لەگەڵ کاتۆلیکدا بگونجێنێ و پێی وابوو: "دادپەروەریی ڕاستەقینە تەنیا لە سایەی ئەو دەسەڵاتەوە دێتە کایەوە کە ئیسوس (مەسیح) دایدەمەزرێنێ و دەستەڵاتدار دەبێ"[٦]. کەواتە کۆمەڵگەی مەدەنی تەنیا لەژێر رکێفی دەسەڵاتی کەنیسەدا دەبێ و دەوڵەتیش دەبێ ئامرازێك بێت بۆ جێبەجێکردنی خواستەکانی ئیسوس. بەو جۆرە ئەو تێڕوانینە گشتگیرەی سەپاند و دواتریش هەموو دەزگا ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکان کەوتنە ژێر رکێفی کڵێسە و گشت دەستەڵاتەکان گەڕێندرانەوە بۆ خودا و کڵێسە... بۆیە دەتوانین بڵێین: ئۆگەستین بنەمای دادگاکانی چاودێری و پشکنینی دامەزراند.

تۆماس هۆبز Tomas Hobbes -١٥٨٨-١٦٧٩ پێی وابوو کۆمەڵگەی مەدەنی لە دەستەڵاتی دەوڵەتەوە سەرچاوە دەگرێ و پارێزگاری لێ دەکرێ و گەشە دەکات. بەبێ بوونی دەوڵەت و دەستەڵاتەکەی کۆمەڵگەی مەدەنی پێکنایەت، بەڵام هۆگۆ گرۆشوسHugo Grotius - ١٥٨٣-١٦٤٥ پێی وابوو کۆمەڵگەی مەدەنی بەر لە ڕێکخستنی دەوڵەت و بوونی دەستەڵاتەکەی هەبووە[٧].

لە سەدەی شازدەدا یەکەم جار لە دەقی فەرەنسی (سیاسەتی ئەرستۆ)دا SocieteCivile بە مانای کۆمەڵی مەدەنی بەکار هاتووە. ساڵی ١٦٧٧ جاك بۆسویێ Bossuet Jacques - ١٦٢٧-١٧٠٤ لە کتێبی: (سیاسەت بە گێڕانەوەی کتێبی پیرۆز) دەنووسێ: "کۆمەڵی مەدەنی، کۆمەڵێکی تێکەڵ لەو مرۆڤانەیە کە لەژێر سایەی یەك یاسا و یەك دەوڵەتدا ژیان دەبەنە سەر"[٨].

ڕێنیسانس و دواتریش شۆڕشی پیشەسازی و فەرەنسی ١٧٨٩ گۆڕانکاریی بنەڕەتییان لە ژیانی ئابووری ـ کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووری ئەورووپادا هێنایە کایەوە، بە جۆرێك لە ڕووی یاساییەوە هاوڵاتییان یەکسان بوون، جیاوگە کۆمەڵایەتی و ئابووری و یاساییەکانی چینە باڵاکانی نەهێشت و کۆمەڵی لەژێر

هەژموونی کڵێسە هێنایە دەرەوە و ئازادیی ئابووری و سیاسی بۆ تاك پاراست و بەو جۆرەش ڕێگە خۆشی بوو لەبەردەم گەشەکردنی دەوڵەتی نوێ و کۆمەڵگای مەدەنی[٩].

ئادام سمیس Smith Adam – ١٧٢٣–١٧٩٠ پێیوابوو "کۆمەڵگای مەدەنی ئەو کۆمەڵەیە، کە پێکهاتووە لەسەر بنەمای چالاکیی ئابووریی ئازاد بەمەبەستی بەرژەوەندیی تایبەت بە پاڵپشتی دەوڵەتێکی کارا"[١٠].

بە لای هیگڵەوە Georg Wilhelm Fredrich ١٧٧٠–١٨٣٠ کۆمەڵگای مەدەنی: "ئەو قۆناغەیە لەنێوان خێزان و دەوڵەتدا"[١١] هیگڵ پێی وابوو کۆمەڵگەی مەدەنی تۆڕێکە لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەدەر لە دەوڵەت، کە سەرچاوەی لە بەرژەوەندییەکانی تاکەوە وەرگرتووە و بەپێی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیانەوە تاکە کار پێکەوە گرێ دەدا لە زنجیرەیەکی سەربەخۆی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا[١٢]. هیگڵ دوو جۆر کۆمەڵگە لێك جودا دەکاتەوە کۆمەڵگای شار (کۆمەڵگای مەدەنی) کە لەسەر بنەمای پیشەسازی دروست دەبێت و بە کۆمەڵگای بۆرژوازی ناوی دەبات، ئەویتر کۆمەڵگای لادێییە، کە سەنتەری ژیانی ئەخلاقییە و لەسەر بنەمای سروشت و خێزان پێکهاتووە[١٣].

کارل مارکس Marx Karl – ١٨١٨–١٨٨٣ پێیوابوو "ئازادبوونی کرێکاران دەبێتە هۆی ئازادیی هەموو مرۆڤایەتی، چونکە هەموو کۆیلایەتییەکی مرۆڤ لەسەر بنەمای پەیوەندیی کرێکار بە بەرهەمەوە پێکهاتووە."[١٤] بۆیە بە نەمانی چینە کۆمەڵایەتییەکان و دەوڵەت کۆمەڵگای مەدەنیی بۆرژوا لەناو دەچێ و کۆمەڵگای مەدەنیی ڕاستەقینە پێکدێ کە چەوساندنەوەی تێدا بنبڕ دەکرێت.

تۆکفیل De Tocqville Alexis Charles Henri – ١٨٠٥–١٨٥٩ پێیوابوو کۆمەڵگای مەدەنیی ئەمریکایی پێکهاتووە لەسەر بنەمای لێك تێگەیشتنی کولتووری و پێکەوە گرێدانی تاکەکان لەسەر بنچینەی ژیانی تێروتەسەلی گشتی و یەکسانیی کۆمەڵایەتی[١٥].

دەکرێ بڵێین ئەو کۆمەڵگایەی دەستبەرداری پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵێکی داخراو دەبێ و هەنگاو بەرەو کۆمەڵگایەکی کراوە دەنێ پێی دەوترێ کۆمەڵگەی مەدەنی.[١٦]

د. تیسیر الناشف پێیوایە کۆمەڵگای مەدەنی ئەو کۆمەڵگایەیە کە پێکدێت لەسەر بنەمای سنووردارکردنی رادەی دەستێوەردانی حکومەت و دەزگاکانی بۆ چالاکییەکانی تاك و رەخساندنی فراوانترین ئازادی بۆ تاکەکان و توێژە کۆمەڵایەتییەکان، تا چالاکییەکانیان بە ئازادی ئەنجام بدەن لە رێکخراو و سەندیکاکانی وەك: لاوان، قوتابیان، ئافرەتان، کرێکاران، پزیشکان، جووتیاران، هونەرمەندان، وەرزشوانان، ....هتد[١٧]

بەم جۆرە کۆمەڵگای مەدەنی چەمکێکی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و کولتووری پێکدەهێنێ وەك پەیوەستێك بۆ پەیوەندی و چالاکییە خۆبەخشەکان لە نێوان تاك و دەوڵەتدا. کۆمەڵگای مەدەنی لە پرۆسەیەکی مێژووییدا سەری هەڵداوە و گەشەی کردووە لەسەر بنەمای پەیوەندییە تێهەڵکێشەکانی نێوان چین و توێژاڵە کۆمەڵایەتییەکان، کە بەرهەمی داب و نەریت، ئایین، موڵکدارێتیی تایبەتی هۆیەکانی بەرهەمهێنان، ئاسایشی کۆمەڵایەتی، سەروەریی یاسا و ئازادیی تاك و دیموکراسی. بۆیە دەشێ بگەینە ئەو ئەنجامەی بڵێین سیستەمی سەرمایەداری باشترین کەشوهەوای بۆ گەشەکردنی کۆمەڵگای مەدەنی رەخساندووە، ئەوەش لە رێگەی فراوانترکردنی ئازادیی تاك، دیموکراسی و سەروەریی یاسا، موڵکدارێتیی تایبەتی هۆیەکانی بەرهەمهێنان و مافی مرۆڤەوە.

## رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی:

Civil Society organization

گەشەکردنی کۆمەڵگای مەدەنی دەبێتە هۆی فراوانبوونی پانتاییەکانی مافەکانی مرۆڤ و ئازادییەکانی تاك و لە ئەنجامیشدا سیستێمی دیموکراسی پەرە دەستێنێ و هاونیشتمانیبوونیش دەبێتە ئەرك و مافێکیش بۆ ئەندامانی کۆمەڵ.

ئەرك لە پاراستنی وڵات ، ئاسایشی تاکەکان و نەبەزاندنی سنووری ئازادییەکانیان، پارێزگاری لە سەروەت و سامان و ژینگە ..کارکردن بۆ بەرەو پێشەوەچوونی وڵات و گەشەکردنی، پاراستنی بەرژەوەندیی گشتی کە لە پاراستنی بەرژەوەندیی خودی هاوڵاتییەوە سەرچاوە دەگرێ وەك: پاراستنی تەندروستیی خود و کۆمەڵ ..هتد.

**مافەکانی هاوڵاتیش بریتین لە :**

مافی ژیان، ئازادیی ڕادەربڕین، مافی کارکردن، پارێزگاری لە تەندروستی، یەکسانی بەرامبەر بە یاسا، خوێندن ....هتد.

لە پێناو هاوڵاتیبوون و پاراستنی ئەرك و مافەکانی" هاونیشتمانانی هەر وڵاتێك لە ڕێگەی ڕێکخراو و کۆمەڵەکانیانەوە، لە شێوە و ئەنجامی کارەکانی دەوڵەتی خۆیان دەکۆڵنەوە و هەڵیان دەسەنگێنن و چاودێریی بازرگانان دەکەن نەبادا لە قازانجکردندا زێدەڕۆیی بکەن. دواجار کۆمەڵی مەدەنی بۆ چەسپاندنی سیاسەتی گشتی فشار دەخاتە سەر دەوڵەت و کەرتی تایبەتیش ناچار دەکات ئەرکی کۆمەڵایەتیی خۆیان بەجێ بگەینن."[١٨] ئەرکی کۆمەڵی مەدەنی تەنیا ئەوە نییە دیموکراسی و ئازادیی تاك و مافی مرۆڤ و هاوڵاتیبوون دابین بکات بەڵکو هاوڵاتیانن بە مەبەستی پاراستن و چەسپاندنی مافەکانیان و گەشەکردن بۆ سوودگەیاندن بەخۆیان و کۆمەڵگاکەشیان خۆبەخشانە لە نێو ڕێکخراوگەلێکدا کۆدەبنەوە بە مەبەستی بەدەستهێنان و پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان و چاودێریکردنی دەزگاکانی دەوڵەت و پارێزگاریکردن لە هاوڵاتیبوون، بەو ڕێکخراوانە دەوترێت ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، بۆیە دەشێ بڵێین کۆمەڵگای مەدەنی سەردەم بێ ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و چالاکییەکانی هیچ مانایەکی نامێنێ.

بانکی نێودەوڵەتی پێناسەی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی دەکات کە: "بریتییە لەو ڕێکخراوە ناحکومییانەی دوور لە مەبەستی سوود وەرگرتنی مادی پێکهاتوون و لە خزمەتی ئەندامەکانیاندا لە بواری کۆمەڵایەتی، کولتووری، سیاسی، ئاینی، خێرخوازی ."[١٩]

بەلای هەندێکی ترەوە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی "بریتییە لەو ڕێکخراوانەی بەشێوەیەکی ئازاد و خۆبەخشانە پێکدێت لە دەرەوەی بازنە و کۆنترۆڵی دام و دەزگا کلاسیکییەکانی وەك: (خێڵ، مزگەوت و کڵێسە و پەرستگا و مەرجەعییەت ..هتد) و دەزگا حکومییەکان بە مەبەستی پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بۆ ئەندامەکانی و داکۆکیکردن لە مافەکانی تاك و هاونیشتمانی بوون دوور لە ڕەعیەت و مسکێن بوون و غوڵامێتی ."[٢٠]

ویکیپیدیا Wikipedia: پێناسەی رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی دەکات کە: "هەموو چالاکییەکی خۆبەخشانەیە کۆمەڵێك پێ هەڵدەستێت کە ئامانجێکی هاوبەشیان هەیە بە مەبەستی پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری، پشتگیریی خوێندنی ئازاد یان کارکردن لەسەر سیاسەتە گشتییەکان وەك بلاوکردنەوەی زانیاری، فشار و لێپێچینەوە لە سەرچاوەکانی بڕیار." [٢١]

بەو شێوەیە کۆمەڵگای مەدەنی ژمارەیەکی فراوان لە رێکخراوە ناحکومی و ئەوانەی بە مەبەستی سوودوەرگرتن پێك نەهێنراون، لە ژیانی گشتیدا ئەرکی گرینگیدان بە بەرژەوەندییەکانی ئەندامانی یان کەسانی تری لە ئەستۆ گرتووە بە پێی بنەما ئەخلاقی یان رووناکبیری یان سیاسی یان زانستی یان ئاینی یان خێرخوازی ....

دیارە کۆمەڵگای مەدەنی و رێکخراوەکانی وەك دەرئەنجامێك بۆ گەشەکردنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووریی کۆمەڵگای نوێ و سەردەمییانەی مرۆڤایەتی دەبێ لە هەر قۆناغ و ئاستێکی گەشەکردنی ئەو کۆمەڵگایە و بە پێی تایبەتمەندێتی و ئاستی مێژوویی، فەرهەنگ و داب و نەریت و ئایینی .. هتد هەر کۆمەڵگایەك شێوازەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و فۆرم و ناوەرۆك و میتۆدەکانی کارکردنی دەگۆڕێ.

بۆ نموونە رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی لە قۆناغی گواستنەوەی دەرەبەگایەتی بۆ سەرمایەداری، کاتێك کلێسە دەسەلاتێکی فراوانی سەپاندبوو بەسەر هەموو جومگەکانی ژیاندا، یەکێك لە ئەرك و فەرمانەکانی ئەو کۆمەلانە خۆڕاپسکاندن بوو لە هەژموونی کلێسە و یاسا توند و تۆڵەکانی ... بەر لە چەسپاندنی یاساکانی سەرمایەداری، کاتێك هێشتا هێزی کار ئازاد نەبووبوو لە ژێر هەژموونی سیستەمی دەرەبەگایەتی و پەیوەندییەکانی ئابووریی سروشتی، شێواز و ئەرکی رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بۆ ئازادکردنی هێزی کار و سەرمایە و پاراستنی تاك بوو لە ژێر دەسەلاتی دەرەبەگیدا ...

بەلام کاتێك سەرمایەداری جێپێی پتەو بوو، لە قۆناغی ئازادیی بازرگانیدا ئەوکاتەی دروشم "لێگەڕێ با کاربکا، لێگەڕێ با تێپەڕێ" بوو دواتریش لە سەردەمی پاراستنی بازرگانیدا (الحماية التجارية) دروشم بوو بە: پاراستنی

بەرهەمی خۆماڵی لە پێشبڕکێی بەرهەمی دەرەکی و زیادکردنی هەناردە لەسەر حسابی هاوردە. ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی چ لە ڕووی ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتوورەوە هاو ئاهەنگییان دەکرد لەگەڵ ئاست و ئەرك و فەرمانی قۆناغەکە ... ئێستاش لە سایەی سیستەمی مۆنۆپۆڵ و دەسەڵاتی ڕێکخراوە فرە نەتەوەیی و نێودەوڵەتییەکانی وەك : کارتێل و ترۆست .....

ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی لەسەر جیهان کراونەتەوە و بە میتۆدی فراوان و بەشێوازی گشتگیرتر کار و فرمانەکانیان جێبەجێ دەکەن و ئەرکەکانیان لە چوارچێوەی لۆکاڵی و نیشتمانیدا نەوەستاوە و ئاستێکی جیهانی بەخۆوە گرتووە. لە ئێستادا دەتوانین دوو جۆری سەرەکی لە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بەپێی پانتایی کارکردنیان جودا بکەینەوە:

١- ڕێکخراوە نیشتمانی و لۆکاڵییەکان، بریتین لە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی کە لەسەر ئاستی نیشتمانی یان لۆکاڵی کاردەکەن و بەرنامەکانیان لە سنووری نیشتمانی یان ناوچەیەکی دیاریکراو تێناپەڕێ، وەك ڕێکخراوە نیشتمانییەکانی: لاوان، قوتابیان، سەندیکا کرێکاری و پیشەیی نیشتمانی و نەتەوەییەکان، ئەمانە لە ڕووی بەڕێوەبردن و سەرچاوەکانی دارایی و پشتگیریکردنیان ئامانجەکانیان لە چوارچێوەی نێوخۆیی و لۆکاڵی دەرناچن.

٢- ڕێکخراوە نێودەوڵەتی و جیهانییەکان، لە سایەی پرۆسەی بەجیهانیبوون و کرانەوەی کۆمەڵگا نیشتمانییەکان لەسەر یەکتر و پێشکەوتنە بێئەندازەکانی و هۆیەکانی گواستنەوە و گەیاندن و زیاتر تێهەڵکێشبوونی کۆمەڵگاکان کێشە و گیروگرفت و ئەرك و ماف.. زیاتر تێکەڵ بە یەکتر بوون و کێشەکان لەسەر ئاستی جیهانی و سەرانسەری کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا خۆیان دەنوێنن و چارەسەر دەکرێن، لەلایەکی تریشەوە پشتگیرییە دارایی و شێوازی بەڕێوەبردن سنوورە نیشتمانییەکانیان بەزاندووە، بۆیە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنیش هەندێکیان بوون بە ڕێکخراوەی نێودەوڵەتی و جیهانی و ئەرك و فرمانەکانیان لە چوارچێوەیەکی نیشتمانی و نەتەوەییدا سنووردار نییە و سەرانسەری جیهانیان گرتۆتەوە ... لەو ڕێکخراوانە بۆ نموونە: سەنتەری بونیاد Foundation Center:

کۆمەڵــەی پەیوەندییــە پێشــکەوتووەکان (Association for progressive communication)
بانکی جیهانی (World Bank)[٢٢]

لەســەر ئاســتی جــۆری چــالاکییەکان و بــواری کارکردنیــان ڕێکخراوەکــانی کۆمەڵگای مەدەنی دەکرێ دابەش بکرێن بەسەر چەند جۆرێکەوە وەک: ئــابووری، سیاسی، زانستی، کۆمەلایەتی، فەرهەنگی، گەشەپێدانی مرۆیی.....

جێگــەی خۆیــەتی ئامــاژە بــەو ڕاســتییەش بکرێــت کــە لەگــەڵ هــەموو جیاوازییــەکی ڕێکخراوەکــانی کۆمــەڵگای مــەدەنی، بــەڵام هــەموویان لــە کۆمەڵــە تایبەتمەندێتییەکدا هاوبەشن لەوانەش[٢٣]:

١. ڕێکخراوەکــان بــۆ ســوودی تایبــەت نــین و خۆبەخشــن، ڕێکخراوەکــانی کۆمــەڵگای مــەدەنی لــە لایــەن کەســانی خۆبەخشــەوە پێکــدێن و دادەمــەزرێن، مەبەستیش سوود وەرگرتنی تایبەت نییە بۆ دامەزرێنــەرانی و سەرچــاوەیەک نییــە بۆ داهات و سوودی تایبەت و کەڵەکەکردنی ســەرمایەی تایبــەت، بــەڵکو لــە پێنــاو بەرژەوەنــدیی گشــت ئەنــدامان و هاوشــێوەکانیاندایە لــە ســنووری چــالاکیی ڕێکخراوەکــەدا. ئەگەرچــی هەنــدێ جــار ئــەو ڕێکخراوانــە کەســانێك وەک کارمەنــد دادەمــەزرێنن بەرامبــەر بــە کرێیــەک یــان مووچــەیەک، بــەڵام شــێوازی گشــتی و سەرەکیی کارکردن خۆبەخش و بێ بەرامبەرە.

٢. نــا حکومییــە، ڕێکخراوەکــانی کۆمــەڵگای مــەدەنی نــاحکومین و لــە ژێــر هەژموونی دەزگا حکومییەکانــدا نییــە و لــە چوارچێوەی یاســادا سەربەســتانە لــە دەســتێوەردانی دەزگــا حکومییــەکان کاردەکــەن، ئەگەرچــی ئــەو ڕێکخراوانــە پەیوەندییان بە دەزگــا حکومییەکانــەوە هــەبێ و یارمــەتی بــێ مــەرج و زانیــاری و هەندێ جار دەستگیریی دارایــیش بکــرێن، بــەڵام بــەڕێوەبردن و نەخشــە و پــلان و شێوەی کارکردنیان سەربەخۆیە.

٣. ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بە مەبەســتی قــازانج دروســت نــەبوون، ئەگەرچی هەندێ جار ئەو ڕێکخراوانە چالاکیی بازرگانی و پرۆژەی ئابووری ئەنجام دەدەن و لە ئەنجامدا سوودێکیان بۆ دەگەڕێتــەوە، بــەڵام ئــەو چــالاکییانە ئامــانج لێیــان ســوود نییــە هێنــدەی بەکارهێنانیــەتی بــۆ جێبــەجێکردنی بەرنامــەکانی

ڕێکخراوەکە و جێبەجێکردنی پلانەکانی و سوودی گشتی بۆ ئەندامان و مەبەستی ڕێکخراوەکەیە.

٤. دیموکراسییە، هەموو ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی لەسەر بنەمای دیموکراسی و فرەیی و ئازادیی تاك پێکهاتوون، میتۆدە نادیموکراسی و گشتگیرییەکان و بەرتەسککردنەوەی ئازادییەکانی تاك لەو ڕێکخراوانەدا جێیان نابێتەوە چ لە ڕووی شێوازی دامەزراندن، داڕشتنی پلان و کارکردنیان یان شێوازی بەدەستهێنانی سەرچاوەی دارایی و خەرجکردنی... یان لێکهەڵوەشانەوەی ڕێکخراوەکە..هتد.

لەسەر بنەمای دیموکراسیبوونی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، ئەو کۆمەڵانە لە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆدان لەگەڵ خەڵکدا و بۆ هەموو کەس هەیە ڕاستەوخۆ پەیوەندییان پێوە بکات و لە چالاکی و کار و فەرمانەکانیان شارەزا بێت و هیچ لە خەڵك نەشاردرێتەوە.

جێگەی خۆیەتی ئاماژە بەوەش بدەین، لەگەڵ ئەو تایبەتمەندێتانەی هاوبەشن لە هەموو ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنیدا، بەڵام ناکرێ نکۆڵی لەوەش بکرێ، کە بەرفراوانی و گەشەکردنی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی چ لەسەر ئاستی ئاسۆیی یان ستوونی و فراوانبوونی سەرچاوە داراییەکان و گەشەکردنی هاوکاریی دارایی بۆ ئەو ڕێکخراوانە و بەشداریکردنیان لە هەندێ پرۆسەی بازرگانی و ئابووریدا، هەندێ جار ئەو ڕێکخراوانە وەك پێویست بە ئەرك و فەرمانەکانیان هەڵناستن و نەخشە و پلانەکانیان وەك پێویست جێبەجێ ناکەن و جاروباریش دەگلێن لە کاری گەندەڵی و سوودی تایبەت و دەستێوەردان و بەکارهێنان بۆ بەرژەوەندی کۆمپانیا و دەزگا دەوڵەتی و نێودەوڵەتییەکان بۆ نموونە گەندەڵییەکانی بەرنامەی نەوت بەرامبەر بە خۆراك.

## کۆمەڵگای مەدەنی لە کوردستاندا:

لەگەڵ گەشەکردنی شارەکان و کۆبوونەوەی ژمارەیەکی زۆر لە پیشەگەران و فراوانبوونی بازرگانی لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا، جۆرە ڕێکخستنێکی پیشەیی لە شێوەی سەندیکادا لە نێو پیشەگەراندا پێکهات، بە مەبەستی پۆلینکردنی وەستا

و خەلفــە و شــاگرد و...، مۆڵەتــدان بــە پیشــەگەران و پاراســتن و گەشــەکردنی بەرژەوەندییەکانی پیشە و پیشەکاران...[٢٤] بەڵام تێگەیشتنی نویێ بۆ کۆمەڵگای مــەدەنی و ڕێکخراوەکــانی و چــالاکییەکانیان وەك زادەیــەکی گەشــەکردنی کۆمەڵایەتی- ئابووری و سیاسی و کولتووری لە مێژووی نوێدا پەیوەستە بەو گۆڕانکارییانەی لە سەدەی حەڤدەوە لە ئەورووپا دەستیان پێکردووە و تا ئێستاش بەردەوامییان هەیە و لە ئەنجامدا سیستەمی سەرمایەداری و دیموکراسییان گەشەپێدا.

کوردستان و گەلەکەی، وەك وڵاتێکی داگیرکراوی بێ قەوارەی ژێر دەستەی دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی فارس (ئێران) و عوسمانی، دوورە پەرێز بوون لەو گۆڕانکارییانە و زیاتریش لەوە گەلی کوردستان لە پەراوێزی گەلانی فارس و تورك و دواتر عەرەبیشدا دەژیا، کە ئەوانە خۆیان لە کاروانی گەلان و گەشەکردنیان جێما بوون[٢٥]. بۆیە کوردستان و گەلەکەی جگە لە ژێردەستەیی بێگانە لە سایەی شێوازی بەرهەمهێنانی دەرەبەگایەتی دەرباز نەبوون.. کاتێکیش دوای جەنگی جیهانی یەکەم، هێزە داگیرکەرە ئەورووپاییەکان راستەوخۆ هاتنە ناوچەکە و داگیریان کرد، تاڕادەیەکی زۆر پارێزگارییان لە شێوازەکانی بەرهەمهێنانی پێش سەرمایەداری دەکرد تا درێژە بە دەسەڵاتی خۆیان و تالانکردنی ناوچەکە بدەن. بۆیە پرۆسەی بە مەدەنیکردنی کۆمەڵگا و سەرهەڵدانی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و چالاکییەکانیان لە کوردستاندا دواکەوت. ئەوەشمان لەیاد نەچێت کە کوردستان وەك بەشێك لە وڵاتانی رۆژهەڵات، هەر لە کۆنەوە سیستەمی بەرهەمهێنانی ئاسیایی باڵادەست بووە تیایدا و بەرهەمهێنی دەستەڵاتی مەرکەزی ستەمکار و ملهوڕی بووە. بۆیە پرۆسەی بەمەدەنیبوون هەر خۆی لە خۆیدا زەمینەی پێویستی بۆ نەڕەخساوە[٢٦].

بەپێی ئەوەی کۆمەڵگای مەدەنی و ڕێکخراوەکانی زادەی سیستەمی سەرمایەداری و دیموکراسی و هزریی لیبرالیزمە، بۆیە دەبێ لەو سەرچاوانەوە بگەڕێین بۆ سەرەتاکانی سەرهەڵدانی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی لای کورد.

دیارە دەستنیشانکردنی خاڵی سەرەتای ئاشنابوونی کورد بە هزری لیبرالیزم ئاسان نییە، چونکە لایەنێکی لێڵ و تاڕادەیەکیش پچڕ پچڕە[٢٧]، بەڵام ناشکرێ

ڕووداوێکی گرنگی وەك دەرکردنی **ڕۆژنامەی کوردستان لە قاهیرە ٢٢ نیسانی ١٨٩٨ لە لایەن مقداد بەدرخانەوە** پشتگوێ بخرێ، کە خاڵێکی وەرچەرخانی مێژوویی بوو لە بزووتنەوەی ڕووناکبیری و سیاسی لە کوردستاندا و، دەکرێ بە سەرەتای سەرهەڵدانی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی دابنرێت. دامەزراندن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەی کوردستان و دوور لە دەسەڵاتی سیاسی و بەمەبەستی هۆشیارکردنەوەی خەڵکی کوردستان بە مێژوو و فەرهەنگ و زمانی خۆیان و ڕاچڵەکاندنیان بە هزری ئازادیخوازانە و دەستکەوتە ئابووری و کۆمەڵایەتی و زانستییەکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی، بەتایبەتی لە ئەورووپادا و ئاشناکردنیان بە گەورە پیاوان و سەرکردە و زانایانی کورد و کوردستان... خۆی لە خۆیدا چالاکییەکی مەدەنیی گەورە بوو لەو ڕۆژگارەدا، ئەگەرچی ئەو چالاکییانە لە سایەی سیستمێکی دیموکراسیدا نەکراوە و لە قاهیرەیەکی دوورە دەستی دەستەڵاتە ستەمکارەکانی عوسمانیدا ئەنجامدراوە و بە پێی یاساکانی عوسمانی لادان و سەرپێچییەکی گەورە بووە بۆ فەرمانی سوڵتان و دامو دەزگاکانی "خەلافەت" ی ئەو سەردەمە. بەڵام کارێکی خۆبەخشانە و دوور لە قازانجی تایبەت و بەمەبەستی سوودی گشتی و نیشتمانی و نەتەوەیی ئەنجامدراوە[٢٨].

دیارە کۆمەڵگای مەدەنی و ڕێکخراوەکانی وەك بەشێك لە سەرخانی کۆمەڵایەتی شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری، زادەی کۆمەڵگای ڕۆژئاواییە و سوودوەرگرتن لە ئەزموونەکانی کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی کارێکی پێویست و بەجێیە، بەڵام لە هەر کۆمەڵگایەکیشدا بە پێی هەلومەرجی مێژوویی و دابونەریت و تایبەتمەندییە کولتوورییەکانی، شێواز و ڕەنگ و بۆی جیاواز وەردەگرێ و ناکرێ لە کۆمەڵگا ڕۆژهەڵاتییەکاندا ئەزموونی ڕۆژئاوایی کوتومت کۆپی بکرێ.. بەو پێیە شێوازی لەدایکبوون و گەشەکردن و بگرە ئەرك و فەرمانەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و ڕێکخراوەکانی لە کوردستاندا جیاواز دەبێت.

ئەو ڕێکخراو و کۆمەڵە سیاسی و کۆمەڵایەتییانەی لە کۆتایی سەدەی ١٩ و سەرەتای سەدەی ٢٠ دا لەلایەن دەستەبژێری ڕووناکبیری کوردەوە دامەزران لە شارە گەورەکانی دەرەوەی کوردستان بە تایبەتی ئەستەمبوڵ[٢٩]، نموونەیەکی تری ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنین لای کورد. ڕاستە کۆمەڵی مەدەنی بریتییە

لەو فۆرماسیۆنە کۆمەڵایەتییانەی کە ئامانجیان گرتنە دەستی دەسەڵاتی سیاسی نییە، بەڵام بەوەش ڕازی نیین کە لە ڕەوتی مێژووی کۆمەڵدا هیچ ڕۆڵێکیان نەبێ[٣٠]. ناکرێ ڕەچاوی ئەوەش نەکرێ، کە گەلانی ژێردەستە لە قۆناغی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی و نەتەوەییدا خەباتی سیاسیی ئاراستەکراو لە پێناو سەربەخۆیی نیشتمانی و دیموکراسیدا بەشێکی گرنگ لە بزاڤی مەدەنی و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی پێکدەهێنێ، چونکە خەباتی ڕزگاریخوازی گەلانی بندەست ناوەڕۆکێکی دیموکراسییان هەیە، بۆیە هەرچی ڕێکخراوە و کۆمەڵە و بزاڤە سیاسییە نیشتمانی و نەتەوەیی و دیموکراسی هەیە لە کوردستاندا، دەکرێ بخرێتە نێو چوارچێوەی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنییەوە، هەر لە (یەکێتی کوردان)[٣١] ەوە، عەزمی قەومی کورد، هێڤی، کۆمەڵەی تەعالی ژیان، کۆمیتەی ئیستقلالی کوردستان، خۆیبوون[٣٢]...هتد.

دوای جەنگی جیهانیی دووەم و تێکشکانی بەرەی فاشیزم و گەشەکردنی بزووتنەوەی شۆڕشگێری لە جیهاندا، بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی کوردستانیش گەشەیەکی بەرچاوی بەخۆیەوە دی و لە ئەنجامدا هەلومەرجی لەدایکبوونی دەستەڵاتێکی سەربەخۆی نیشتمانی لە بەشێك لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا بە ناوی کۆماری کوردستان هاتە کایەوە.

ڕۆژگارەکانی کۆماری کوردستان لە مەهاباد و ئەو هەلومەرجە ئازادییەی هاتە ئاراوە، کەشوهەوایەکی گونجاوی بۆ ژمارەیەك لە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی ڕەخساند و، چالاکییە مەدەنییەکان پێیان نایە قۆناغێکی نوێوە، کاتێك ڕێکخراوەکانی: ژنان، لاوان، بەچکەشێران، کرێکاران[٣٣]... بە ئازادی هاتنە کایەوە و دەستیانکرد بە چالاکیی کۆمەڵایەتی و هونەری و داکۆکیکردن لە ماف و بەرژەوەندییەکانی چین و توێژاڵە کۆمەڵایەتییەکانیان...بەڵام دیارە کورتیی تەمەنی کۆماری کوردستان، مەودای نەدا ئەو ڕێکخراوانە وەك پێویست گەشە بکەن هەر بە نەمانی کۆمار و گەڕانەوەی دەستەڵاتدارانی تاران و دام و دەزگاکانیان ئەو ڕێکخراوانەیان ڕیشەکێش کرد و کەشوهەواکەی گۆڕی.

لە خوارووی کوردستانیش جگە لە پارتی دیموکراتی کورد کە لە ١٦ی ئابی ١٩٤٦ دامەزرا ژمارەیەك لە ڕێکخراوەی پیشەیی و دیموکراسی لەدایك بوون وەك

ڕێكخراوەكانی: قوتابیان، لاوان، ئافرەتان،.. هتد. ئەو ڕێكخراوانە ئەگەرچی بە نهێنی كاریان دەكرد، بەڵام ڕۆڵێكی بەرچاویان لە هۆشیاركردنەوە و ڕێكخستن و بەرگریكردن لە داخوازییەكانی چین و توێژاڵە كۆمەڵایەتییەكانیان دەكرد[٣٤].
ڕاستە لەو سەردەمەدا سیستەمێكی دیموكراسی لە ئارادا نەبوو، دەوڵەت مەودای كاركردنی ئازادی بۆ ڕێكخراوە پیشەیی و دیموكراتییەكان نەڕەخساندبوو، بەڵام دیارە لە كۆمەڵگا دواكەوتووەكاندا، ئەو كۆمەڵەی كە تاكەكانی لە قۆناغی تاكگەراییەوە گەیشتبنە (تاكایەتی) و لە فیرقە گەراییەوە پەڕیبنەوە بەرەو ڕێكخراوەییبوون و لە ئیرادەگەراییەوە بەرەو سامانگەرایی و لە ملكەچی دەستەجەمعییەوە بەرەو شەهامەتی مەدەنی و لە كۆمەڵگەراییەوە بەرەو بەڵێندەرایەتی كۆمەڵایەتی لە باوەڕبوون بە ئەفسانە بەرەو ئەقڵانییەت و لە ڕەعیەتبوونەوە بەرەو هاووڵاتیبوون، دەتوانێ بانگەشەی مەدەنیەتیبوونی خۆی بكات[٣٥]، و ئەو ڕێكخراوە و چالاكییانەش دەچنە بازنەی ڕێكخراوەكان و چالاكییە مەدەنییەكانەوە.

دوای شۆڕشی (١٤ تەمووزی ١٩٥٨) لە عێراقدا، هەلومەرجێكی لەبار هاتە ئاراوە بۆ كاركردنی مەدەنییانە[٣٦]. ڕێكخراوە پیشەیی و یموكراسییە كوردستانییەكانی وەك: كرێكاران، جووتیاران، قوتابیان، ئافرەتان... چالاكانە كەوتنە خەباتی مەدەنییانە دەتوانین بڵێین بە تایبەتی ساڵی یەكەمی تەمەنی شۆڕشی ساڵێكی زێڕین بوو بۆ چالاكییە مەدەنییەكان. بەڵام لە ڕووداوەكانی (١٤ تەمووزی ١٩٥٩) وە لە كەركووك پاشەكشەیەكی ئاشكرا لە ڕەوتی دیموكراسییانەی دەستەڵاتی قاسمدا ڕووی دا[٣٧] و چالاكییە مەدەنییەكان بەرەو لاوازی و سستی چوون، دواتر لە ئەنجامی كودەتای (٨ی شوباتی ١٩٦٣ كاتێك بەعسییەكان دەستەڵاتیان گرتە دەست، هیچ مەودایەكیان بۆ چالاكییە دیموكراسی و مەدەنییەكان نەهێشتەوە[٣٨].

ڕێكخراوە پیشەیی و دیموكراسی و سەندیكاییەكان جارێكی تر لە خوارووی كوردستان دوای مۆركردنی ڕێككەوتننامەی ١١ مارتی ١٩٧٠[٣٩] لە نێوان سەركردایەتیی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی كوردستان و حكومەتی عێراقدا، كەوتنە چالاكیی مەدەنی، یەكێتیی جووتیارانی كوردستان، یەكێتیی كرێكارانی

کوردستان، قوتابیان و لاوان، ئافرەتان، مامۆستایان... هتد، بە گوڕ و تینێکی نوێوە هاتنەوە گۆڕەپانی ئاشکرا و خەباتی مەدەنییانە و داکۆکیکردن لە بەرژەوەندیی چین و توێژاڵە کۆمەڵایەتییەکانیان و هۆشیارکردنەوەی خەڵك بە ئەرك و مافەکانیان، ئەمە جگە لەوەی خەباتی نەتەوەیی و نیشتمانی لایەنێکی بەرچاوی چالاکیی ئەو ڕێکخراوانە بوو. ئەم قۆناغەش جارێکی تر بە شکست کۆتایی هات و ساڵی ١٩٧٤ بە هێرشی سەرتاسەریی سوپای عێراق بۆ سەر کوردستان[٤٠] و جێبەجێ نەکردنی خاڵەکانی ڕێککەوتننامەی ١١ی مارتی ١٩٧٠ و قەدەغەکردنی چالاکییەکانی ڕێکخراوە مەدەنییە کوردستانییەکان و ڕاوەدوونان و گرتنی ئەندام و چالاکوانەکانیان.. هەموو هەلومەرجێکی کۆمەڵگای مەدەنی و ڕێکخراوەکان نەمان بە تایبەتی دوای پەیمانی جەزائیری ساڵی ١٩٧٥ی نێوان عێراق و ئێران و نسکۆی شۆڕشی ئەیلول[٤١]. ئەو ڕێکخراوە کارتۆنییانەش کە بەناوی: کرێکاران، جووتیاران، ئافرەتان، قوتابیان و لاوان.. هتد دوای نسکۆ لە کوردستاندا پێکهێنران جگە لە کۆمەڵە دەزگایەکی وابەستە بە دەسەڵاتی فاشی و دیکتاتۆریی بەعسی زیاتر هیچی تر نەبوون.

جێگەی خۆیەتی ئاماژە بەوەش بدەین، کە بە درێژایی ماوەی شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١– مارت ١٩٧٥ چ لە سەردەمی ئاشتیدا، وەك ئاماژەی پێکرا، ڕێکخراوە پیشەیی و دیموکراسییە کوردستانییەکان لە سەرانسەری خوارووی کوردستاندا چالاکییان هەبووە، لەو کاتانەشدا کە شەڕ و پەلاماردانی دەسەڵاتدارانی عێراق هەبووە بۆ سەر کوردستان، ئەو ڕێکخراوانە چالاکیی مەدەنیی خۆیان لە ناوچە ئازادکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕشدا بەردەوام بووە. شۆڕشی ئەیلول لە ناوچە ئازادکراوەکاندا هەستاوە بە ڕێکخستنی کار و تەندروستی، کارگێڕی، دادوەری.. هتد. دەکرێ ئەو "دامەزراوانە" بە جۆرێك لە ڕێکخراوەی مەدەنی بدرێنە قەڵەم. ڕاستە ئەو دەزگایانە لە سایەی دەسەڵاتی شۆڕشگێڕیی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانی و دیموکراسیی کوردستاندا چالاکییان نواندووە و بە ئەرکی خۆیان هەستاون، بەڵام ناشکرێ هەلومەرجی ئەو قۆناغە بۆ کۆمەڵگای بێ دەوڵەت و گەلێکی ژێر دەستەی نیشتمانی داگیرکراو ڕەچاو نەکرێ.

دوای ڕاپەڕینی بەهاری ۱۹۹۱ و هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان و لەدایکبوونی حکومەتی هەرێم، بەتایبەتی دوای هەرەسهێنانی ڕژێمی بەعس لە عێراق سالّی ۲۰۰۳ ژمارەیەکی زۆر لە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی شانبەشانی هێز و حزبە سیاسی و ڕێکخراوە پیشەیی و دیموکراسییەکان سەریان هەڵدا و کەوتوونەتە چالاکی، بەڵام جێگەی ئاماژە پێکردنیشە زۆربەی هەرە زۆری ئەو ڕێکخراوانە هێشتا وەك پێویست نەیانتوانیوە لە ژێر هەژموونی حکومەت و حزبە سیاسیەکان خۆیان دەرباز بکەن.

دیارە هاتنەکایەی کۆمەڵی مەدەنی و ڕێکخراوەکان، دەروازەیەکی گرنگە بەڕووی دیموکراسیدا، بەڵام تەنیا ئامادەیی ئەو هەلومەرجە نابێتە هۆی هەرەسهێنانی ستەمکاری و پیادەکردنی دیموکراسی، چونکە سڕینەوەی کولتوور و وێرانەکانی دیکتاتۆرییەت بە لەدایکبوونی ڕێکخراوە مەدەنییەکان نایەتە دی و ئەو پرۆسەیە پێویستی بە هەلومەرجی زیاتر و کار و کاتێکی زۆر و دوورودرێژ هەیە.

جێگەی سەرنجە، دوای ڕاپەرین و هەڵبژاردنی پەرلەمان و دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان، بەرەی کوردستانی و هێزە سیاسییەکان، دامودەزگا و شێوازی کارکردنی ڕژێمی پێشوویان بە میرات بۆ مایەوە و نەیانتوانی بە تەواوی خۆیان لە پاشماوەکانی دەربازکەن، بۆیە بە حیزبیکردن و هەوڵدان بۆ پاوانکردنی دەسەڵات و سەروەت و سامان بووە شێوازێك لە شێوازەکانی کارکردنی حیزب، ئەمەش بووە هۆی سڕینەوەی موڵکداریەتی دەوڵەت بۆ هۆیەکانی بەرهەمهێنان لە زۆر بواردا و دواتریش پاوانکردنی لە لایەن کەسە دەستڕۆیشتووەکانی حیزب و ڕێکخراوە سیاسییەکان و دەسەڵاتەوە، بە ناوی تایبەتکردنی کەرتی گشتییەوە (خصخصة القطاع العام) لە ئەنجامیشدا بووە هۆی زیادبوونی ڕێژەی بێکاری و قووڵبوونەوەی جیاوازیی چینایەتی و بەرتەسککردنەوەی پانتایی ئازادیی ئابووری و دارایی و سیاسی و کۆمەڵایەتی... دواتریش شێواندنی چالاکییەکانی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی.

بە مەبەستی یەکڕیزیی گەلی کوردستان و هەڵدانەوەی لاپەڕەیەکی نوێ هێزە نیشتمانییە کوردستانییەکان دوای ڕاپەڕین لێبووردنێکی گشتی بۆ سەدان هەزار

بەکرێگیراو و دەستندەخۆر و پیاوی ڕژێمی بەعس دەرکرد و بەو پێیەی بەشێکی بەرچاو لە سەرکردەی ئەو بەکرێگیراوانە سەرۆك خێڵ و شێخ و بەگ و ئاغا و... بوون ئەمەش ئەگەرچی بۆ ئەو سەردەمە کارێکی دووربین و چاك بوو بۆ پاراستنی دەستکەوتەکان و یەکڕیزیی گەل، بەڵام گرنگیدانی زیاد و بەخشینەوەی جیاوگی چاوەڕواننەکراو بۆ ئەوانە، بووە هۆی گێڕانەوەی پلە و پایەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری، ئەو پلەوپایانەی بەشێکی زۆری لە سێبەری دەسەڵاتی بەعسدا لەدەستدرابوون.. دواجاریش هەر ئەو توێژاڵە کۆمەڵایەتییە بوونە هۆی خۆشکردنی ئاگری شەڕی نێوخۆ و پاشەکشەکردن بە هەندێك لە دەستکەوتەکانی راپەڕین و پتەوکردنی پێگەی ئابووری.. کۆمەڵایەتی و سیاسی و سەربازیی خۆیان لەسەر حسابی مافی هاووڵاتیان و گەڕانەوە بۆ پەیوەندییە نەریتییەکان. فیستیفاڵی خێڵەکان، مەکتەبی کۆمەڵایەتی و گەڕانەوەی ئاشتەوایی خێڵەکی (الصلح العشائري) نموونەی ئەو پاشەکشانەن. هەر ئەوەش وای لە (پ. د. ئانیمارد شمیدت کالیرت) سەرۆکی بەشی پلاندانان لە زانکۆی (دۆرتمۆند) کردووە کە پێی وابێ: کوردستان هێشتا ڕێگەی داهاتووی نەدۆزیوەتەوە. تا ئێستا بە تەواوی یەکلایی نەبۆتەوە داخۆ کۆمەڵگای کوردی دەیەوێت چ ڕێگەیەك بەرەو داهاتوو بگرێتەبەر.. هێشتا پێکهاتەی ژێرخانەکانی پێش دیموکراسی، بە تایبەتی ژێرخانی بەهێزی عەشیرەت لە ئارادایە[٤٢]. بەلای عەتا قەرەداغیشەوە، کۆمەڵگای کوردستانی کۆمەڵگایەکی دواکەوتووە و هێشتا نەبۆتە کۆمەڵگایەکی مەدەنی، تەنانەت حیزبەکانیش بە عەقڵیەتێکی ڕۆمانسی و ڕەدکرنەوەی بەرامبەر و خۆیان بە خاوەن چارەسەری هەموو کێشەکانی کۆمەڵگا دەزانن و ئەمەشیان گواستۆتەوە بۆ دەسەڵاتی کوردی، ئەو پێی وایە یەکێك لە هۆکارەکانی شەڕی نێوخۆش هەر ئەو دواکەوتوویی و عەقڵیەتە خێڵەکییە بوو، کە ناتوانێ ئەوانی تر ببینێ و قبووڵیان بکات[٤٣]. ئەم بیر و بۆچوونە تاڕادەیەکی زۆر لە ڕاستییەوە نزیکە. ئەوەش وای کردووە ئەندامێکی پەرلەمان، سەرۆکی هەرێم بە سەرۆکی خۆی نازانێ، هەر لەبەر ئەوەی خۆی دەنگی پێ نەداوە و سەر بەحیزبەکەی ئەو نییە[٤٤]!!؟

بە پێی هەندێ سەرچاوە لە هەرێمی کوردستاندا زیاتر لە هەزار ڕێکخراوی ناحکومی هەیە[٤٥]، بەڵام وەك ئاماژەمان پێدا بە هۆی تێهەڵکێشی چالاکیی ئەو ڕێکخراوانە لەگەڵ کاری حیزبیدا و هەلومەرجی ئابووری و کۆمەڵایەتی هێشتا هەنگاوی زۆر ماوە بنرێت لە پێناو بە مەدەنیکردنی کۆمەڵ.

لە ئەنجامی نەبوونی قەوارەیەکی سیاسیی یەکگرتووی سەربەخۆ لە کوردستاندا و دابەشکردنی بەسەر چوار دەوڵەتی داگیرکەری ستەمکاری دیکتاتۆریدا، پرۆسەی بە مەدەنیبوونی کۆمەڵگا لە کوردستاندا و چالاکییەکانی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی چەند پەیوەستە بە هەلومەرجی نێوخۆی کوردستانەوە، هێندەش کەوتۆتە ژێر کاریگەریی بارودۆخی ئابووری– کۆمەڵایەتی و سیاسیی ئەو وڵاتانەوە و، بە هەڵکشان و داکشانی ئەو مەرجانە پرۆسەی بەمەدەنیبوون و چالاکییەکانی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی دووچاری هەڵکشان و داکشان دەبنەوە، لە لایەکی تریشەوە ئەوەی تێبینی دەکرێت بە پێی چالاکی و کارایی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانی لە خوارووی کوردستاندا، پرۆسەی بە مەدەنیبوون و چالاکییەکانی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی کارامە و پێشکەوتووترن بە بەراورد لەگەڵ پارچەکانی تری کوردستاندا.

## ئەنجام

کۆمەڵگای مەدەنی و ڕێکخراوەکانی وەك سەرخانێکی سیستەمی سەرمایەداری لە کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوو و دیموکراسیدا سەرهەڵدەدەن و گەشە دەکەن. دیارە لە هەر قۆناغێکی گەشەکردنی ئەو سیستەمەشدا بە پێی هەلومەرجی مێژوویی و تایبەتمەندییەکانی، کۆمەڵگای مەدەنی و ڕێکخراوەکانیش شێواز و جۆری گونجاو لەگەڵ ئەو مەرجە مێژووییانەدا وەردەگرن.

بە مەدەنیبوونی کۆمەڵگا و چالاکیی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، دەسەڵاتی دەوڵەت لاواز نابێت، بە پێچەوانەوە ئەرکەکانی دەوڵەت و دەزگاکانی سووکتر دەکات و لە ڕێگەی قووڵکردنەوە و بەهێزکردنی هاوولاتیبوونەوە هاوولاتییان و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بە بەشێك لە ئەرکەکانی دەزگا دەوڵەتییەکان هەڵدەستن و دەوڵەتیش دەستبەتاڵ دەبێت بۆ ئەنجامدانی کارە سەرەکییەکانی خۆی.

لە ئەنجامی دواکەوتوویی ئابووری– کۆمەڵایەتی و سیاسی و نەبوونی قەوارەیەکی سەربەخۆی نیشتمانی و نەتەوەیی و درێژخایەنی دەسەڵاتی ستەمکاری، سەرهەڵدان و گەشەکردن و شێوازی کۆمەڵگای مەدەنی و ڕێکخراوەکانی لە کوردستاندا جودایە و خودان تایبەتمەندیی خۆیەتی...

بە هەڵکشان و داکشانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانی، پڕۆسەی مەدەنیبوون و گەشەکردنی ڕێکخراوەکان لە هەڵکشان و داکشاندا بوون، تا ئاستێك هەندێ جار پچڕپچڕی و تەمومژاوی و شپرزەیی پێوە دیار بووە، بۆیە ئەو پرۆسەیە لە خوارووی کوردستاندا بە بەراورد لەگەڵ پارچەکانی تری کوردستاندا دیارتر و پێگەیشتووترە. مانەوە و پارێزگاریکردنی پەیوەندییە نەریتییەکانی پێش سەرمایەداری بە تایبەتی سیستەمی خێڵایەتی ئاستەنگێکی گەورەن لە بەردەم گەشەکردنی ئابووری– کۆمەڵایەتی و سیاسی لە کوردستاندا و پرۆسەی بە دەزگاییکردن و دیموکراتیزەکردن و گەشەکردن و چالاککردنی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنیشی دواخستووە.. لەلایەکی تریشەوە تێهەڵکێشی دەسەڵاتی حیزب و دەزگا ئاینییەکان و حکومەت پرۆسەی مەدەنیکردنی لە هەرێمی کوردستاندا شێواندووە.

ئەگەرچی بە مەدەنیبوون و چالاکی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بەستراونەتەوە بە ئاستی دیموکراسی لە کۆمەڵگادا و تا پرۆسەی بەدیموکراسیبوون قووڵتر و فراوانتر بێت پانتایی مەدەنیبوونی کۆمەڵگا و چالاکییەکانی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی زیاتر دەبێت، لە هەمان کاتیشدا چالاکبوونی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و بە مەدەنیبوون پرۆسەی دیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگا بەهێزتر دەکات.

بەمەدەنیبوونی کۆمەڵگای کوردستانی و چالاکییەکانی ڕێکخراوە مەدەنییەکان لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکەوە هەنگاوی گەورەیان بەرەو پێش ناوە، بەڵام بۆ پتەوکردنی بنەماکانی کۆمەڵگای مەدەنی و چالاکترکردنی ڕێکخراوەکانی پێویستە گرنگی بدرێت بە گەشەکردنی ئابووری– کۆمەڵایەتی و سیاسی لە کوردستاندا و بە چەسپاندنی بنەماکانی دیموکراسی و مافی مرۆڤ کۆمەڵگای مەدەنی و ڕێکخراوەکانی زیاتر بەرەو پێشەوە دەچن.

## پەراوێزەکان:

١. بۆ زیاتر زانیاریی سەبارەت بە دەوڵەتشار و سەرهەڵدان و گەشەکردنی بڕوانە: دیاکۆنۆڤا ئی. م.، نیرۆ نۆڤۆی ڤ. د، سڤێنتسیسکۆی ئ. س، مێژووی دێرینی جیهان، بەرگی یەکەم، مۆسکۆ ١٩٨٣، ل ٤٩-١١١. (بە زمانی رووسی).

٢. إفلاطون، الجمهورية ٢٤.

٣. إفلاطون، هەمان سەرچاوە ٢٧٠.

٤. جون ارنبيرغ، المجتمع المدني من اليونان حتى القرن العشرين، ت: حسين ناظم وعلي حاكم صالح، معهد الدراسات الاستراتيجية، بغداد- اربيل- بيروت ٢٠٠٧ ص٤٧.

٥. رامین جیهانبگلو، سەرهەڵدان و پێکهاتەی فەلسەفی چەمکی کۆمەڵی مەدەنی، وەرگێڕانی لە فارسییەوە: سۆران عەبدوڵڵا، گۆڤاری مەدەنیەت، ژ ١٣-١٤، ٢٠٠٢، ل. ٦٩-٧٠.

٦. جون ارنبيرغ، المجتمح المدني من اليونان. ص.. ٧٧.

٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل. ١٥٩.

٨. رامین جیهانبگلو، هەمان سەرچاوە. ل٧٠.

٩. بۆ زانیاریی سەبارەت بەو گۆڕانکارییانە بڕوانە:

أ. د. محمد محمد صالح، تاريخ اوروبا من عصر النهضة وحتى الثورة الفرنسية، كلية الآداب- جامعة بغداد.

ب. فيشر هـ. أ. ل.، تأريخ اوروبا في العصر الحديث ١٧٨٩-١٩٥٠ تعريب: احمد نجيب هاشم، وديع الضبع، دارالمعارف- مصر ١٩٧٢.

١٠. Smith Adam, An Inquiry in to the nature and causes of the wealth of nations, ed. Kathryn Suther land. Oxford: oxford university press 1993, p.

11. جون ارنبيرغ، المجتمع المدني... ص ٢٥٠

١٢. هيجل ج. ف.ف. محاضرات في فلسفة التأريخ (العقل في التاريخ) ج ١.ت: إمام عبدالفتاح امام، القاهرة، ١٩٨٠ ص ١٢٤-١٢٥.

١٣. هيجل. ج. ف. الاعمال الكاملة، اصول فلسفة الحق، ت: إمام عبدالفتاح إمام، القاهرة ١٩٩٦ ص ٤٢٦.

١٤. Karl Marx, Economic and Philosophical man scripts of 1844, 3, p. 280.

١٥. جون ارنبيرغ، المجتمع المدني... ص ٣٢٢.

١٦. علي عثمان، الاستلاب تحطيم العقل، دمشق- بيروت ٢٠٠٤، ص١٣١.

١٧.د. تيسير الناشف، السلطة والفكر والتغيير الاجتماعي، عمان ٢٠٠٣. ص ٢٥٩.

١٨. بونیادی میهەن، کۆمەڵی مەدەنی هێزێکی نوێ- چەند ڕێنماییەکی سەرەتایی دەربارەی دامەزراندنی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی، وەرگێڕانی: ڕێبوار یەڵدا، چاپخانەی ڕۆکسانا، ٢٠١٢. ل ١٣.

١٩. د. دلێر شاوەیس، کۆمەڵگەی مەدەنی، بابەتێکە پێشکەش بە وەرشەکاری (ۆرك شۆپ) ڕۆڵی ڕێکخراوە مەدەنییەکان لە عێراقدا لە دروستکردنی کۆمەڵگەی مەدەنی- لە ڕۆژی ٨ ئەیلولی ٢٠١٢ لە کەرکوك بەسترا لەلایەن فیدراسیۆنی ڕێکخراوە مەدەنییەکان لە کەرکوك.

٢٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢١. مجتمع – مدنی ar.wikipedia.org./wiki

٢٢. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: بونیادی میهەن، کۆمەڵی مەدەنی هێزێکی نوێ... ل ٦٩-٨٩.

٢٣. هەمان سەچاوەی پێشوو، ل. ٥٤-٥٥.

*.بڕوانە

أ.http://www.un.org/ar/civilsociety

ب.-http://www.france24.com/ar/20130708

ج. جريده شرق الأوسط 8/8/2013

٢٤. نريه شحادة، صفحات من الحضارة الاسلامية، بيروت، ٢٠٠٦، ص ٣٩٤.

٢٥. بڕوانە:

أ. محمد أمین زکی، کورد و کوردستان، جلد ١-٢-٣، چاپخانەی دار السلام، بغداد ١٩٣١.

ب. دێڤید ماکداول، مێژووی هاوچەرخی کورد، بەرگی یەکەم، وەرگێڕانی: ئەبو بەکر خۆشناو، سلێمانی ٢٠٠٢، ل ٥١-٢٤٢.

ج. د. عبدالرحمان قاسملو، کوردستان و کورد- لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی و ئابووری، وەرگێڕانی: عبدالله حسن زادە، ١٩٧٣.

٢٦. سەبارەت بە شێوەی بەرهەمهێنانی ئاسیاوی بڕوانە:

أ. جان سوريه كانال & موريس غودلييه و آخرون، حول نمط الانتاج الآسيوى، ت: جورج طرابيشى، بيروت، ١٩٧٨.

ب. لانكة، الاقتصاد السياسي، ت: محمد سلمان حسن، ١٩٦٧ ص ٣٨٤.

ج. ابراهيم كبة، دراسات في تأريخ الاقتصاد والفكر الاقتصادي، بغداد ١٩٧٣، ص ١٢٦-١٣٧.

د. فەرید ئەسەسەرد، دەربارەی شێوەی ئاسیایی بەرهەمهێنان لە کوردستاندا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ناوەندی ڕۆشنبیری کۆمەڵە ١٩٨٧. هـ. هابرماس، کۆمەڵی شارستانی لە ڕۆژهەلات، خوێندنەوەیەکی کتێبی ستەمی ڕۆژهەلات، وەرگێڕانی: محمد جواد مصطفى، ل ١٢٩-١٣٠، گۆڤاری مەدەنیەت، ژ: ١ ساڵی ١٩٩٨.

٢٧. هیوا عزیز سعید، ڕەنگدانەوەی بیری لیبراڵی لە باشوری کوردستان ١٩٠٠-١٩٥٨، لێکۆڵینەوەیەکە لە مێژووی بیری سیاسی، سلێمانی ٢٠٠٦، ل١٤٩.

٢٨. بۆ زیاتر زانیاریی سەبارەت بە ڕۆژنامەی کوردستان بڕوانە: کوردستان یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی ١٨٩٨-١٩٠٢ کۆکردنەوە و پێشەکی د. کەمال فوئاد، بەغدا ١٩٧٢.

٢٩. د. عبدالستار طاهر شريف، الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكردية في نصف قرن ١٩٠٨-١٩٥٨، بغداد ١٩٨٩.

٣٠. مەدەنیەت ژ:١، ساڵی ١٩٩٨. ل٣.

٣١. سەبارەت بە یەکێتی کوردان بڕوانە:

أ. جەمال میرزا عەزیز، لە تاریکییەوە بۆ ڕووناکی- بەڵگەنامەکانی شۆڕش ١٨٨٠، سلێمانی ١٩٩٩ ل. ١١.

ب. محەمەد حەمە باقی، شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەی قاجاریدا، هەولێر ٢٠٠٠، ل ٧٧.

ج. ڕوبەرت ئولسن ڕاپەڕینی شێخ سەعیدی پیران، و: ئەبو بەکر خۆشناو، سلێمانی ١٩٩٩. ل ٢٢.

د. دیڤد ماکداول، مێژووی هاوچەرخی کورد، و: ئەبو بەکر خۆشناو ب. ١، سلێمانی ٢٠٠٢، ل. ١٢٦.

هـ. عەزیز شەمزینی، جوولانەوەی رزگاری نیشتمانی کوردستان، و: فەرید ئەسەسەرد، سلێمانی ١٩٩٨، ل ٨٢.

٣٢. د. عبدالستار طاهر شریف، سەرچاوەی پێشوو، ل. ١١ و دواتر.

٣٣. کۆماری میللی مەهاباد- لێکۆلینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە. ١٩٧٩. ل ١٤٧- ١٤٨، جلال طالبانی کوردستان والحرکة القومیة الکوردیة. ص١٦٤.

٣٤. عارف روشدی عارف، کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا ١٩٥٦-١٩٧٥ سلێمانی ٢٠١٢، ل ٢٣.

- سمایلی ماملێ، کۆماری دیموکراتی کوردستان ١١ مانگ و ٢٠ رۆژ بەختەوەری - کۆتایی و تراژیدیای کۆمار ١٩٤٦-١٩٤٧ سلێمانی ٢٠١٣. ل ٦٠.

- یەکێتی قۆتابیان و لاوانی دیموکراتی کوردستان- عێراق، روونکردنەوەیەك لەمەڕ ڕێکخراوە جەماوەرییە کوردستانییەکان- بلاوکراوەیەکی ناوخۆ.

٣٥. علی خۆش سوخەن، چەمکی کۆمەڵی مەدەنی لەبەرانبەر کۆمەڵی ئیستبدادیدا، وەرگێڕانی لە فارسییەوە: پێشڕەو حسێن، گۆڤاری مەدەنیەت ژ: ١٣و ١٤ ئاب- ئەیلول ٢٠٠٢، ل ١٢.

٣٦. بۆ زانیاریی زیاتر سەبارەت بە شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨و دەستکەوتەکانی بڕوانە: ئاشیریان ش. چ. بزاڤی ناسیۆنالیستی و دیموکراسی لە کوردستانی عێراقدا ١٩٦١-١٩٦٨، مۆسکۆ ١٩٧٥ ل. ٤٣- ٤٥ (بە زمانی رووسی).

٣٧. بۆ زیاتر زانیاریی سەبارەت بە رووداوەکانی کەرکووك بڕوانە:

أ. د. عبدالفتاح علي البوتاني، العراق- دراسة في التطورات السیاسیة الداخلیة ١٤ تموز ١٩٥٨- ٨ شباط ١٩٦٣، دمشق ٢٠٠٨، ص ٢٢١-٢٣٣.

ب. د. شیرکو فتح الله عمر، الحزب الدیمقراطي الکوردستاني وحرکة التحرر القومي الکوردیة في العراق ١٩٤٦- ١٩٧٥ سلیمانیة ٢٠٠٤، ص ١٤٠.

ج. میڤان عارف بادي، الحرکة القومیة الکوردیة التحرریة في کوردستان العراق ١٩٥٨- ١٩٦٣، اربیل ٢٠٠٥، ص ٧٦-٨٢.

د. حبیب محمد کریم، تأریخ الحزب الدیمقراطي الکردستاني، دهوك ١٩٩٨، ص ٥٨-٥٩.

٣٨. ئاشیریان، هەمان سەرچاوە ل. ٤٥-٥٦.

.٣٩

أ. دیڤد ماکداول، مێژووی هاوچەرخی کورد، بەرگی دووەم، سلێمانی ٢٠٠٣، ل ٦٦٩–٦٩١.

ب. دلێر اسماعیل حقی، تایبەتمەندییەکانی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی– ئابووری و سیاسی لە کوردستانی عێراقدا لە ساڵانی ١٩٦٠و ١٩٧٠کاندا، مۆسکۆ ١٩٨٧، ل ١١٠–١١٥ (بە زمانی رووسی).

ج. فەرەیدوون عەبدولرەحیم عەبدوڵڵا، بارودۆخی سیاسی کوردستان – عێراق ١١ مارتی ١٩٧٠– ١١مارتی ١٩٧٤، هەولێر ٢٠٠٨، ل ٨٠.

د. بيان الحادي عشر من آذار، حول حل المسألة الكردية في العراق، دار الحرية– بغداد ١٩٧٤، ص ١٣.

٤٠. دلێر اسماعیل حقی، هەمان سەرچاوە، ل ١١٥–١٢٥.

٤١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لە ١٢٥–١٣١.

٤٢. رۆژنامەی باس، ژ ٩٦، ٢٠١٢.٠٦.٠٥.

٤٣. عەتا قەرەداغی، عەقڵی سیاسیی کورد و قەیرانی متمانە، گۆڤاری سیڤیل، ژ: ١١١ ساڵی سێیەم ٢٠١١.١٢.١٠. ل ١٥–١٧.

٤٤. رۆژنامەی خەبات، ژ: ٤٣٥٦ لە ٢٠١٣.٠٧.٠٧ ل، ١٦.

٤٥. رۆژنامەی خەبات، ژ ٤٣٥٣ لە ٢٠١٣.٠٧.٠١، ل ٥.

## ملخص البحث

اصبح المجتمع المدني ونشاطات منظماته من مستلزمات وجود المجتمع الحضري المعاصر، بحيث تقاس الديمقراطية الدفاع عن حقوق الانسان بمدى نشاط منظمات المجتمع المدني.

يتطرق هذا البحث الى المجتمع المدني ومنظماته، وظروف نشأته وتطوره والاسس الفلسفية والتأريخية حسب المراحل المختلفة لتطور المجتمع البشري وخصوصيات تلك المنظمات وانواعها ومهامها.

وقد خصص جانب من البحث لدراسة خصائص المجتمع المدني ومميزاته في كوردستان، وظروف وملابسات نشوئها وتطورها وخصوصيات المجتمع المدني ومنظماتها في كوردستان، وأسباب تأخر نشوئها وضعفها، ثم عرض للاستنتاجات التي توصل اليه البحث.



## Abstract

The civil society and their activities have become part of the contemporary civilized society to such an extent that the level of democratization and human rights are measured against the range of activities performed by civil society organizations.

Accordingly, this paper is intended to study the civil society and its organizations, the conditions under which they grow and flourish, its historical and philosophical grounds through the different stages, the level of human society development, the characteristics of civil society organizations and their types, and their duties and functions.

# ڕاپۆرتی کارگێڕی دەربارەی
# ناوچەی کۆیسنجاق (کۆیە) لە ساڵی ١٩١٩ دا*

و. لە ئینگلیزییەوە: د. شەماڵ حەوێزی

## سیاسی

### داگیرکردن

لە سەرەتای تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨ دا، تورکەکان وازیان لە کۆیە هێنا و شارەکەیان خستە ژێر ڕەحمەتی عەشیرەتەکانی دەوروبەری. لە ناوەڕاستی مانگی کانوونی یەکەمدا، ئیرەیی هاوبەشی ئاغاکان (مەبەست ئاغاکانی هەردوو عەشیرەتی پیران و بڵباسە – وەرگێڕ) تا ڕادەیەك نەهامەتییەکانی پتر کرد و پاش چەند ڕۆژێك شارەکە بەتەواوی چۆل کرا. لەم ساتەوەختە ئەستەمەدا برووسکەیەکی (تێلگراف) فریاخواز ئاڕاستەی مووسڵ کرا، کە داوای لە بەریتانیا دەکرد بە هاواریانەوە بێت و پارێزگارییان لێ بکات. ئەم برووسکەیە بە خواستی زۆربەی هەرەزۆری بەرپرسە فەرمییەکانی شارەکە بوو. ئەوەبوو لە سەرئەنجامی ئەم کارەدا، فەرمان درا بە کاپتەن ویلیەم روپێرت هەی (یاریدەدەری حاکمی سیاسی[1] (A.P.O.) لە پردێ (ئاڵتوون کۆپری)، تاکو بەرەو کۆیە پێشڕەوی بکات.

کاپتەن ویلیەم هەی، دەوروبەری نیوەڕۆی ڕۆژی ١٥ کانوونی یەکەم (١٩١٨) گەیشتە کۆیە و لەلایەن حاکمی شار، حەماغای غەفووری[2] پێشوازی لێ کرا، لەم سەروبەندەدا هەموو لایەك دانیان بە دەسەڵاتی شێخ مەحموود دادەنا ( لەم ڕاپۆرتە و لە کتێبەکەی کاپتەن هەی "دوو ساڵ لە کوردستان" دەردەکەوێت کە حاکمی شارەکانی وەك کۆیە، ڕواندز و شەقڵاوە هەرچەندە دانیان بە دەسەڵاتی شێخ مەحموود دانابوو وەك حوکمداری (Hukumdar) باشووری کوردستان، بەڵام لە هەمان کاتیشدا دەیانویست هەر خۆیان حاکم و دەسەڵاتداری شار و ناوچەکانیان بن و دەسەڵاتی شێخ مەحموود لە قەڵەمڕەوی لیوای سلێمانیدا تێپەڕ

نەکات – وەرگێڕ). بە مەبەستی دەستگرتن بەسەر ناوچەکەدا ململانێ، ئیرەیی و تەنگەتاوییەکی زۆر لە نێوان لایەنە ڕکابەرەکاندا هەبوو، ئەم بارودۆخە هەستیارە بە گەیشتنی شێخ عوسمان[٣] لە سلێمانییەوە پتر تەشەنەی کرد بە تایبەتیش کەوا ڕایگەیاند کە ئەو لە لایەن شێخ مەحموودەوە بە فەرمانڕەوای کۆیە دانـدراوە. لـە ئاکامدا شێخ عوسمان ڕۆیشت و لایەنە ڕکابەرەکانیش ئاشت بوونەوە.

## ڕێکخستن

ڕووبەری ناوچەی کۆیە هەزار میل دووجایە، ژمارەی دانیشتووانەکەشی ٢١٤٨٨ کەسە، کە ٤٠٠٠ کەسیان دانیشتووی ناو شارەکەن و کوردە سوننەکان ژمارەیان نزیکەی ٢٠٥٨٤ کەسن لە کۆی سەرجەم دانیشتووانی ناوچەکە، کریستیانەکان ٥٨٠ کەس و جوولەکەش ٣٢٤ کەسن. زابی بچووك دەکەوێتە باشووری ناوچەی کۆیە و ناوچەی ڕواندزیش دەکەوێتە باکووری، ناوچەی ڕانیەش دەکەوێتە ڕۆژهەڵات و ناوچەی هەولێریش سنووری ڕۆژئاوایەتی.

بەمەبەستی هەڵسووڕاندنی کاروبارەکان، ناوچەکە بە سەر دوو قەزادا دابەش کرا هەر یەکێکیشیان لە لایەن حاکمێکی شار فەرمانڕەوایەتی دەکرێت و لەژێر سەرپەرشتی تۆکمەی یاریدەدەری حاکمی سیاسیدان. قەزای کۆیە بەسەر دوو ناحیەی نا– عەشایری (تەقتەق و بانیماران) و عەشیرەتی گەردی دابەش کرا، حاکمی شاریش ڕاستەوخۆ کاروباری ناحیەی ناوەندی بەڕێوەدەبرد.

قەزای شەقڵاوە بە تەواوی لە لایەن هەردوو عەشیرەتی خۆشناو و کۆڕە کۆنترۆڵ کراوە، قەزاکەیش بەسەر سێ بەشەکەی خۆشناو دابەش بووە، میرمەحمەلی، میریووسفی و پوشگالی و عەشیرەتی کۆڕەش (Kora) لە چوار بەش پێکهاتووە. حاکمی شار میرانی قادر بەگی (میر مەحمەلی)، سەرۆکی عەشیرەتی خۆشناوە، هەر یەکێك لە چوار بەشەکەی کۆڕەش لە لایەن سەرۆکی خۆیەوە فەرمانڕەوایەتی دەکرێت.

تا ناوەڕاستی مانگی نیسانی ساڵی ١٩١٩، هەردوو قەزای ڕانیە و قەڵادزێ لە لایەن یاریدەدەری حاکمی سیاسیی کۆیە بەڕێوە دەبردران، بەڵام لە دوای ئەو

ڕێکەوتەوە بووە ناوچەیەکی سەربەخۆ (ناوچەی ڕانیە دوایی کرایە قەزای ڕانیە – وەرگێڕ) و بووە خاوەن یاریدەدەری حاکمی سیاسیی تایبەت بە خۆی.

## عەشیرەتەکان و توێژەکان

کەسە سەرەکییەکانی کۆیە دەکرێ بە سەر سێ گرووپدا دابەش بکرێن: غەفووری، حەوێزی و عولەما. حەماغای سەرۆکی غەفوورییەکان وەك کەسایەتییەکی سەرکردەی کۆیەش دێتە بەرچاو، بەڵام بۆ پەیوەندییەکانی پێویستی بە کەسایەتییەکی بەهێز و خوێندەوار هەیە. حەماغا پیرەمێردێکی نائاساییە و خاوەن ڕابوردوویەکی جەنجاڵ و پڕ لە گرژییە. هەرچەندە تەمەنی ٨٣ ساڵە بەڵام مێشکی زۆر چالاك و بەکارە، بەڵام مخابن بەگشتی بۆ داڕشتنی پلان و بەزاندنی نەیارە زۆر و زەبەندەکانی بەکاری دەهێنا، پلانەکانیش دەبوایە بە وردی داڕێژرابان تاکو نەبنە مایەی تووڕەیی ئەو جەنگاوەرە پیرە. حەماغا لایەنگرێکی بەوەفای بەریتانیا بوو و دانی بە دەسەڵاتی شێخ مەحموود نەدەنا مەگەر لە ژێر حوکمی بەریتانیادا بێت.

حەوێزییەکان بە سەرۆکایەتی عەولاغا[٤] بنەماڵەیەکی ڕووناکبیرترن لە غەفوورییەکان، بەڵام هەمان کاریگەریی ئەوانیان نییە. حەوێزییەکان لەلایەن تورکەکان پتر لایەنگیرییان لێ دەکرا بۆ ئەوەی دەسەڵات لە غەفوورییەکان وەربگرنەوە، ئەم دوو بنەماڵەیە بەردەوام ڕکابەری یەکترن. عەولاغا پیاوێکی ڕووناکبیرە، بەڵام ئیرەیی و تەماحکاری مێشکیان تەنیوە. لە دوای داگیرکردنی کۆیە عەولاغا چاوی بڕیبووە پۆستێکی حکوومیی باش، دیارە پەیداکردنی پۆستێکی لەم چەشنە بۆ پیاوێك لە دۆخی ئەودا، کارێکی ئاسان نییە. لەو کاتەی شێخ مەحموود لە مانگی ئایاردا لە دژی حکوومەت (مەبەست ئیدارەی مەدەنی بەریتانیایە لە عێراق کە دوای ئینتداب دامەزرا و سەر بە تاجی بەریتانی بوو – وەرگێڕ) ڕاپەڕی، هەموو دەرفەتێك بە عەولاغا درا تاکو وەلای خۆی بۆ بەریتانیا بە ڕاشکاوی بسەلمێنێت، بە هەر حاڵ ئەو تا ڕادەیەك کاڵفام بوو، چونکە دەیویست لەگەڵ کەروێشکە کێوییەکان ڕابکات و لەگەڵ تانجییەکانیش ڕاو بکات، سەرەنجام ئەو وەرزێك لە بەغدا نیشتەجێ بوو.

کۆیسنجاق کە بە "دارولعولەما" ناوبانگی دەرکردووە، پڕیەتی لە مەندیل سپی (مەلا) دەستکورت و هەر هەموویان داوای مووچە دەکەن. پێدەچێت هیچ ڕۆڵێکیان لە سیاسەتی خۆجێییدا نەبێت. مەلا محەمەد[٥] "حاکمی شەرع" ە، ناوبانگی بەوە دەرکردووە کە زانایەکی زۆر خوێندەوارە لە سەر ئاستی میزۆپۆتامیا و کوردستان. ئەو زۆربلێیەکی ئیلاهییە، کە دەستی بە قسان کرد هەرگیز وەستانی نییە، قسەکانیشی سەنگێکی گەورەیان لە ناوچەکەدا هەیە. ئەو لە کاتی شۆڕشی شێخ مەحموودا پشتگیرییەکی بە هێزی لە حکوومەت کرد.

جەمیل ئاغا[٦](جێگری حاکمی کۆیە)، لێرەدا بڕگەیەك پێویستە بۆ باسکردنی ئەو پیاوە. جەمیل ئاغا وەك حەوێزییەك لە دایك بووە و بە تەبەنیش غەفوورییە، بەو پێیەی کە حاجی ئەسعەد ئاغای باوکی لە سەرەمەرگیدا داوای لە حەماغا کردبوو بیخاتە ژێر سەرپەرشتی خۆی. ئەو لە ڕێگەی هاوسەرگیریشەوە[٧] خزمایەتی لەگەڵ غەفوورییەکان هەیە، لە ململانێی نێوان هەردوو بنەماڵەدا لایەنگیری هیچیانی نەدەکرد. جەمیل ئاغا پیاوێکی میانەڕۆیە و خاوەنی تێڕوانینێکی پێشکەوتووانەیە، تاموچێژێکی ڕاستەقینەی لە بەختەوەری خەڵك وەردەگرێت. بە درێژایی ئەو مانگە جەنجاڵ و پڕ لە ئاشووبەی دوای کودەتاکەی شێخ مەحموود، جەمیل ئاغا دەستە ڕاستی A.P.O. بوو، ئەو بە شێوەیەکی دڵسۆزانە فەرمانەکانی A.P.O.ـی جێبەجێ دەکرد، ڕێنماییەکانیشی هەمیشە جێگەی متمانە بوون. جەمیل ئاغا زۆر شایستەی ئەوەیە کە دوای کۆچی دوایی حەماغا ببێتە حاکمی شار.

***گەردی*** : ئەم عەشیرەتە لە ڕۆژئاوای ئەو ناوچەیە نیشتەجێن کە بە گوندەکانی دێگەڵە، حاجی یوسف، ئەشکەوسەقا و هەناره دەورە دراوە. ژمارەیان ٣٥٠ کەسە و زۆربەیان جووتیارن، عەشیرەتەکە لە بنەڕەتدا ناووناتۆرەی ڕێگرییان لەسەرە، بەڵام لەلایەکی تر بە درێژایی ساڵ بە ئاشتی دەژیان. سەرۆکی عەشیرەتەکە عارەب ئاغایە، ئەو پیاوێکی بەتوانایە بەڵام لە شێخ محەمەد ئاغای ئامۆزای تۆقیوە، کە خاوەن خوێندەواری و کەسایەتییەکی بەهێزە. شێخ محەمەد ئاغا پیاوێکی خەسیسە، پێش ماوەیەکی کورت پیلانێکی تۆکمەی داڕشتبوو بۆ

ئەوەی کابرایەك ناچار بکات ئاشەکەی پێ بفرۆشێت. هەردوو ئاغا بەهۆی کێشەی میراتەوە نێوانیان خراپە. ئەوان پەیوەندییەکی خزمایەتییان بە هۆی ژنخواستنەوە لەگەڵ عەشیرەتی بڵباسی نیشتەجێی ناوچەی ڕانیە هەیە. بەشێکی عەشیرەتی گەردی دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی جەمیل ئاغا لە ناوچەی هەولێر.

***خۆشناو:*** ژمارەی ئەم عەشیرەتە ١٠٥٠ کەسە و دابەش بووە بە سەر سێ بەشدا، میرمەحمەلی ، میریوسفی و پوشگالی. پوشگالی لە دوو دۆڵدا لە باشووری ڕۆژهەڵاتی سنووری قەزای شەقڵاوە نیشتەجێن، بەڵام دوو بەشەکەی تر گوندەکانیان بەسەر تەواوی قەزاکە دابەش بووە. هەر سێ بەشەکەی خۆشناو پەیوەندی برایانەی خۆیان لەگەڵ یەکتریدا پاراستووە. بەگشتی عەشیرەتەکە تەواو ملکەچی قانوونە.

تووتن بە شێوەیەکی فراوان لە ڕۆژهەڵاتی ناوچەکە دەچێندرێت. لە ڕۆژئاوای ناوچەکەش ڕەزی مێو بناری گردۆڵکەکان دادەپۆشێت. شەقڵاوە دار و میوەیەکی زۆر دێنێتە بەرهەم کە لە باشووری وڵات بازاڕی مسۆگەری هەیە.

حاکمی شاری شەقڵاوە میرانی قادر بەگە (میرمەحمەلی)، تەمەنی نزیکەی ٣٥ ساڵە و کەتە زەلامێکی قەڵەوە و شێوەی مەلیك هنری هەشتەم دەدات، تەبیعەتێکی وشك و لەخۆبایی هەیە. بە شێوەی گشتی نەخوێندەوارە و تەنیا کوردی و تورکی دەزانێت. کاتێك هەواڵی شۆڕشەکەی شێخ مەحموود گەیشتە شەقڵاوە خەڵك خۆی بۆ جەنگ ئامادە کرد، میرانی قادر بەگیش هەرچەندە لە لایەن A.P.O. داوا کرابوو، بەڵام سەردانەکەی بۆ کۆیە دواخست، پاش ئەوەی بۆی روون بووەوە کە کۆیە لایەنگیری لە کام لایەن دەکات، ئینجا هاتە کۆیە. لە دوای گەڕانەوەی بۆ شەقڵاوە خەڵکی دڵنیا کردەوە و ئارامیی قەزاکەشی پاراست و تارمایی مەترسیی ئاشووبی ڕەواندەوە.

هەوڵە ناکامەکەی شێخ مەحموود بۆ ڕووخاندنی حکوومەت، بێگومان دەرسێکی بە قادر بەگ دا، هەروەها درکیشی بە سوودەکانی حوکمڕانیی بەریتانیا کرد. ئەو ئێستا بە باشی حوکمڕانی قەزای شەقڵاوە دەکات.

***ئەحمەد میدحەت ئەفەندی*** – کاتبی حاکمی شاری شەقڵاوە بوو، کەسێکی کەڵەکبازی بە ڕواڵەت مەعقوول بوو و تەئسیرێکی ئەوەندە باشی لەسەر میرانی قادر بەگ نەبوو. بۆیەش لە پۆستە گرنگەکەی لادرا و ڕێگەشی پێ نەدرا چیتر لە شەقڵاوە نیشتەجێ بێت.

***میرانی ڕەشید بەگ*** – سەرۆکی میرمەحمەلییە، پیاوێکی قەڵەوی دەنگ بەرزە و تەمەنی دەوروبەری ٣٠ ساڵە، خوێندەوارە و توانستی قسەکردنی بە زمانی عەرەبی و فارسی هەیە، ئەو پیاوێکی خۆشمەشرەبە، بەڵام گومان هەیە لەوەی کاتێك دەسەڵات بگرێتە دەست بتوانێت دادپەروەرانە فەرمانڕەوایی بکات. ئیرەیییەکی گەورە لە نێوان خۆی و میرانی قادر بەگی زڕ برایدا هەیە.

*میرانی ساڵح بەگ* – سەرۆکی میریووسفییە. پیاوێکی قۆز و بەوەجی تەمەن ٤٥ ساڵە، زمانی تورکی و فارسی دەزانێ و خوا بەهرەیەکی باشی پێ بەخشیوە. لە کۆڕ و کۆبوونەوەی خۆشناوەکاندا کاریگەرییەکی زۆر و پڕ بایەخی هەیە. بە مەزەندەیەکی زۆر لە کاتی یاخیبوونەکەی ( شۆڕشەکەی) شێخ مەحموود، ئەو بەرپرسی بنەڕەتی پاراستنی ئاشتیی هۆزەکەی بووە.

***میرانی ئەحمەد بەگ*** – سەرۆکی پوشگالییە، پیاوێکی لاواز و نەخۆشی تەمەن ٥٥ ساڵە و زۆر هێمن و خاکییە. هەرچەندە کەسێکی سەقامگیرە، بەڵام بێ کەسایەتییە. جڵەوی کاروبارەکانیشی کەوتۆتە دەست کوڕە خۆشەویستەکەی، ڕەشید بەگ، کە وا پێدەچێت کابرایەکی نەفام و دەست بڵاو بێت.

**کۆڕە** [٨] – ئەم هۆزە بچووکە لە ڕۆژئاوای قەزای شەقڵاوە نیشتەجێیە، بەم گوندانەش دەور دراوە: دۆنگزاوا، سێوکە، بانەمان، زیارەت، شێخ ماموودیان، ئاشگە، زرگوز، ئەرماوان، کۆڕێ و گۆڕەشێر. ژمارەی ئەم هۆزە ٧٥٠ کەسە و زۆربەیان جووتیارن. کۆڕە پەیوەندی باشی لەگەڵ خۆشناو هەیە، بەڵام لەگەڵ هاوسێیەکەی تری "گەردی" دانوویان پێکەوە ناکوڵێت.

لە سەردەمی تورکەکاندا ، کۆڕە سەر بە قەزای ڕواندز بوو، بەڵام دوای داگیرکردنی کۆیە بووە سەر بە قەزای شەقڵاوە. مستەفا ئاغای سەرۆکی ئەم عەشیرەتە پیاوێکی قۆزی باڵابەرزە و تەمەنی نزیکەی ٥٠ ساڵە، خوێندەوارییەکی

كـەمی هەیـە و نـەختێك فارسـیش دەزانێـت، بـەڵام كەسـایەتییەكەی لاواز نییـە، پێدەچێت مسـتەفا ئاغـا نەیـەوێت لـە مەجیـد ئاغـای بـرای دابڕێـت، كـەوا دیـارە كەسێكی زۆر جوامێرە. مستەفا ئاغا لە ڕێگەی هاوسەرگیرییەوە خزمایەتی لەگـەڵ میرانی ساڵح بەگ (میریووسفی) هەیە.

***رامیاری:*** سیاسەتی سەرەتای حكوومەت لەم ناوچەیە بریتـی بـوو لـە دانـانی شێخ مەحموود بـە "حوكومـداری"(Hukumdar) باشـووری كوردسـتان، هـەروەها كـرا بـە بەرپرسـیاری ڕاسـتەوخۆی "حاكمـەكانی شـار"، كـە قـەزاكانیان بـەڕێوە دەبرد. ڕۆڵی .A.P.O لە ڕاوێژكارێكی حاكمی شـار پـترە، لـە واقیعـدا ئیدارەیـەكی باڵادەستە. لەبەر ئەو ڕاستییەی كە هەر كاتێك حاكمی شار بڕیارێكی مەترسـیداری دەربكردبایە، ئەوا خەڵك هاواریان بۆ .A.P.O دەهێنا. ئـەو كاتـەش.A.P.O ناچـار دەبوو دەستبەكار بێت (تەدەخول بكـات) بـۆ ئـەوەی پێكـدادان و زوڵـم و زۆر ڕوو نەدات. سەرەنجام .A.P.O بووە حاكمی باڵا دەستی شار. دەسـەڵاتی .A.P.O لـە دوای لەسەر كار لابردنی شێخ مەحموود بـووە دەسـەڵاتێكی بـێ ڕكابـەر (ڕەهـا) و حـاكمی شـارەكانیش وەك نوێنـەری ئـەو دەسـەڵاتەیان لـێ هـات. ئـەم شـێوازە حوكومڕانییە بێ گومان لەلایـەن خەڵكـەوە پێشـوازی لـێ كـرا، چـونكە دەیـانزانی ئێستا بڕیارەكان بە بێلایەنی (دادپەروەرانە) وەردەگیرێن، كە لەلایـەن ئاغاكانیـان دادپەروەرانە نەبوو، بەڵكو بە پێچەوانەوە بوو.

وەك پێشتر باسی لێوە كرا، كاپتـەن هـەی یەكـەمین یاریـدەدەری حـاكمی سیاسیی كۆیە بوو، ئـەو تـاكو دەسـت لەكارهـەڵگرتنی لـە ٢٠ـ ی شـوباتی ١٩١٩ لەوێ ماوەتەوە. لە ماوەی نێوان ڕۆیشتنی كاپتەن هەی تاكو هاتنی كاپتەن سـی. تـی. بییـڵ لـە یـەكی ئـادار، كاپتـەن ئـاڕ. ئـی. باركـەر، كـە لـە ٢٠ـ ی كـانوونی دووەمەوە ببووە یاریدەدەری كاپتـەن هـەی، بـوو بـە بەرپرسـیاری ناوچـەكە. لـە ٢٥ـ ی نیسـان كاپتـەن ئـار. ئـی. باركـەر بـووە بەرپرسـی ناوچـەی تـازە دروستكراوی ڕانیە. لە ١٨ی نیسان كاپتەن سی. ئەی. جـی. ڕەنـدەڵ ئـیم. سـی. وەك یاریدەدەری كاپتەن سی. تی. بییڵ گەیشـتە كۆیـە و لـە ٨ـ ی ئایـاریش بـە شێوەی كاتی بووە بەرپرسـی ناوچـەی ڕوانـدز، بـەڵام هـەرگیز نەگەڕایـەوە كۆیـە.

بۆیە کاپتەن سی. ئەی. جی. ڕەندەڵ ئیم. سی. لە ٨ ئایار ١٩١٩- وە بووە یاریدەدەری حاکمی سیاسیی کۆیە.

### قانوون و فەرمان

کۆیە تاکو داگیرکردنی لەلایەن یاریدەدەری حاکمی سیاسیی بەریتانیا لە ١٥- ی کانوونی یەکەمی ١٩١٨، ماوەیەك بە دەردی پاشاگەردانییەوە گرفتار ببوو. تاوان و ڕێگری لە ناوچەکەدا بڵاو ببوونەوە، پەشێوییەکی بەردەوام باڵی بەسەر شارەکەدا گرتبوو. ئەم بارودۆخە ترسناکە لە ١٠- ی مانگی کانوونی یەکەم گەیشتە لووتکە، کاتێك بڵباسەکان هێرشیان کردە سەر شارەکە، بەلاَم بە گەیشتنی کاپتەن هەی لە کاتی خۆیدا کۆتایی بە تالاَن و بڕۆی عەشایری هات.

یەکێك لە ئەرکە سەرەکییەکانی یاریدەدەری حاکمی سیاسی لە سەرەتای گەیشتنی بۆ کۆیە بنیاتنانی ئاشتی بوو لە نێوان ئاغەواتە (Aghawat) ڕکابەرەکاندا. هەر کاتێك ئەمەش جێگیر ببێت، ئەوە ناوچەکە ئاشتی و ئاسایش بەخۆیەوە دەبینێت. ئەو کاتە خەڵکیش دەپەرژێنە سەر کێڵاَن و چاندن و دوعا بۆ بەرهەمێکی باش دەکەن. لە ٢٣ ی مانگی ئایار دەزگای تێلگرافی کودەتاکەی شێخ مەحموود ئەم هەواڵەی بلاَو کردەوە:

"حەماغا و جەمیل ئاغا و مەلا محەمەد (حاکمی شەرع)، بەفرتوفێڵێکی یاریدەدەری حاکمی سیاسی بردراون و ئەوانیش بە بێ دوودڵی توانستەکانی خۆیان خستۆتە خزمەت حکوومەتەوە".

بەلەمەکانی دووکان و تەقتەق دەستیان بەسەردا گیرا، تاقمێك جەندرمە لەو شوێنانەدا جێگیر کران و هەموو بەلەمەکانی تر لە کار خران و سیستمی چاودێری گەڕۆك (دەوریە) بە درێژایی کەناری لای ڕاستی زاب بەکارخرا. سەرۆك هۆز و پیاوماقووڵ و ریشسپییەکان(Mudirs) بانگهێشت کران و بارودۆخەکەیان بۆ ڕوون کرایەوە، هەموویان تواناکانی خۆیان خستە ژێر فەرمانی حکوومەتەوە. لەگەڵ گەڕانەوەیان بۆ ناوچەکانیان خەڵکیان دووبارە دڵنیا کردەوە و ئاسایشیان بۆ دابین کردن. مەترسی ئەم ناوچەیە لەوەدایە کە هەڵوێستی ڕاڕا و

بەرهەڵستکارانەی پشدەر و هۆزەکانی بلباس لە ناوچەی ڕانیەدا بلاوبێتەوە و ببێتە پەرچەکردار دژی لەشکری بەریتانیا لە تاسلووجە و ئەم هۆزە گومانلێکراوانە کردەوەی دوژمنکارانە لە دژی ئێمە بەرپا بکەن. لە بارودۆخێکی ئاوادا، وەفاداربوونی هۆزی خۆشناو و هۆزەکانی تر دەکەوێتە ژێر گومانەوە ئەگەر هاتوو بڕیاریان دا چارەنووسی خۆیان بە شێخ مەحموود ببەستنەوە. ئەو کات هەلومەرجەکە بە جۆرێکی لێ دێت کە ناتواندرێت بەرگری لێ بکرێت.

ئەم بارودۆخەش وا دەخوازێت بەپەلە کۆمەڵێك سەرباز ڕەوانەی کۆیە بکرێت بۆ دامرکاندنەوەی هەر شۆڕشێك کە ڕەنگبێت لەم ناوچەیە ڕووبدات. هەروەها هەلومەرجەکە وا دەخوازێت یاریدەدەری حاکمی سیاسی ڕایبگەیەنێت کە سەربازەکان لە ماوەی یەك دوو ڕۆژدا دەگەنە کۆیە. بەهەر حاڵ هیچ سەربازێك ڕەوانەی کۆیە نەکرا، هەلومەرجەکە بەهۆی نەمانی دەنگوباسی فەرمی پتر گرژ و ئاڵۆز بوو، هەفتە هات و هەفتە ڕۆیشت، بەلاَم هیچ پێشکەوتنێك دژی شێخ مەحموود بەدەست نەهات، سەرگەردانیی خەڵك ڕووەو پاشاگەردانی دەچوو، وەفادارییان بۆ حکوومەت خەریك بوو کۆتایی بێت.

بۆ پرسی ئاشتی لەم ناوچەیە لە ماوەی ئەو مانگە تەلەزگەیەدا (Critical)، حکوومەت بە پلەی یەکەم سوپاسگوزار و منەتباری کاپتەن ئار. ئی. بارکەر یاریدەدەری حاکمی سیاسیی ڕانیەیە، کە بەهۆی کەسایەتییە بەهێزەکەیەوە توانی هۆزە ڕاڕاکان کۆنترۆڵ بکات.

پاراستنی وەفاداری ناوچەی کۆیە (بۆ ئیدارەی مەدەنی بەریتانیا – وەرگێڕ) لە سایەی خراپترین بارودۆخدا بەشی زۆری بۆ کار و کردەوەکانی حەماغا، جەمیل ئاغا و مەلا محەمەد دەگەڕێتەوە. یەکەمیان بە ئاکار و ڕەوشتەکەی، دووەمیان بە جموجووڵە بە جۆش و خرۆشەکەی و سێیەمیان بە ئاینەکەی، توانییان بارودۆخەکە کۆنترۆڵ بکەن و خەڵك و هۆزەکان دڵنیا و ئارام بکەنەوە، هەروەها توانییان سەرباری ئەو پیلانە بەهێزە ئاسایش و هێمنی بپارێزن.

لەو کاتەوە کە ئیدارەی بەریتانی لە کۆیە جێگیر بووە، ڕێژەی تاوان بەخێرایی کەم بووەتەوە، بەلاَم ئاسایشی ڕێگەوبان بووەتە وێردی سەر زمان.

خوێنداری (دوژمنداری) هەروا وەك هۆکاری تاوانەکان ماوەتەوە، بەڵام هەر کاتێك دۆخەکە لەبار بێت ئەوا دەرفەتی سولْح (Fasl) هەیە. سەبارەت ئەم جۆرە کەیسانە، ونبوونی تۆمەتبار ڕێگر بوو لە بەرقەرارکردنی دادپەروەری. گومان لەوەدا نییە کە سۆزداری گوندییەکان لەگەڵ تاوانبار ڕێگە نادات هەنگاوەکانی دەسگیرکردنی تۆمەتبارەکە بەرەو پێش بچێت، ئەوان دەترسان دووچاری ئەگەری مەترسی خوێنداری ببن. ئێستا هەلومەرجی گوندەکان بەم جۆرەیە؛ بەڵام لەوە دەترسم کە تەنیا کات و بڵاوبوونەوەی هێزێکی زۆری پۆلیس، بەتەنیا بتوانێت گوندنشینەکان فێر بکات (ناچار بکات) ئەم تاوانبارانە دەستگیر بکەن.

## سەربازگیری و جەندرمە

***سەربازگیری***— لە بنەڕەتدا مەبەست پێکهێنانی بەتالیۆنێك بوو لە سەربازە لۆکاڵەکان کە ئۆردووگاکەی لە کۆیە و ڕواندز بێت، بۆ ئاوەدانکردنەوەی ئەو ڕەبیانەی دەکەونە سەر سنووری ئێران، ئاشکراشە کە خەڵك داخی لە گشت جۆرە سەربازییەکە (بە پێی ئەو ئەزموونەی لە ڕۆژگاری یەکەمین شەڕی جیهانیدا بۆیان ماوەتەوە)، هەروەها ڕەتکردنەوەی هۆزەکان لە بەشداربوونی لاوەکانیان لەم پرۆسەیەدا، تەجنیدکردنی (سەربازگیری) کردۆتە یەکێك لە پرسە قورسەکان.

خۆشبەختانە لە کۆتایی مانگی نیسان دوو لاوی کۆیە، کە لە کاتی شەڕ (مەبەست یەکەمین شەڕی جیهانە، ١٩١٤ — ١٩١٨ — وەرگێڕ) لە سوپای شەریف وەك مولازمی دووەم خزمەتیان کردبوو، دوای گەڕانەوەیان بۆ وڵات هاتن و ئامادەیی خۆیان نیشان دا بۆ خزمەتکردن، دواتر ٣٠ لاوی تریش ناوی خۆیان تۆمار کرد و مەشقی سەربازییان بە سەرپەرشتی سێرگت مێجەر (ڕەئیس عورەفا — وەرگێڕ ) هیلْس دەستی پێکرد.

لە ڕێگەی مەشق پێکردنی ئەم پەلە بچووکە و پێدانی خواردن و جلوبەرگی باش، بۆ ئەوەی ببێتە یەکەیەکی سەربازیی کارامە، ئومێد دەکرا ئەو ژمارە زۆرەی پیاوان کە پێویستە بۆ سەربازی ڕابکێشرێن، بەڵام ئەو گۆڕانکارییەی دوای نسکۆی شۆڕشی شێخ مەحموود لە سیاسەت ڕووی دا، پلانی پێشووی سەربازگیری

هەڵوەشاندەوە و سەربازەکانیش ڕۆژی ١٣- ی تەمووز لە کۆیە بڵاوەیان لێ کرد. لە ڕاستیدا ئیشێکی کەم لەسەر ئەو سەربازانە (موجەنەدانە) کرا، بەهەرحاڵ ژمارەیەکی زۆر پیاو فەوتان، چونکە دواتر کرانە جەندرمە.

***جەندرمە***: جەندرمە یان پۆلیسی ناوچە، بەسەر دوو قۆڵ (پەل) دابەش کران - سوارە و پیادە-لە پێشدا ژمارەیان یەك ئەفسەر و ١٤ پلەدار (N.C.O.) و ٤٣ سەربازی پیادە بوو، دواتر ژمارەی هێزەکە بووە یەك ئەفسەر و ١٢ پلەدار و ٩٠ پیادە.

سەربارى ئەرکی چاودێریی شار، پاراستنی دەزگاکان و جێبەجێکردنی فەرمانی گرتن و ڕاپێچکردن، بنکەی هەمیشەییش (بۆ جەندرمە) لە شەقلاوە، تەقتەق و بانی ماران دامەزرێندران.

جەندرمەکان، وێڕای مەشقە ناتەواوەکە و باری پلەدارە نەفامەکان، ئەرکی پۆلیسیی خۆیان بە شێوەیەکی باش و بەرچاو جێبەجێ دەکرد. مەشقی پۆلیسی پیادە بە سستی بەڕێوە دەچوو، بەلاّم بێ گومان دیسپلین (زەبت و ڕەبت) و کارگێڕی لە ژێر فەرماندەیی سەبری ئەفەندی لە کۆتایی تەموزدا پێشکەوتنێکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی. ئێستا ئومێد دەکرێت بەشی سوارەش مەشقی پێ بکرێت، چونکە پرسی فێرکردنیان ناکرێت چیتر پشتگوێ بخرێت.

## کشتوکاڵ

***بەروبوومە زستانییەکان*** - بەروبوومە کشتوکاڵییە زستانییەکانی ئەمساڵ بە بەراورد لەگەڵ پێنج ساڵی ڕابوردوودا باشترین بڕی هەیە، هەرچەندە بارانی بەردەوامی مانگی نیسان بڕێکی زۆر بەروبوومی فەوتاند، بەلاّم بەرهەمەکە هەشت بەرابەرە. ئەو قەرزە کشتوکاڵییانەی بەم دواییە دران بایەخدار بوون بۆ کڕینی تۆ، تاد.. و توانی باوەڕی خەڵکەکە دەستەبەر بکات.

***گاجووت***- ژمارەی گاجووت لە ناوچەکە زۆر کەمە، سەرەتای ساڵ (١٢) جوانەگای هیندی بە قەرز (١٨٠ ڕوپیە بۆ هەر سەرێك) تا دوای دروێنە درانە جووتیاران، ئەو گاجووتە هیندییانە زۆر باش بوون و بوونە مایەی ستایشی

خەڵکەکە و لە کارکردندا لە گاجووتە خۆماڵییەکان بەهێزتر بوون. هەرچەندە داوای گاجووتی پتر نەکراوە، بەڵام دەکرێ ئێستا ٤٠٠ گاجووت بەبێ گرفت ئامادە بکرێت و داواکارییەکانیش بۆ چەند ساڵێك بەردەوام دەبێت.

***بەروبوومی هاوینە***— بەرهەمی بەروبوومە هاوینەکان جگە لە تووتن، هەر وەك چاوەڕوان دەکرا ئەوەندە باش نییە. دەگوترێ کە کوللە هۆی سەرەکی باش نەبوونەکەیە. تووتن بەرهەمێکی باشی هەیە، نزیکەی دوو بەرابەرە، زەوی زیاتریش کرابووە تووتن بە بەراورد لەگەڵ ساڵەکانی شەڕدا، هەروەها بازاڕێکی باشیشی مسۆگەر کردووە. لە قەزای شەقڵاوە دانەوێڵە هاوینەکان تا رادەیەکی زۆر جێگەی تووتنکردنیان گرتۆتەوە. بازرگانەکان لە دوور و نزیکەوە گەیشتنە ناوچەکە و داواکاری لەسەر تووتن بەڕادەیەك زۆر بوو تا وای لێ هات لە مانگی کانوونی دووەم نرخی گەڵای تووتن گەیشتە دوو بەرابەر.

***بەگشتی***— پاشکۆی " یەکەم" جۆری جیاجیای دانەوێڵە .. تاد پیشان دەدات کە لە ناوچەکە دەڕوێندرێن لەگەڵ گرنگیی بەراوردکردنیان. بەداخەوە بە هۆی نەبوونی بارانێکی شایستە تاکو ١٦– ی کانوونی یەکەم، کێڵان دواکەوت. لەو ڕێکەوتەوە تاکو کۆتایی مانگ ٣,٦٨ ئینج (٩٢ ملم) باران باری و ئەمەش بووە مایەی ڕەزامەندی و خۆشحاڵیی جووتیاران.

## کەشوهەوا

کەشوهەوا لە کۆیە تاکو پێش مانگی ئایار (١٩١٩ – وەرگێڕ) تۆمار نەدەکرا. ڕێژنە بارانی بێ پسانەوە و برووسکە سیمای دیاری نیوەی یەکەمی مانگی ئایار بوو. لە ناوەڕاستی ئایار بووە هاوین و پلەکانی گەرماش بەشێوەیەکی بەرچاو بەرز بوونەوە. ڕەشەبایەکی بە هێز بە شەوو ڕۆژ و بە بەردەوامی لە مانگەکانی حوزەیران و تەمووز هەڵی کرد و هەوای پڕ کرد لە تۆز و خۆڵ. پلەی گەرماش لە ژوورێکی کراوەدا لە شەو و ڕۆژدا ٩٥ پلەی فەهرەنهایتە (٣٥ پلەی سەدی)، ئەم گەرمایە ژیان زۆر خاو و خلیچ دەکات.

ئەم کەشوهەوا نالەبارە تا مانگی ئابیش هەر بەردەوام بوو، ڕەشەبایە توندوتیژەکە وردە وردە کز بوو و لە ناوەڕاستی ئەیلوولدا ڕەشەبایەکەی شکاند، لەو ماوە ئاستەنگەدا باهۆزی تۆز و خۆڵ لەوپەڕی بەهێزیدا بوو، لە ٨- ی تەمووز ڕێژنە بارانێکی فێنککەرەوە دایڕژاند، لە ٢٠ - ی ئەیلوول نەختێك باران باری، ئاسمان تاکو ١٠ - ی تشرینی یەکەم هەور و نائارام بوو، لە ٥ - ی تشرینی یەکەمەوە هەوا بەشێوەیەکی بەرچاو ساردی کرد، ڕۆژی ٦ - ی تشرینی یەکەم بایەکی توند هەڵی کرد و بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بەردەوام بوو. لە ١٠- ی تشرینی یەکەمەوە تاکو ناوەڕاستی تشرینی دووەم، هەوا تەواو سازگار و ئاسمانیش شین و بێگەرد بوو.

لە ١٦ تاکو ٢١ - ی تشرینی دووەم، هەموو بەیانیان ڕۆژ لە ناو پەڵە هەورەکانەوە دەردەکەوت، بەڵام بەشەکەی تری ئاسمان ساف و بێگەرد بوو، هەوا بە شەو ساردتر بوو، کەشوهەوا لە دوا ڕۆژەکانی تشرینی دووەم و نیوەی یەکەمی کانوونی یەکەمدا زۆر سەرنجڕاکێش بوو، هەندێك ڕۆژ ئاسمان ساف بوو، پلەی گەرماش ٦٤° ف بوو ، کەچی ڕۆژەکانی تر ئاسمان ڕەش و پلەکانی گەرماش باش دادەبەزین، لە ١٥- ی کانوونی یەکەمەوە بۆماوەی چوار ڕۆژ بەردەوام باران باری، تاکو ٢٠ - ی مانگ ١,٣٥ ئینج (٣٣,٧٥ ملم) تۆمار کرا، ئەم بارانە پلەی گەرمای تاکو ٤٢°ف هێنایە خوارەوە، لە شەوی ٢٠ - ی مانگ نەختێك بەفریش لە گردۆڵکەکانی دەوروبەری شار باری، پلەی گەرما لە کۆیە بۆ ٣٨°ف دابەزی، لە دوا ڕۆژەکانی ساڵدا کەشوهەوا دیسان سەیروسەمەرە بوو، هەورەکان ئەمڕۆ کۆدەبوونەوە و سبەینێ بلاوەیان لێ دەکرد، پلەی گەرما لە ٥٠° ف گۆڕا بۆ ٤٤° ف، ڕێژەی سەرجەم بڕی ئەو بارانەی لە کانوونی یەکەمی ١٩١٩دا باری گەیشتە ٣,٦٨ ئینج (٩٢ ملم).

پێوەری باران بارین لە مانگی ئەیلوولەوە داندرا، هەر لەگەڵ دەستپێکردنی باران بارینیش، وەرگرتنی خوێندنەوەی ڕۆژانە دەستپێکرد.

**داهات**

***کۆدە*** (Kodah) — کۆکردنـەوەی کـۆدە (سـەرانە) بـەپێی بـەیاناتی کوێخـای گوند گاڵتەجاڕیی کارەکەی سەلماند، گۆڕینی حاکمە سیاسییە یاریـدەرەکان لـەو کاتەدا، ڕێگەی بە ئەنجامدانی وردبینییەکی کاریگەر نەدا.

**بەروبوومە زستانییەکان**— لە قەزای کۆیە دەیەکی هـەر گونـدێك بـە جیـا کـۆ دەکرایـەوە. ئـەو گـەنم و جۆیـەی کـۆ دەکرایـەوە بەشـێکی بـۆ ڕانیـە دەنـاردراو بەشێکیشی بۆ بووژاندنەوەی کشتوکاڵی و هەروەها بۆ ئەوەی لـە کـاتی نەبوونیـدا لە زسـتانی داهـاتوو بـە خـەڵك بفرۆشـرێت. کـار و چـالاکییە کشـتوکاڵییەکان بـەو شێوەیەی کە چاوەڕێ دەکرا بـەرەو پـێش دەچـوون، لـەو کاتـەدا تـەنیا پلانێکـی پراکتیکی هەبوو و خەڵکیش پێیان خۆش نەبوو باجی تەواو بدەنـە حکومـەت. وا مەزەنـدە دەکـرا ئەگـەر لـە قـەزای شـەقڵاوە دەیـەکی بەرهـەم وەربگیرێـت، ئـەوا دەبێتــە مایــەی گاڵتــە جــاڕی، هــەر وەك چــۆن عەشــیرەتی بــەگزادە ڕێگــەی کێبڕکێکردن لە گوندەکانی خۆی دەگرێت.

باج لە لایەن دوو لیژنەوە دەخەملێندرا و دیاری دەکرا.

ئەم پلانە (خشـتەیە) هـەموو داهـاتی پـێ کـۆ نەدەکرایـەوە چـونکە A.P.O. نەیدەتوانی لە ڕێگەی ئەنجامدانی گەشتێکی کەسی (مەیدانی) بۆ قـەزای شـەقڵاوە پشتیوانی خەملێنەرەکان بکات.

***میوەجات***— کۆکردنەوەی باجی میوەجات و گوێز و باوی لە هەردوو قەزاکە.

یاریدەدەری حاکمی سیاسی گەشتێکی فراوانی بە قەزای شەقڵاوە کرد و لـە دوا قۆناغدا گەیشتە نـاو شارۆچـکەی شـەقڵاوە. بـە بـەراورد کـردن و تێبینیکـردن لەگەڵ داهاتی ساڵانی پێشوو، نزمترین نرخ بۆ هەر گوندێك دیـاری کـرا. سـەبارەت ئەو گوندانەش کە لەگەڵ داخستنی مەزاد نەگەیشتنە کەمترین نرخ، بەرپرسیارێتی کۆکردنەوە و وەرگرتنی باج بە کوێخاکان سپێردرا بە پـەیڕەوکردنی نـزمترین نـرخ کە بڕیاری لەسەر دەدرێت، ئەم پلانە ئەنجامی باشی لێ کەوتەوە.

***بەروبوومی هاوینە*** — بەروبوومی هاوینە لەلایەن دوو لیژنەوە لە هەر قەزایەك دەخەملێنـدران و پلانەکـەش بـە باشـی بـەڕێوە چـوو، سـەرباری ئـەوەی پێشـتر

ئامــاژەی پێکــرا لــەژێر ناونیشــانی "کشــتوکاڵ"، کوللــە زیــانێکی زۆری بــە بەروبوومەکان گەیاند. تووتن لەگەڵ بەروبوومە هاوینـەکانی تـر خەملێنـدرا، بـەڵام باج لە وەرزێرەکان وەرنـەگیرا. مخـابن مەزەنـدەکردنی ئـەم بەرهەمـە زۆر درەنـگ هاتە بەردەست کە هیچ بایەخێکی نەمابوو. ئەمەش پلانی وردبینی هەڵوەشاندەوە کە دەبوایە لە راپـۆرتی مانگانـەی تشـرینی دووەمـی (١٩١٩ – وەرگێـڕ) ناوچـەکە ئاماژەی پێبکرێت. بە هەر حاڵ ناوی خـاوەن فـەردە تووتنـەکان و ئـەو بـڕەی لـە عەمبارەکانیان داناوە، هەروەها ناوی وەرزێر و بازرگان و کێشی ئەو بڕە تووتنەی فرۆشراوە وەك سەرچاوەیەکی زانیاری بۆ داهاتوو بە تەواوی تۆمارکراوە. لـە هـەر کیلۆیـەك تـووتن هەشـت عانـە (واتـە نیـو ڕووپیـە –وەرگێـڕ) بـاج لـە بازرگانـەکان وەردەگیرا لە بری ئەو بڕە تووتنەی کـە بـە کۆیـە یـان شـەقڵاوە تێدەپـەڕی. ئـەو تووتنەی لـە خۆشـناوەتی دەکرێـت جـۆرێکی نایابـە، وەك لـە پاشـکۆی "یەکـەم" دەردەکـەوێت. ئـەو داهاتـەی لـە تـووتنی ئـەو ناوچـەمان دەسـت کـەوتووە زۆر بەرچاوە.

**دار**– قەزای شەقڵاوە دارێکی زۆر دێنێتە بەرهەم، بە شێوەی سـەرەکیش دار سپیندار، کە بازاڕێکی گەرمی لە مووسڵ و بەغدا پەیدا کردووە. بەشێك لەم دارانـە بە پشتی گوێدرێژ دەگوێزرێنـەوە بـۆ گردمامـك و بـە زابـی گـەورە دادەدرێـت (بـۆ ئـەوەی بگاتـە مووسـڵ – وەرگێـڕ)، بەشێکیشـی دەگواسـترێتەوە بـۆ تەقتـەق و دەخرێتە ناو ئاوی زابی بچـووك تـاکو بگەیەندرێتـە بەغـدا. لـە ڕابـوردوودا بـاج لـە گردمامك کـۆ دەکرایـەوە، بـەڵام ئێسـتا لـە پـردێ کـۆ دەکرێتـەوە، داهـاتی بـاجی ساڵێکی گردمامك ٨٣٠٥ ڕووپیە و پردێش ٤٠٠٠ ڕووپیە بوو.

**بەگشتی** – "پاشکۆی یەکەم" سەرچاوە جیاجیاکانی داهـات پیشـان دەدات لەگەڵ خواستەکانمان بۆ ساڵی ١٩١٩.

## تاپۆ

هاوکات لەگەڵ داگیرکردنـی کۆیـە لـە لایـەن بـەریتانیاوە فەرمانگـەی تـاپۆی کۆیـە معامـەلاتی ڕاگرتبـوو، بـەڵام بەڵگەنامـە قانوونییـەکان لـە کـاتی پێویسـت

دەکران. بۆ دەستەبەرکردنی فرۆشتنی موڵك تا ئەو کاتەی تۆمارگەی تاپۆ دەکرێتەوە، شێوازێك پەیڕەو دەکرا کە بریتی بوو لەوەی کڕیار بە بەڵگەنامەیەکی نووسراو، بەڵێن بدات کە هەموو بەرپرسیاریەتییەکی معامەلەکە دەگرێتە ئەستۆی خۆی، واتە ئەگەر دوایی دەرکەوت کە ئەو کەسەی موڵکەکەی لێ کڕیوە (فرۆشیار) خاوەنی قانوونیی موڵکەکە نییە، بەڵێننامەکە پووچەڵ دەبێتەوە و کڕیار هیچ داواکارییەکی لەو موڵکە نابێت. ئەم دۆکیومێنتە بە ئامادەبوونی هەردوولا و یاریدەدەری حاکمی سیاسی ئامادە و ئیمزا دەکرێت و لە فەرمانگەی تاپۆ بۆ کاتی خۆی دەپارێزرێت. داواکراوە کە مەئموری تاپۆ بنێردرێتە بەغدا تاکو خولێکی مەشقکردن ببینێت، بۆ خۆئامادەکردن بۆ سەرلەنوێ کردنەوەی فەرمانگەی تۆمارگەی تاپۆی کۆیە.

**ئەوقاف**

لە کاتی شەڕدا بەهۆی کەمی ئاوڕدانەوە لە ئەوقاف، بایەخی موڵکی ئەوقاف نزم بۆوە، زۆربەی بینایەکان دارمان و ڕەزەکانیش وشك بوون، بۆیەش ئەمساڵ داهاتیان کەمە. لە هەمان کاتیشدا زۆربەی مزگەوتەکان بە مەبەستی نۆژەنکردنەوە داوای پارە دەکەن، لە زۆربەی حاڵەتەکاندا مەحاڵە داواکارییەکان قبووڵ بکرێن. لە وەرزی هاویندا ژمارەیەك دووکان لە شاری کۆیە نۆژەن کرانەوە وەك ئامادەکارییەك بۆ وەرزی زستان و بە گەرموگوڕبوونی بازرگانی، کرێیەکانیش زیادیان کرد. ڕێکخستنەوەی بەکرێدانی باخەکان (ڕەزەکانی ئەوقاف) لە ناوچەکەدا، کە لە دوو سێ ساڵی ڕابوردوودا بە تەواوی پشتگوێ خرابوون. بەو هیوایەی ڕەزەوانی ئەوتۆ پەیدا بێت بتوانێت ڕەزەکان بگەڕێنێتەوە تافی دەوڵەمەندیی جاران.

**پەروەردە**

لە دوای داگیرکردنی کۆیەوە، حکوومەت مووچەی بەڕێوەبەری قوتابخانەی دەدا و ئەویش نزیکەی چل منداڵی موسوڵمانی فێرە خوێندن و نووسین دەکرد. ئێستا بە جدی پێویستە وەزارەتی پەروەردە شارەزایەك بۆ کۆیە بنێرێت، تاکو

قوتابخانە لەسەر بنەمایەکی ڕاست و دروست دامەزرێنێت و پاشانیش یاریدەدەری حاکمی سیاسی بتوانێت ئەرکی سەرپەرشتیی پێویست بگرێتە ئەستۆ. ئومێد دەکرێت بەڕێوەبەری قوتابخانە بنێردرێتە سلێمانی بۆ ئەوەی هەندێك کۆرسی پەروەردەیی لەبواری فۆنەتیکی نوێی فێرکردنی زمانی کوردی وەرگرێت. بینایە بەرچاوەکەی قوتابخانە کرایە نەخۆشخانەیەکی مەدەنی و قوتابخانەکەش بە شێوەی کاتی گواستراوە ناو مزگەوتی گەورە. جوولەکەکان هیچ بەخشینێکی حکوومییان بۆ فێرکردن پێ نادرێت، بەڵام مەسیحییەکان مانگانە ٥٠ ڕوپیەیان بۆ قوتابخانەکەیان پێدەدرێت.

## سەربازی

هێزی سەربازیی ڕانیە لە ڕێگەی چوونی لە هەولێرەوە بۆ دەربەندی ڕانیە شەوی ٢٢ لەسەر ٢٣ — ی ئابی لە کۆیە بەسەر برد، هەروەها لە کاتی گەڕانەوەشی بە هەمان شێوە شەوی ١٦ لەسەر ١٧ — ی تشرینی یەکەمی لە کۆیە، بردە سەر. هێزە سەربازییەکە یادگارییەکی باشی لای خەڵك بەجێ هێشت و خۆراکێکی هزریشی دەرخواردی ئەو کەسانە دا کە لە قانوون یاخی ببوون.

## شارەوانی

ژمارەی دانیشتووانی تێستای کۆیە ٤٠٠٠ کەسە، ٢٣٠ کەسیان کلدانن و ٢٥٠ کەسیشیان جوولەکەن، ئەم ژمارەیە ٢٥٪ کەمترە لە ژمارەی دانیشتووانی شارەکە پێش شەڕ (واتە پێش شەڕ ژمارەی دانیشتووانی ناو کۆیە ٥٣٢٣ کەس بووە — وەرگێڕ).

کاتێك پێش یەك ساڵ کە کۆیە داگیر کرا سێ لەسەر چواری بازاڕ چۆل بوو (٢٥٪ ئاوەدان بووە — وەرگێڕ)، ژمارەیەکی زۆر خانوو داڕما بوون، بەرد و کەرپووچی کەلاوەکان بە سەر شەقامەکاندا بڵاو ببوونەوە، شارەوانی داهاتی نەبوو، خەڵك برسی بوو. ئەمڕۆ لە کۆی ٣٥٧ دووکان، ٢٨٢ دووکانیان بە باشی پۆشتە و پەرداختن (پڕن لە شتومەك و کراوەن، نزیکەی ٨٠ ٪ بازاڕ ئاوەدانە — وەرگێڕ)، هەروەها تەنیا ٢٠ دووکان ماوە کە بەکارنایەت. ڕاستە ئێستاش سێ

لەسەر چواری شار وێرانە، وەك گەواهییەك بۆ ٢٥٪ – ی دانیشتوانە مردووەکەی، بەڵام شەقامەکان پاك کراونەتەوە و کەناڵەکانی ئاویش خاوێن کراونەتەوە، کەناڵی ئاوەڕۆی کاریگەر دروست کراوە، هەروەها باجیش خرایە سەر خانوو و دووکانەکان. باجی بڕاوی خانووەکان ژیایەوە و داهاتێکی باشی دەستەبەر کرد. لە کۆتاییدا، بازرگانی بووژایەوە وەك لە پاشکۆی "دووەم" دیارە و نرخەکانیش دابەزین وەك لە پاشکۆی "سێیەم" دەردەکەوێت.

### تەندروستی

بەر لە ناوەڕاستی مانگی نیسان هیچ پزیشکێك لە ناوچەکە نەبوو، لە ١٧– ی نیسان کاپتەن دەبلیو ویلیەمز گەیشتە کۆیە و ئەرکی پزیشکی مەدەنی گرتە ئەستۆ، لە ٢٢– ی نیسان دکتۆر نەسرەت وەك یاریدەدەری پزیشکی مەدەنی لەگەڵ سەیدەلانییەك گەیشتنە کۆیە و دەستبەجێ دەرمانخانەش کرایەوە. لە مانگی ئابدا ئاڵوگۆڕکردنی پزیشکی مەدەنی لەگەڵ سلێمانی ڕووی دا، کاپتەن دەبلیو ویلیەمز لە دووی مانگی ئاب کۆیەی بەجێ هێشت و لە ١٢ مانگ کاپتەن جەی ئەی میللەر هاتە کۆیە. دامەزراندنی دەرمانخانە لە کۆیە نیعمەتێکی گەورە بوو بۆ خەڵك و پشتگیرییان لە دامەزراندنی کرد، چالاکییە تەندروستییەکانمان بوونە هۆی کەمبوونەوەی مەلاریا بە ڕێژەی ٩٩٪ بە بەراورد لەگەڵ ڕێژەی پێش شەڕدا. سەرەکیترین نەخۆشی کە چارەسەر کران مەلاریا و هەوکردنی چاو بوون، خزمەتگوزاری تەندروستی لە لایەن ڕووناکبیرانەوە مایەی ڕێز و پێزانینێکی زۆرە. بەڵام گوندنشینەکان تاکو ئێستا بەگومان و بێباوەڕن، تەنیا کات توانای گۆڕینی ئەم پرسەی هەیە، هەڵسوکەوتی سۆزدارانەی پزیشکە مەدەنییەکان توانی باوەڕی ئەو کەسانە وەدەست بێنێت کە گۆڕانکارییان بەسەردا هات. ئەو نۆژەنکردنەوە و گۆڕانکارییەی بەسەر بینایە کۆنەکەی قوتابخانەکەدا هات و بەم نزیکانە تەواو دەبێت و بینایەکەش دەبێتە نەخۆشخانەیەکی مۆدێرنی فراوان.

## بازرگانی

لەو کاتەوە ئیدارەی بەریتانی هاتۆتە کۆیە، بازرگانی بە بەردەوامی دەبووژێتەوە و باشتر دەبێت. پاشکۆی "دووەم" بازرگانی بەروبوومە جیاجیاکانی ناوچەکە و نرخەکانیان لە مانگی کانوونی یەکەم نیشان دەدات.

## کارە گشتییەکان

ئەو کارانەی کراون و تەواو بوون لە ماوەی یەك ساڵدا بریتین لە:

پینەکردن و چاکردنەوەی دەرگا و پەنجەرەکانی قەڵا بۆ دابینکردنی شوێن بۆ یاریدەدەری حاکمی سیاسی، پزیشکی مەدەنی و B.O.R's.[٩] دروستکردنی ٧ خانووی بچووك و شوورە لە بەرد و قوڕ لە دەوری شار و سواغکردنەوەی سەربانی سەرا بە قوڕ و ئەنجامدانی نۆژەنکردنەوەی پێویست لە بینایەکەدا.

سەرەڕای ئەو کارانەی ئاماژەیان پێکرا نۆژەنکردنەوە و گۆڕانکاریی نەخۆشخانەی نوێ لە لایەن پزیشکی مەدەنییەوە بەدەر لە پارەی تەرخانکراو بۆ بەشی تەندروستی جێبەجێ کرا، هەروەها لەسەر داوای یاریدەدەری حاکمی سیاسیی ڕانیە ڕێگەی کۆیە – قەسرۆك بەسەر چیای هەیبەسوڵتان لە ژێر چاکردنەوەدایە بۆ گواستنەوەی کەلوپەل، ڕانیەش هەموو تێچووەکە دەدات.

**کاپتەن سی. ئەی. جی. ڕەندەڵ / یاریدەدەری حاکمی سیاسی**

**ڕێکەوت / ١٥ کانوونی دووەم ١٩٢٠**

## پاشکۆی یەکەم

### خشتەی ئەو داهاتانەی لە ناوچەی کۆیە لە ساڵی ١٩١٩ وەرگیراوە

| — | کانوونی ٢ | شوبات | ئادار | نیسان | ئایار | حوزەیران | تەمووز | ئاب | | ئەیلوول | تشرینی ١ | تشرینی٢ | کانوونی ١ | هەموو | | ڕۆژەی گۆڕین |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بەرووبومی هاوینە | د ع پ(*) | د ع پ | د ع پ | د ع پ | د ع پ | د ع پ | د ع پ | د ع پ | کیلۆ | د ع پ | د ع پ | د ع پ | د ع پ | د ع پ | کیلۆ | |
| برنج | — | — | — | — | — | — | — | — | — | — | — | ٠ ٠ ٥١٩١ | — | ٠ ٠ ٥١٩١ | — | -/٥/- |
| ماش | — | — | — | — | — | — | — | — | — | — | — | ٠ ٢ ٤٥٢٩ | — | ٠ ٢ ٤٥٢٩ | — | ٦/٥/- |
| هەرزن | — | — | — | — | — | — | — | — | ٦١٠ | — | — | ٠ ٣ ١٨٨١ | — | ٠ ٢ ١٨٨١ | ٦١٠ | ٦/٢/- |
| کاڵەک | — | — | — | — | — | — | — | — | — | — | — | ٠ ٠ ٧٠٠ | — | ٠ ٠ ٧٠٠ | — | -/١/- |
| کودی | — | — | — | — | — | — | — | — | — | — | — | ٠ ٠ ٢٠٣ | — | ٠ ٠ ٢٠٣ | — | -/٨/- |
| پاقلە | — | — | — | — | — | — | — | — | — | — | — | ٠ ١١ ١٢٢ | — | ٠ ١١ ١٢٢ | — | ٦/٥/- |
| گەنمە شامی | — | — | — | — | — | — | — | — | — | — | — | ٠ ١ ٩٨ | — | ٠ ١ ٩٨ | — | -/٤/- |
| پەمۆ | — | — | — | — | — | — | — | — | — | — | — | ٠ ١٥ ٩٠ | — | ٠ ١٥ ٩٠ | — | -/٥/- |
| بەرووبومی زستانە | | | | | | | | | | | | | | | | |
| گەنم | — | — | — | — | — | — | — | — | ١١٧٨٠٣ | ٠ ٨ ١١٠٩٥ | — | — | — | ٠ ٨ ١١٠٩٥ | ١١٧٨٠٣ | -/٦/- |
| جۆ | — | — | — | — | — | — | — | — | ١٠٣٩١١ | ٠ ٠ ٣٤٣٦ | — | — | — | ٠ ٠ ٣٤٣٦ | ١٠٣٩١١ | -/٤/- |
| نۆک | — | — | — | — | — | — | — | — | ٢٧٨١ | ٠ ٨ ١٨٠ | — | — | — | ٠ ٨ ١٨٠ | ٢٧٨١ | -/٥/- |
| نیسک | — | — | — | — | — | — | — | — | ١٧٥٨ | ٠ ٤ ٦٥ | — | — | — | ٠ ٤ ٦٥ | ١٧٥٨ | -/٦/- |
| کاکز | — | — | — | — | — | — | — | — | ٤٩٣٠ | ٠ ١٢ ١٧١ | — | — | — | ٠ ١٢ ١٧١ | ٤٩٣٠ | -/٤/- |
| پۆلکە - Polka – | — | — | — | — | — | — | — | — | ٤٥٦ | — | — | — | — | — | ٤٥٦ | -/٤/- |
| گیزن - Gizen - | — | — | — | — | — | — | — | — | ١٠٠٩ | ٠ ٠ ٤٤ | — | — | — | ٠ ٠ ٤٤ | ١٠٠٩ | -/٤/- |
| میوە و سەوزە | — | — | — | ٠ ٠ ٢٣٢٤ | — | — | — | ٠ ٠ ٢٥٠٠٠ | — | ٠ ٤ ١٨٧٠ | ٠ ٠ ٤٤٩ | ٠ ٠ ١٢٦٥ | — | ٠ ٤ ٣٠٩١٨ | — | — |
| کودە (سەرانە) | — | — | — | ٠٠ ٢٨٦٣٢ | — | — | — | — | — | — | — | — | — | ٠ ٨ ٢٨٦٣٢ | — | — |
| دار | — | — | — | ٠ ٠ ٤٠٠٠ | — | — | — | — | — | — | — | — | — | ٠ ٠ ٤٠٠٠ | — | — |
| ئارەق | — | — | ٠ ٠ ٢٥ | ٠ ٠ ٢٦٠ | — | — | — | — | — | — | — | — | ٠ ٠ ١٥ | ٠ ٠ ٣٠٠ | — | — |
| مازوو .. تد | ٦ ٨ ٥٢١ | ٢ ٤ ٤٨٠ | ٦ ٦ ١٠٩ | ٦ ٠ ٦٥٩ | ٦ ١٢ ٩٩٢ | ٠ ٢ ٢٨٥ | ٢ ١٥ ٧٠٨ | ٦ ٠ ٥١٦ | — | ٩ ٦ ٥٥٨ | ٠ ٣ ٧٤٦ | ٦ ١٤ ٧٨٤ | ٢ ٢ ٥٤٠ | ٦ ١٣ ٦٩٠٢ | — | — |
| گومرگ | — | — | — | ٠ ٠ ٢٧٨ | ٩ ٧ ١٥٨ | ٠ ٧ ٧٠ | ٠ ٨ ٤٩ | ٠ ٢ ١٥٠ | — | ٠ ٢ ٣٩٧ | ٠ ٤ ٢٧٢ | ٠ ١٥ ٨٤٠ | ٠ ٠ ٥٧٦٤ | ٩ ١٣ ٧٩٨٠ | — | — |
| باجی تووتن | ٠ ٨ ٦١٧ | ٠ ١٤ ١٤٢٤١ | ٠ ١٢ ٢١٥٧٣ | ٠ ٧ ٢١٨٩٣ | ٠ ٤ ١٥٩٢٦ | ٠ ٠ ٧٢٢٥ | ٠ ٠ ١٣١٦٩ | ٠ ٨ ١٢٦٧٥ | — | ٠ ٠ ١٧٢٧٣ | ٠ ٠ ١٧٤٥٦ | ٠ ٠ ١٨٠٨٥ | ٠ ٠ ١٦٥٠٤ | ٠ ٥ ١٩٢٣٠٠ | — | — |
| مۆڵەتپێدان | — | ٠ ٠ ٤٠ | — | — | — | — | ٠ ٠ ٧٥ | ٠ ٠ ١٥ | — | — | — | — | ٠ ٠ ١٥ | ٠ ٠ ١٤٥ | — | — |
| باجی پێستە | — | — | ٠ ٨ ١٥ | — | — | — | — | — | — | — | — | — | ٠ ٣ ٢ | ٠ ١١ ١٧ | — | — |

تێبینی :– بەشێك لە داهاتی دانەوێڵە بە کاش کۆکرایەوە و بەشێکیش بە شێوەی پشتگیرییەك لە بەرەوپێشبردنی کشتوکاڵ لە داهاتوودا و وەك یەدەك بۆ کڕین لە کاتی نەبووندا.

(*) :– (ر) واتە ڕوپیەی (Rupee) هیندی ، (ع)هێمایە بۆ عانەی (Anna) هیندی کە دراوێکی ئەوسای هیندی بوو، (پ) هێمایە بۆ پیی (pie) هیندی کە دراوێکی ئەوسای هیندیی بچووك بوو ، لە سەدەی نۆزدەهەم و لە سەردەمی حوکمڕانی بەریتانیاشدا یەك ڕوپیەی هیندی ١٦ عانە بوو و هەر عانەیەکیش ١٢ پی بوو ، واتە ئەو کات هەر ڕوپیەك ١٩٢ پی بوو ، هەروەها دراوێکی تریش هەبوو بە ناوی پایسا (Paisa) ، قیمەتی لە عانە کەمتر بوو، یەك ڕوپیە ٦٤ پایسا بوو. وا دەردەکەوێت کە بەریتانیا لە ساڵی ١٩١٩ لە کوردستاندا ئەو دراوە هیندییەی بەکارهێناوە و بۆیەش لە خشتەکەدا داهات هەر بەو دراوە تۆمار کراوە. شیاوی گوتنە لە ساڵی ١٩٥٧ –ەوە ئەم دابەشبوونەی دراوی هیندی گۆڕا و یەك ڕوپیە بووە ١٠٠ پایسا و عانەش نەما (وەرگێڕ).

**پاشکۆی دووەم**

**خشتەی بازرگانی لە کۆیە لە مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٩(تێچووەکان)**

| کالاکان | هەولێر | | پردێ | | مووسڵ | | کفری | | تکریت | | کەرکووک | | بەغدا | | | کۆ (هەموو) |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | کیلۆ | بەها | کیلۆ | بەها | کیلۆ | بەها | کیلۆ | بەها | کیلۆ | بەها | کیلۆ | بەها | ژمارە | کیلۆ | بەها | بە ڕوپیە و عانە |
| | | د ع | | د ع | | د ع | | د ع | | د ع | | د ع | | | د ع | د ع |
| توتن | – | – | ٩٩ | ٨ ١٤٨ | ٦ | ٠ ٩ | ٣٩٩ | ٨ ٥٩٨ | ٥١٧٨ | ٠ ٧٧٦٧ | ٢٩٧٠٥ | ٨ ٤٤٥٥٧ | – | ١٠٠٤٧ | ٨ ٢٢٥٧٠ | ٠ ٧٥٦٥١ |
| مازوو | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ١٣٢١ | ٨ ٤٩٥ | – | ١٤٤١٧ | ٥ ٤٥٠٥ | ١٣ ٥٠٠٠ |
| کالایخا – Galaikha | – | – | – | – | ٣٢٦ | ١٠ ١٤٢ | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ١٠ ١٤٢ |
| شریس – Shiris | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٦٤ | ٠ ٢٨ | – | – | – | ٠ ٢٨ |
| بنێشت | – | – | – | – | ٣٠ | ٠ ٦٠ | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٠ ٦٠ |
| خوری | – | – | – | – | – | | – | – | – | – | – | – | – | – | ٠ ٣٢٥٠ | ٠ ٣٢٥٠ |
| مێوژ | ١٠٠٠٠ | ٢٥٠٠٠ | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٠ ٥٠٠ | ٠ ٣٠٠٠ |
| باوی | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٠ ٢٥٠٠ | ٠ ٣٥٠٠ |
| گوێز | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ١٠٠٠٠٠ | – | ٠ ٤٠٠٠ | ٠ ٤٠٠٠ |
| یەک پێستە (ڕێوی) | – | – | – | – | ٢٦ | ٠ ٥٢ | – | – | – | – | – | – | – | | – | ٠ ٥٢ |
| هەموو | ١٠٠٠٠ | ٢٥٠٠٠ | ٩٩ | ٨ ١٤٨ | ٣٢٦ کالایخا<br>٢٦ پێستە | ١٠ ٢٦٣ | ٣٩٩ | ٨ ٥٩٨ | ٥١٧٨ | ٠ ٧٧٦٧ | ٣١٠٩٠ | ٠ ٤٥٠٨١ | ١٠٠٠٠٠ | ٤٠٩٦٤ | ١٣ ٣٨٣٢٥ | ٧ ٩٤٦٨٤ |

**داهات**

بەهای ئەو کالایانەی لە کۆیە فرۆشراون بە پلەی یەکەم جلوبەرگ ، چا ، شەکر و سابوون بریتییە لە: ٣٥١٦٠ ڕوپیە

بەهای ئەو کالایانەی لە ڕێگەی کۆیەوە بۆ ڕانیە، قەڵادزێ و سەردەشت چوون بریتییە لە: ٣٠٠٠٠ ڕوپیە

## پاشکۆی سێیەم

### بەراوردکردنی نرخەکان لە کۆیە لە مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٨ تاکو کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٩

| کاڵاکان | نرخ لە کاتی داگیرکردن – کانوونی یەکەم ١٩١٨ | | | نرخ لە دوای ٦ مانگ – حوزەیرانی ١٩١٩ | | | نرخ لە دوای یەک ساڵ – کانوونی یەکەم ١٩١٩ | | | نرخ لە پێش شەڕ (شەڕی یەکەمی جیهان) | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | د | ع | پ | د | ع | پ | د | ع | پ | د | ع | پ |
| گەنم ، پلە یەک / کیلۆیەک | ٢ | ٨ | · | · | ٦ | · | · | ٧ | ٩ | · | · | ٦ |
| گەنم ،پلە دوو / کیلۆیەک | ٢ | ٤ | · | · | ٥ | · | · | ٦ | ٣ | · | · | ٤ |
| جۆ ، پلە یەک / کیلۆیەک | ٢ | · | · | · | ٤ | · | · | ٦ | ٣ | · | · | ٣ |
| جۆ ، پلە دوو / کیلۆیەک | ١ | ١٣ | · | · | ٤ | · | · | ٦ | · | – | – | – |
| برنج ، پلە یەک / کیلۆیەک | ٢ | ١٣ | · | ١ | ٦ | ٦ | · | ١٣ | ٦ | · | ١ | ٣ |
| هەرزن / کیلۆیەک | ٢ | · | · | – | – | – | · | ٣ | ٣ | · | · | ٦ |
| ئارد / کیلۆیەک | ٢ | ٨ | · | · | ٧ | ٦ | · | ٩ | · | · | · | ٩ |
| نان / کیلۆیەک | ٢ | ٥ | · | · | ٦ | · | · | ٦ | ٩ | · | · | ٦ |
| گۆشت / کیلۆیەک | ١ | ٦ | ٦ | · | ١٥ | · | · | ١٤ | · | · | ١ | ٦ |
| ڕۆن / کیلۆیەک | ٢ | ٨ | · | ١ | ١٤ | · | ٢ | ٤ | · | · | ٢ | ٣ |
| ڕۆنی ئاژەڵ/ کیلۆیەک | ٤ | · | · | ٣ | ٤ | ٦ | ٣ | ٤ | ٦ | · | ٧ | ٤ |
| شیر / بوتڵێک | · | ١٢ | · | – | – | – | · | ٥ | · | · | · | ٦ |
| شەکر ، پلە یەک / کیلۆیەک | ١٥ | · | · | ٣ | · | · | ٢ | ٤ | · | · | ٣ | ٩ |
| شەکر ، پلە دوو / کیلۆیەک | ١٢ | · | · | ١ | ٧ | · | ١ | ٧ | · | · | ١ | ٦ |
| چا ، پلە یەک / کیلۆیەک | ٩ | · | · | ٥ | · | · | ٣ | ١٢ | · | ١ | ٣ | ٩ |
| چا ، پلە دوو / کیلۆیەک | ٨ | · | · | ٤ | ١٤ | · | ٣ | ١٠ | · | ١ | · | · |
| خوێ / کیلۆیەک | · | ١٢ | · | · | ٦ | · | · | ٦ | · | · | ١ | ٢ |
| کا | · | ١ | · | · | · | ٩ | · | · | ٦ | · | · | · |
| سابوون ، پلە یەک | ٣ | · | · | ٤ | ٣ | ٦ | ٣ | ١٢ | · | · | ٣ | · |
| سابوون ، پلە دوو | ٢ | · | · | ١ | ٤ | · | · | ١٥ | · | · | ٢ | ٦ |
| هێلکە ، دانەیەک | · | ٢ | · | · | ١ | ٦ | · | ١ | ٦ | · | · | ١ |
| شقارتە / دەرزەنێک | ١ | ٨ | · | · | ٩ | · | · | ١٠ | · | · | ١ | ٦ |
| داری قەراشکەری ، باری گوێدرێژێک ٥٠ کیلۆ | ١ | ١٣ | · | ١ | ١٤ | · | ١ | · | · | · | ٣ | · |
| پەمۆ / کیلۆیەک | ١ | ٧ | · | – | – | – | ٢ | ٨٠ | · | · | ٣ | · |
| خوری | · | ١ | · | – | – | – | · | ١٣ | ٩ | · | ٦ | ٦ |
| جلی خوری (دەسکرد) / یەک تۆپ | ٥ | · | · | – | – | – | ٣ | · | · | · | ٩ | · |
| کەتان / پاردەیەک | ١ | ١٣ | · | – | – | – | ١ | · | · | · | ٣ | · |
| قوماشی کارگە / پاردەیەک | ١ | ٨ | · | – | – | – | ١ | · | · | · | ٣ | ٦ |
| پێستی گا / دانەیەک | ١٢ | · | · | – | – | – | ١٥ | · | · | ٣ | · | · |
| ئاسن / کیلۆیەک | · | ٦ | · | – | – | – | ٢ | · | · | · | ٣ | · |
| کرێی ڕۆژانەی هێسترێک | ٨ | · | · | ٨ | · | · | ٤ | · | · | · | ١٠ | · |
| کرێی ڕۆژانەی گوێدرێژێک | ٤ | · | · | ٤ | · | · | ٢ | · | · | · | ٥ | · |
| کرێی ڕۆژانەی کرێکارێک | ١ | · | · | ١ | · | · | ١ | · | · | · | ٥ | · |

**وێنەی ژمارە (١)** *



**لە ڕاستەوە بۆ چەپ :**

(١) جەمیل ئاغای حەوێزی – قایمقامی کۆیە، (٢) میرانی قادر بەگ – سەرۆکی عەشیرەتی خۆشناو، (٣) عەولاّغای حەوێزی – سەرۆکی شارەوانی کۆیە لە سەردەمی عوسمانییەکان.

**وێنەی ژمارە (٢)**



**حەماغای غەفووری سەرۆکی بنەماڵەی غەفووری و حاکمی شاری کۆیە لە ساڵی ١٩١٩**

* وێنەکان لە لایەن وەرگێڕەوە کۆ کراونەتەوە و دانراون.






**مەلا محەمەد جەلی زادە (١٨٧٦ – ١٩٤٣) ناسراو بە مەلای گەورە، حاکمی شەرعیی کۆیە ساڵی ١٩١٩**

**وێنەی ژمارە (٤)**



**کاپتەن ویلیەم روپێرت هەی (١٨٩٣ – ١٩٦٢)، یەکەمین حاکمی سیاسی کۆیە ( ك٢ / ١٩١٨) و یەکەم حاکمی سیاسی لە هەولێر و نووسەری کتێبی "دوو ساڵ لە کوردستان"، کە ساڵی ١٩٢١ لە لەندەن چاپ کرا.**

**وێنەی ژمارە (٥)**



**سەرۆکەکانی عەشیرەتی خۆشناو ( ساڵح بەگ – قادر بەگ – ڕەشید بەگ)**

**وێنەی ژمارە (٦)**



**جەمیل ئاغا قایمقامی کۆیە لە کاتی سەردانی بۆ قوتابخانەی ( ئوولا) ی سەرەتایی لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٨**

**سەرچاوە:**

ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا

**پەراوێزەکان:**

* ئەم بابەتە لە ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا (FO371/5069)، وەرگیراوە و لە زمانی ئینگلیزییەوە کراوەتە کوردی. بابەتەکە بریتییە لە ڕاپۆرتێکی هەمە لایەنەی کاپتەن ڕەندەڵ ( ناوبراو لە ١٩١٩/٥/٨ بووە ی. حاکمی سیاسیی کۆیە) دەربارەی باری سیاسی و ئابووریی ناوچەی کۆیە بە تایبەتی و قەزاکانی دیکەی لیوای کەرکووک بەگشتی (ئەو کات قەزای کۆیە، هەولێر، شەقڵاوە، ڕواندز و کفری سەر بە لیوای کەرکووك بوون و لە پاشان هەولێر کرایە لیوا). کاپتەن ڕەندەڵ زۆر بە دیقەت و شارەزایانە و پاڵپشت بە زانیاریی ورد و ژمارە باس لە ژیانی سیاسی، باری ئابووری، پەیوەندیی هۆز و بنەماڵەکان، بازاڕ، نرخ، باج، تەندروستی، سەربازی و..تاد دەکات. شێوازی ئامادەکردن و نووسینی ڕاپۆرتەکە زیرەکی و لێهاتوویی و دیسپلینی کاربەدەستە سەربازی و مەدەنییەکانی بەریتانیا دەردەخات، کە سەردەمانێکی دوورودرێژ حوکمڕانی ناوچەیەکی فراوانی ئاسیایان کرد و شوێنەوارێکی گەورەیان لە پاش خۆیان بەجێهێشت، کە هەندێك وڵات تاکو ئێستاش بە باشی سوودی لێ وەردەگرن. (وەرگێڕ).

١ دوای داگیرکردنی میزۆپۆتامیا (عێراق) لە لایەن بەریتانیاوە لە ساڵی ١٩١٧، بۆ هەڵسووڕاندنی کاروباری وڵات ئیدارەیەکی مەدەنی دامەزرا، سێر ئەرنۆڵد ویڵسن لە ئاداری ١٩١٨ تاکو ئەیلوولی ١٩٢٠ سەرۆکی ئەم ئیدارەیە بوو. عێراق بەسەر ١٣ یەکەی ئیداری (لیوا) دابەش کرا و هەر لیوایەك حاکمێکی سیاسی بەڕێوەی دەبرد و هەموو حاکمە سیاسییەکان ڕاستەوخۆ سەر بە کۆمسیاری مەدەنی بوون لە بەغدا. هەر یەکەیەکی سەرەکیش (لیوا) لە چەند یەکەی لاوەکی (ناوچە یان قەزا) پێکهاتبوو کە ئەفسەرێکی بەریتانی بە ناونیشانی یاریدەدەری حاکمی سیاسی (A.P.O.) بەڕێوەی دەبرد و ئەویش ڕاستەوخۆ بەرامبەر حاکمی سیاسی بەرپرسیار بوو. حاکمە سیاسییەکان و حاکمە سیاسییە یاریدەدەرەکان هەموویان بەریتانی بوون و پلەی سەربازییان هەبوو. ی. حاکمی سیاسی سەربەخۆییەکی گەورەی هەبوو لەو ناوچانەی لێی بەرپرسیار بوو، کاپتەن ویلیەم هەی یەکەمین یاریدەدەری حاکمی سیاسیی ناوچەی کۆیە بوو، کە ڕانیە و قەڵادزێشی لە خۆ دەگرت. (وەرگێڕ).

٢ حەماغای غەفووری بۆ ماوەی نزیکەی ٦٠ ساڵ لە سەردەمی حوکمڕانیی عوسمانییەکان و هاتنی بەریتانیا بۆ کۆیە سەرۆکی بنەماڵەی غەفوری بووە. ئەو نەیاری عوسمانییەکان بووە و شەڕی لەگەڵدا کردوون و ١٥ ساڵ لە لای عوسمانییەکان لە زینداندا بووە. ئەو پشتیوانی لە بەریتانیا کردووە، لە سەردەمی داگیرکردنی کۆیە لە لایەن بەریتانیاوە یەکەم حاکمی شاری کۆیە بووە. کاپتەن هەی لە کتێبی دوو ساڵ لە کوردستان دەربارەی حەماغا دەڵێ :" سەرباری ئەوەی کە زۆر بە تەمەنە بەڵام لەسەرخۆ و

ئارامە، خاوەن تەواوی توانستی عەقڵی خۆیەتی، حەماغا سەرباری دڵ سافییەکەی پیاوێکی تا بڵێی عیناد، قینچکە تەنگ و بەرامبەر خزمەکانی زۆردارە و هەرگیز بەرامبەر دوژمنەکانی لێبوردەیی نییە، خۆشەویستی و کینە هەردووکیان بە ڕەفتارەکانییەوە دیارن. ئەو ماوەکی زۆر بەرەنگاری هۆزە پەلاماردەرەکانی دەرەوەی کۆیە بووەتەوە و شارەکە و گوندەکانی لە هێرش و پەلاماردانەکانیانی پاراستووە."، حەماغا لە ٣/ ئابی ١٩٢٠ کۆچی دوایی دەکات و جەمیل ئاغای حەوێزی دەبێتە حاکمی شار (وەرگێڕ).

٣ وەك کاپتەن هەی باسی دەکات؛ شێخ عوسمان هەرچەندە بە جەستە بچووك و لاواز بووە، بەڵام پیاوێکی ئارام، نەرمونیان، خاوەن عیزەت نەفسێکی بەرز و ئاشتیخواز بووە، تەماحی لە پۆستی قایمقامییەتی کۆیە نەکردووە. هەر بۆیە بەبێ کێشە فەرمانڕەوایی شارەکە ڕەت دەکاتەوە و کۆیە بەجێ دێڵێت و دەگەڕێتەوە سلێمانی (وەرگێڕ).

٤ عەولاغا کوڕی ئەمین ئاغایە (ئەختەری شاعیر)، لە سەردەمی عوسمانییەکان بەڕێوەبەری شارەوانی کۆیە بووە، کاپتەن هەی بەم شێوەیە باسی دەکات : "عەولاغا سەرۆکی بنەماڵەی حەوێزییە، پیاوێکی لاوازی تەمەن ٦٥ ساڵە، ڕوخسارێکی ڕەنگ زەردی هەیە و هەڵچوونی بەردەوام و شوێنەواری ساڵانی تەمەنی پێوە دیارە، لە پیلانگێڕاندا زیرەکە، خزمەکانی کەیفیان پێ نەدەهات، بەڵام بە توانا هزرییەکانی سەرسام بوون کە زۆر لە توانای هزریی حەماغا پترە".

عەولاغا پەیوەندی لەگەڵ سواراغای سەرۆکی هۆزی پیران خراپ بوو. ئەو دوای داگیرکردنی کۆیە لە ساڵی ١٩١٨ دەیویست ببێتە حاکمی شار، بەڵام بەریتانیا ڕازی نەبوو لەبەر ئەوەی پێشتر پەیوەندی گەرموگوڕی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا هەبوو، بەریتانیا حەماغای پێ لەو باشتر بوو، هەروەها لەسەر پێداگریی حەماغاش پۆستی جێگری حاکمی شاریشی پێ نەدرا، سەرەنجام پۆستەکە بە جەمیل ئاغای ئامۆزای درا. (وەرگێڕ).

٥ مەلا محەمەد کوڕی مەلا عەبدوڵلای جەلییە (بە مەلای گەورەی کۆیە ناسراوە)، لە ساڵی ١٨٧٦ لە کۆیە لە دایك بووە، ساڵی ١٩١٨ دەبێتە حاکمی شەرعی کۆیە، خۆی و حەماغا و جەمیل ئاغا جێگەی متمانەی بەریتانیا بوون. لە ساڵی ١٩٢١ لەگەڵ جەمیل ئاغا یاداشتنامەیەك دەدەنە بەریتانیا و تیایدا داوا دەکەن مافی دیارکردنی چارەنووس بە کورد بدرێت و کوردستان نەلکێندرێت بە دەوڵەتی نوێی عێراق. مەلای گەورە لە ساڵی ١٩٢٤ دەبێتە نوێنەر لە پەرلەمانی عێراق، ئەو دەستنووسی زۆری لە بواری فیقهی و ئەدەبیدا لە پاش بەجێ ماوە، کاپتەن هەی دەڵێت: "مەلا محەمەد ڕووحانییەکی دنیایی و حەزی بە کۆمەڵگا و لەزەتی دنیا بوو". مەلای گەورە لە ساڵی ١٩٤٣ کۆچی دوایی کرد. (وەرگێڕ).

٦ جەمیل ئاغا کوڕی حاجی ئەسعەد ئاغای کوڕی حاجی بەکر ئاغای حەوێزییە، ساڵی ١٨٧٩ لە کۆیە لەدایك بووە. کاپتەن هەی لە کتێبەکەیدا نووسیویەتی: " بەڕاستی جەمیل ئاغا پیاوێکی بەوەجە شانازی بە کوردبوونی دەکات، ئەمینترین و ڕاستگۆترین

کەسە لەوانەی ناسیومن، پیاوێکی دەمارگیر نییە. ئەو جوولەکانەی لە گەڕەکەکەی (هەوار – وەرگێڕ) جەمیل ئاغادا دەژیان، ئەویان بە پارێزگاری خۆیان دەزانی، هەروەها ئەو مەسیحییانەی لە سەر زەوییەکانی ئەودا کاریان دەکرد هەمان هەستیان هەیە. جەمیل ئاغا لە سەرەتای تەمەنی لاوێتی ٤ ساڵ بەڕێوەبەری شارەوانی کۆیە بووە، ئەو تاکە کەسێکە کە ئەو پۆستەی تەنیا بۆ بەرژەوەندی گشتی بەکار هێناوە نەك بۆ بەرژەوەندیی شەخسی، ئەو جوامێرێکی باڵا بەرزی قیتە، لە ڕۆژانی تەنگاویدا هەموو شتێك دەکاتە قوربانیی پاراستنی ئاسایش، ئارامی و ئاشتی، دوو برای زیرەکی هەن، جەلال و جەلیل".

جەمیل ئاغا لە ساڵی ١٩٢٠ دەبێتە حاکمی شار و لە ئاداری ١٩٢١ دەبێتە قایمقامی کۆیە و لە سەردەمی قایمقامییەتی ئەودا نامەی فەرمی لەنێوان فەرمانگەکانی حکوومەت بە زمانی کوردی بووە، هەروەها خوێندنی سەرەتاییش. لە ساڵی ١٩٣٢ جەمیل ئاغا دەبێتە قایمقامی ڕانیە، دوایی لە ساڵی ١٩٣٩ بە ئەندامی پەرلەمانی عێراق هەڵدەبژێردرێت، لە ساڵی ١٩٤٣ دووبارە هەڵدەبژێردرێتەوە، لە ساڵی ١٩٤٦ کۆچی دوایی دەکات. (وەرگێڕ)

٧ عایشەخان کچی حاجی ئەسعەد ئاغای کوڕی حاجی بەکر ئاغای حەوێزییە و خوشکی جەمیل ئاغا و هاوسەری حەماغایە، تەنیا کوڕی حەماغاش، کاکە زیاد، کە بۆی ژیا و بە کۆرپەیی نەمرد لەم ژنەیەتی. (وەرگێڕ).

٨ ئێستاش ئەم هۆزە هەر لە شوێنی جارانییەتی و بەسەر ٨ گوند دابەش بووە، سەرۆکەکەیشیان جەمیل ئاغای کوڕی کەریم ئاغایە (وەرگێڕ)

٩ نووسەری ئەم ڕاپۆرتە سەرباری وشە و کورتکراوە و دەستەواژەی ئینگلیزی، ژمارەیەك وشە و دەستەواژەی کوردی، عەرەبی، تورکی و هیندی بەکارهێناوە بۆ نموونە:

Suwars ,Bhoosa, Hukumdar, Fasl, Shitwi , Saifi, Qadha, Tapu ,Waqf, Dar-ul-ulama, Hakm-i-Shar'ah, Aghawat, Hakmi-Shahr, Nok, Gagoz,

لەم وەرگێڕانەدا هەوڵم داوە هەندێك کورتکراوە و وشە وەکو خۆی بنووسمەوە یان لە ناو کەوانەی دابنێم، هەروەها دەسکاری زۆربەی وشە و دەستەواژەکان نەکەم (بەتایبەتیش عەرەبییەکان) چونکە کەسانێکی زۆر تێیدەگەن و لەناو دیالکتی ڕۆژانەدا جاران و ئێستاش باون و پێموایە وەرگێڕانیان بۆ سەر زمانی کوردی تا ڕادەیەك تاموچێژەکەیان کەم دەکاتەوە، ڕەنگە هەر بۆیەش کاپتەن ڕەندەڵ بەکاری هێناون و لە بریان وشەی ئینگلیزی دانەڕشتووە. ڕاپۆرتەکە چەند وشەیەکی هیندیشی تێدایە و کراونەتە کوردی.

ڕەنگە لە چەند بۆنەیەکدا چەند وشەیەکی لای بادینان و کۆیەم بەکارهێنابێت ئەویش بۆ دەوڵەمەندکردنی کارەکە و پێبەخشینی مۆرکێکی ناوچەکە بووە. پەناشم زۆر نەبردۆتە بەر وشەی پەتی و زۆر نەبیستراو و نائاشنا لە لایەن زۆربەوە، تاڕادەیەکی زۆریش لە بواری ڕێزمان و ڕێنووسەوە پابەندی ڕێنماییەکانی گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی بوومە و ڕەچاوی تێبینییەکانیم کردووە.

لە پاشکۆی یەکەم و دووەمدا هەندێك هەڵە لە کۆکردنەوەی ژمارەکاندا (کۆی داهات) لە تێکستە ئینگلیزییەکەدا هەیە، هەموویانم ڕاست کردۆتەوە.

## ملخص البحث

اعد هذا التقرير الاداري من قبل الكابتن رندل مساعد الحاكم السياسي لمنطقة كويسنجق في مستهل عام ١٩٢٠، أبان الاحتلال البريطاني لكوردستان الجنوبية ويتناول مختلف جوانب الحياة السياسية، الاقتصادية، المالية، الاجتماعية، الصحية، الزراعية، العسكرية، القضائية، العشائرية...الخ في هذه المنطقة خلال عام ١٩١٩. يبدأ التقرير بتسليط الضوء على الوضع الاثنوغرافي للمنطقة التي كانت قصبة كويسنجق مركزها حينئذ وكانت تتبعها نواحي شقلاوة، رانية وقلعة دزة. أشار رندل الى العشائر والعوائل والشخصيات المتنفذة في ارجاء هذه المنطقة في وقت حرج من تأريخها المليء بالاحداث السياسية والتغيرات الكبيرة، التي حدثت في اوضاع العالم والمنطقة اثر انتهاء الحرب العالمية الاولى وانتصار بريطانيا وحلفائها وانهيار الامبراطورية العثمانية.

كرس جزء من التقرير للحديث عن العائلتين الرئيسيتين في كويسنجق، ونقصد بهما الغفوريين والحويزيين اللتان كانتا تتمتعان بالسلطة السياسية والاجتماعية والاقتصادية في كويسنجق وضواحيها، ويتطرق ايضا الى العلاقة الموجودة بينهما من جهة وعلاقتهما بالعشائر الكردية وثورة شيخ محمود الحفيد وكيفية تعاطيهم مع الدولة العثمانية وسلطات الاحتلال البريطاني، الحاكم الجديد المنتصر من الحرب من جهة اخرى. يسرد التقرير كذلك صفات ومميزات الشخصيات المحلية المتنفذة ورؤساء العشائر الكردية وعلاقاتهم العامة ومن بينهم شيخ محمود الحفيد، حمه آغا الغفوري، جميل آغا الحويزي، ملا محمد، قادر بيك الميراني.

يتضمن التقرير كذلك معلومات دقيقة مشفوعة بالأرقام والاحصائيات (منشورة في ثلاثة ملاحق) عن الواردات، الاسعار، الضرائب والجبايات في تلك الفترة. كما يتحدث عن حالة الطقس، الصحة، العقارات، الطابو والوقف، بالأضافة الى الخدمات العامة التي قدمتها سلطة الاحتلال البريطاني للسكان طوال عام ١٩١٩. يذكر ان منطقة كويسنجق دخلت تحت الحكم البريطاني يوم ١٥ كانون الاول عام ١٩١٨ عندما وصل اليها كابتن هَي الذي اصبح فيما بعد الحاكم السياسي لاربيل.

# Abstract

This report has been prepared by captain Randel the assistant of the political ruler of Koysinjaq region in early 1920s during the occupation of Britain of southern Kurdistan. It tackles upon various political , economic , financial , social , health , agricultural, military, juridical and tribal aspects of the region in 1919.The reports starts with shedding light on the ethnographic situation of the region in which koysinjaq was the centre and sub districts of Shaqlawa , Ranya and Qaladiza were part of it. Randel has also talked about the influential tribes , families and personalities all over the region in this critical historic period full of political events and significant changes that happened in the world and the region due to the end of World War I and winning of Britain and its allies and the collapse of the Ottoman empire.

Part of this report is being devoted to talking about the two major families of koysinjaq , the Ghafoories and the Hawezies, who had political, social and economic power in Koysinjaq and the suburbs. The report also tackles the relation between the two families on the one hand and the relation of the two families with other Kurdish tribes and Shekh Mahmood Hafeed revolution and the way they behaved with the Ottomans and British authorities , the new ruler of region on the other hand. Personal traits and characteristics of the local influential personalities and tribe-chiefs , their public relations were also handled in the report such as Shekh Mahmood Hafeed , Hama Aghay Ghafoory , Jameel Aghay Hawezy , Mulla Muhammad , Qadir Bag Mirany.

The report also includes accurate information supported by numbers and statistics ( in three appendices) about the income , costs , taxes and customs during this period. It also talks about the weather , health , real estate , house ownership documents , endowments , in addition to the public services provided by the British occupying authority to the people in 1919.It also states that Koysinjaq has come under the rule of Britain on 15th December 1918 when Captain Hey has arrived who became the Political rules of Erbil later.

**له چالاکییەکانی لیژنەی دەستنووس و بەڵگەنامە :**

# ڕاپەڕینی شێخ عەبدولسەلامی دووەمی بارزان له بەڵگەنامه عوسمانییەکاندا

**و. له عەرەبییەوە: د. نەجاتی عەبدوڵڵا**

## له برێتی پێشەکی

ئەم بەڵگەنامانەی کە لێرەدا کراون بە کوردی و ڕاستەوخۆ لـە ئەرشـیڤخانەی عوسمانییەوە وەرگێراون. لێژنەی دەستنووس و بەڵگەنامە لە ئەکادیمیای کوردی، لە ڕوانگەی درککردن بـە دەوڵەمەنـدیی ئـەم ئەرشـیڤخانەیە لـە حـوزەیرانی سـاڵی ٢٠١١دا، شاندێك، کە پێکهاتبوون لە بەڕێزان: د. عەبدولفـەتتاح بۆتـانی، سـەرۆکی لێژنــە و ئەنــدامێتی تەحســین دۆســکی، ســەردانی تورکیایــان کــرد. شــاندەکە کۆمەڵێکی زۆر بەڵگەنامەی مێژوویی عوسمانی تایبەت بە کـورد و کوردسـتانی لـە ئەرشیڤی عوسمانی وەگیرخست، هەر لەوێشدا بەڵگەنامـەکان لـە لایـەن وەرگێـڕی پسپۆر و تایبەتمەندی ئـەم بـوارە وەرگێڕدراونەتـە سـەر زمـانی عـەرەبی. لێژنـەی دەسـتنووس و بەڵگەنامـەکان ، بـۆ ئـەوەی ئـەم بەڵگەنامانـە بکەونـە بەردەسـتی هــەموو لایــەك، بڕیــاری داوە تــەواوی ئــەو بەڵگەنامانــە، بــە تێبــینی و پــەراوێزی پێویستەوە بکاتە کـوردی و لەسـەر لاپـەڕەکانی **"گۆڤـاری ئـەکادیمیای کـوردی"** بڵاویان بکاتەوە. بۆ ئەم کارەش ئێمە ڕاسپێردراوین تا تاوتوێی ئەم ئەرکە بکەین، بەڵگەنامەکانی ئەمجارە تایبەتە بە ڕاپەڕینی شێخ عەبدولسـەلامی دووەمـی بـارزان (١٩٠٧–١٩١٤).

**بەڵگەنامەی یەکەم:**

**بابی عالی**

**دائیرەی ئومووری داخلییە**

**مەکتوب قەلەمی (قەلەمی نووسراوەکان)**

## خوێندنەوەی برووسکەی هاتوو لە والیی مووسڵ

لە برووسکەیەکی هاتوو لە وەکیلی والیی مووسڵ بە مێژووی (١١ و ١٢ ی ئۆگستۆسی ١٣٢٥)[1]، بە پشت بەستن بەوەی لەناوخۆ پێیان ڕاگەیاندین، یاغییەکانی بارزان لەگەڵ ئەو مەفرەزەیە بەرەوڕوو بوونەتەوە کە بەرەو ئاکرێ ڕۆیشتووە و موریدەکانی شێخی بارزان توانیویانە مەفرەزەی تابووری سێیەمی سەر بە کەتیبەی چل و حەوت بە هەموو چەکەکانیانەوە چەک بکەن، ژمارەی بریندارەکان تا ئێستا گەیشتۆتە پانزە بریندار، کە ڕەوانەی مەرکەزی قەزا کراون، بە بەردەوامی کۆمەگ و یارمەتی دەگاتە موریدەکان، دەیانەوێ دوای لەناوبردنی هێزی سەربازی هێرش بکەنە سەر ئاکرێ، بۆیە لە سۆنگەی ترسناکی ڕەوشەکە وا پێویست دەکات لە هەموو لایەکەوە سەرباز بهێنرێ، هەروەها چەك و تەقەمەنی، ئەو تۆپهاوێژانەی کە پێشتر ڕەوانە کرابوون تەواو بوون و وا پێویست دەکات چەك و تفاقی بۆ ڕەوانە بکرێت. لەبەر ئەم پەرەسەندنە ترسناکە فەرمان دەرچووە لەگەڵ پێداگرتن لەسەر خێراکردنی جوولەی تابووری چوارەمی سوپا لە چەمچەماڵ و تۆپهاوێژە چیاییەکان لەگەڵ بڕێکی تەواو لە چەك و تفاق، "ئاکرێ" مان ئاگادار کردۆتەوە بەوەی فەرمانمان بۆ محێیەدین پاشا، وەکیلی سەرکردەی مووسڵ، ناردووە بە کۆمەگی هۆزە گوێڕایەڵەکان بەرەو ئەوێ بەڕێ بکەوێ بۆ ڕێگەگرتن لە ڕووداوگەلی خراپ. هەروەها فەرمان بۆ هۆزە گوێڕایەڵەکانی ئاکرێ و ئاغاواتی زێبار و سەرۆك هۆزەکانی بەرواری سەر بە ئامێدی، ڕەشید بەگ و بەراش حەسەن ئاغا و ئاغەواتی دۆسکی و عەبدوڵڵا پاشای ڕەواندزی دەرچووە،

تابـه‌خۆیان و برێكـی تـه‌واو لـه‌ چـه‌كداره‌كانیان بـه‌ره‌و ئـاكرێ بكه‌ونـه‌ ڕێ. تكایـه‌ بفه‌رموون بۆ ئاگاداری. ١٣ ی ئۆگستۆسی ١٣٢٥[٢].

**كه‌ركووك**

**وه‌كیلی والیی مووسڵ**

**فه‌ریقی یه‌كه‌م فازیل**

* * *

**به‌ڵگه‌نامه‌ی دووه‌م:**

**بابی عالی**

**دائیره‌ی ئومووری داخیلییه**

**مه‌كتوب قه‌له‌می (قه‌ڵه‌می نووسراوه‌كان)**

## خوێندنه‌وه‌ی برووسكه‌ی هاتوو له‌ والیی مووسڵه‌وه

له‌و برووسكانه‌ی كه‌ به‌ مێژووی دوێنێ له‌ قائیمقـام و سـه‌ركردایه‌تیی ڕه‌وانـدزه‌وه بۆ وه‌كاله‌تی سه‌ركردایه‌تیی فیرقه‌ی دوانزه‌هه‌م له‌ موته‌سه‌ڕیفییه‌ی كـه‌ركووك هـاتوون و سه‌یرمان كرد، له‌وه‌ تێده‌گه‌ین كـه‌ یاغییـه‌كانی بـارزان بـه‌ تونـدی له‌سـه‌ر یاغیگـه‌رێتیی خۆیان به‌رده‌وامن، تاوه‌كو دووری چوار كاتژمێر له‌ ڕه‌وانـدزه‌وه‌ بڵاوه‌یـان كـردووه‌، وای لێ هاتووه‌ پارێزگاری لـه‌ شارۆچـكه‌كه‌ و ده‌بـۆی چـه‌ك و تفـاق لـه‌ مه‌ترسـیدایه‌، له‌سـه‌ر ئه‌م ڕه‌وشه‌ پێویسته‌ ئه‌م پرسه‌ به‌خێرایی و به‌ توندی یـه‌كلایی بكرێتـه‌وه‌. بۆیـه‌ بڕیـارم دا بۆ خۆم له‌گه‌ڵ دوو تابووری سه‌ر به‌ سوپای چواره‌م، ئه‌وانـه‌ی كـه‌ پێشـتر فـه‌رمانیان بۆ ده‌رچووبوو بجوولێن، له‌گه‌ڵ چوار تۆپهاوێژی چیایی بـه‌ره‌و ئـاكرێ بـڕۆم، نامـه‌شمان بۆ هه‌ر یه‌كـه‌ لـه‌ عه‌بـدوڵڵا پاشـای ڕه‌وانـدزی، كـاكلۆی سـه‌رۆك هـۆزی كـورد و قـه‌ره‌نی ئاغای (مه‌شمه‌شـلی) مـامش لـه‌ قـه‌زای شـنۆ و سـولێمان خـانی سـه‌رۆك هـۆزی زه‌رزا و شێخ ته‌ها ئه‌فه‌نـدی كـوڕی خوالێخۆشـبوو شـێخ محه‌مه‌دصـدیق نووسـی، كـه‌ خۆیـان و سـواره‌ و پیاده‌كـانی عه‌شـایره‌كانیان لـه‌ ڕه‌وانـدز كۆببنـه‌وه‌ و لـه‌وێوه‌ له‌گـه‌ڵ هێزێكـی تـه‌واو به‌سـه‌رۆكایه‌تیی سـه‌ركرده‌ی ڕه‌وانـدز، قائیمقـام جـه‌میل بـه‌گ بـه‌ڕێ بكـه‌ون بـۆ لێـدانی یـاغیبووانی نـاوبراو لـه‌ پشـته‌وه‌. هـه‌روه‌ها سـه‌ركردایه‌تیی هێـزی ڕه‌دووكارمـان ئاگادار كردوه‌ به‌وه‌ی تابووری سێیه‌می سه‌ر به‌ كه‌تیبه‌ی شه‌شه‌م كه‌ له‌ بازیانـه‌ بـه‌ڕێ

بخات، به‌ڵام ئه‌و تابووره پیاده‌ڕۆیانه‌ی كه ڕاسپێردراون بۆ ڕه‌دوونانی هه‌مه‌وه‌ند ژماره‌یان زۆر ناته‌واوه و ئه‌سته‌مه له‌گه‌ڵیان كار بكه‌ن، له ڕاستیدا ئه‌و تابووره‌ی كه له خانه‌قی بوو هه‌ر سه‌ر به به‌شێكی ئه‌م هێزه بوو، بۆیه داوامان كرد و ئه‌وه‌مان خسته به‌رده‌م سه‌ركردایه‌تیی سوپای هومایۆنی به‌وه‌ی ئه‌و تابووره نیزامییه‌ی، كه له خانه‌قی بوو ڕه‌وانه‌ی بازیان بكات له بریتی تابووری سێیه‌می ناوبراو و ناردنی تابوورێكی دیكه‌ی سه‌ر به به‌غدا كه له خانه‌قییه. تكایه بۆ ئاگاداریتان. ١٤ ی ئۆگستۆسی ساڵی ١٣٢٥[٣].

**وه‌كیلی والیی مووسڵ**

**فه‌ریقی یه‌كه‌م**

**محه‌مه‌د فازیل**

* * *

**به‌ڵگه‌نامه‌ی سێیه‌م:**

## برووسكه‌ی هاتوو له ویلایه‌تی وانه‌وه

ج ٢٥ ی ئۆگستۆسی ١٣٢٥[٤]. برووسكه‌ی نه‌زاره‌تتان به مێژووی ١٩ ی ئۆگستۆسی ١٣٢٥[٥] ئه‌مڕۆ له‌كاتی گه‌ڕانه‌وه‌م له باشقه‌ڵا به‌ده‌ستم گه‌یشت. ده‌ستبه‌جێ پرسیارم له قائیمقامییه‌ته‌كانی جۆله‌مێرگ و شه‌مدینان و كورار كرد، له كاتی گه‌یشتنی وه‌ڵام له‌و قایمقامییه‌تانه‌وه زانیارییه‌كانتان ده‌خه‌مه پێش چاو. ئه‌وانه‌ی كه ده‌شێ پێوه‌ندی به شێخی بارزانه‌وه بكه‌ن له عه‌شیره‌ته‌كانی ویلایه‌ت بریتین له عه‌شیره‌تی بنیانش و نه‌ستوورییه‌كانی تخووب و بازی سه‌ر به ناحیه‌ی چالی قه‌زای جۆله‌مێرگ، هۆزه‌كانی ئۆره‌مار و دۆسكی سه‌ر به كورار، وێڕای هۆزه كوردییه‌كانی سه‌ر به شه‌مدینان. هه‌ر سێ عه‌شیره‌تی جۆله‌مێرگ، كه له پێشه‌وه ئاماژه‌مان پێدان له‌گه‌ڵ ڕه‌شید به‌گی سه‌رۆكی به‌رواریی سه‌ر به مووسڵ دوژمنایه‌تییه‌كی كۆنینه‌یان هه‌یه، له‌نێوانیان به هه‌ڵپه‌سێردراوی له نێوان هه‌ردوو ویلایه‌تی وان و مووسڵدا ماوه‌ته‌وه و چاره‌سه‌ر نه‌كراوه. نه‌ستوورییه‌كان و بنیانشه‌كان له دابینكردنی بژێوییان پشت به ئامێدی ده‌به‌ستن، ڕه‌شید به‌گ له‌وه‌تای دووساڵ ده‌بێ له‌سۆنگه‌ی ئه‌م دوژمنایه‌تییه‌وه ڕێگه‌ی لێ گرتوون، ئه‌م ڕه‌وشه ده‌بێته هۆی ئه‌وه‌ی ناچاریان بكات پێوه‌ندی به شێخی بارزانه‌وه بكه‌ن،

بەوەی بەڵكو ڕێگایەك بدۆزنەوە بۆ براوشتە. هەرچی هۆی پێوەندیكردنی ئۆرەمارییەكانە بریتییە لە حوكمدانی بە بێ ئامادەبوونی لەسێدارەدان بۆ سەرۆكەكەیان ستوون و دوژمنایەتی كۆنیان بۆ دەستەی خوالێخۆشبوو شێخ محەمەد صدیق ئەفەندیی كوڕی شێخ عوبەیدوڵلا. هەرچی گەردییەكانە ئەوان لە كۆنەوە موریدی شێخی بارزانن و لێكۆڵینەوەكان ئەوە بە دیار دەخەن، كە كۆی ژمارەی چەكدارانی ئەم هۆزانە دەگاتە نزیكەی شەش هەزار چەكدار. بۆ زامنكردنی پێوەندی نەكردنی نەستوورییەكان بە شێخی بارزان پێویستە هەرچۆنێك بێت و بەهەر نرخێك بێ ئەو هۆیانە تەواو بكرێن كە دەبنە هۆی ئاشتەوایی لەنێوان ئەوان و لەنێوان بەرواریيەكان. وێڕای ئەمە بۆ ئەوەی هەموو ئەمانە گوێڕایەڵ بن دەوەستێتە سەر ئەوەی هێزێكی سەربازیی تەواو و تۆپهاوێژ بۆ ناحیەی گەردی ڕەوانە بكرێت، هەروا ناردنی دوو مەفرەزە بەشێوەی سەربەخۆ بۆ ئۆرەمار. هیوای ئەوە دەخوازرێ لەم حاڵەتەدا ڕێگەی ئەوەیان لەبەر بگیرێ پێوەندی بە (ئاكرێ)وە بكەن لە لایەك و بەردەستخستنی ماڵی میری، كە لەوەتای ماوەیەك دەبێ هەر وەك نووسینی سەركاغەز ماوەتەوە لە لایەكی دیكەوە. لەوەی كە وەرزەكە لەبارە بۆ دەستپێكردن بە كردەی سەربازی بۆیە فەرمانكردن بە دەستپێكردنی كردەكە بەندە بە بۆچوونی نەزارەتی عالی. ٢٧ ی ئۆگستۆسی ساڵی ١٣٢٥[٦].

**والی**
**بەكر سامی**

* * *

**بەڵگەنامەی چوارەم:**

## برووسكەی هاتوو لە والیی مووسڵ و سەرۆكی ناوچەكەوە

**(زۆر بەپەلە)**

پێشتر ئەوەم لە برووسكەی پێشوو ڕاگەیاندبوو، كە ئێمە چووینە ناو گوندی بارزان. دوای دڵنیابوونەوە لە بەدواداچوونەكان، یاغیبووەكانی بارزان لەگەڵ شێخەكەیان هەڵاتوون بۆلای هاوپەیمانەكەیان لە ئاوایی بیێ سەر بە ناحیەی

شێروانە لە ڕەواندز. بڕیاردرا تابووری سێیەمی یەدەگی سەر بە مووسڵ لەگەڵ دوو تۆپهاوێژی چیایی، کە پێشتر لە سوپای شەشەمی هومایۆنی لە مووسڵ بە سەرکردایەتی بێکباشی، ئەمین ئەفەندی هاتبوونە گوندی بارزان بۆ پارێزگاری لێکردنی، هەروەها ئەو سوارە و پیادەڕۆیانەی کە پێشتر لە ڕەواندزەوە بۆ گوندی بەرکی سەر زێی گەورە نێردرابوون بۆ پاراستنی پەڕینەوەکە، پاشان سێ تابووری سەر بە سوپای چوارەم لەگەڵ چوار تۆپهاوێژ بە پشتیوانی خودای گەورە بەرەو ئاوایی بێ ڕۆیشتن. ئاوایی ناوبراو کەوتۆتە سەر چیایەکی بەرز، هێزەکە لە چیای بەرانبەر شوێنی خۆی گرت، شەش تۆپی هاویشت، بەڵام بێ سوود بوو، هۆیەکەشی بە هۆی ئەو خەرەندە قووڵە بوو لەنێوان دوو چیایەکە بەقووڵایی هەزار مەتر و دوورایی دوو کاتژمێر. ئێمە ئەم شەوەمان لە گوندی ڕیلەیی هاوسێ بەسەر برد و لە بەیانی ڕۆژی دواتر بۆ پێچکردنەوە بەرەو گوندی کانی لنج ڕۆیشتین چونکە ڕێگایەك نەبوو لێیەوە بپەڕینەوە بۆ گوندی بێ ناوبراو و لەگەڵ هێزەکانی عەبدوڵڵا پاشای ڕەواندزی بەیەك گەیشتین. زانیمان کە پاشای ناوبراو شەڕی داگیرکارانی شێروانەی لە سێ بەرەدا کردووە و بەسەریاندا زاڵ بووە، هەردوو هێزەکە یەکیان گرتەوە، لە ڕۆژی دواتر ئێمە بەرەو چیای مزووری دەڕۆیشتین کە شێخی ناوبراو خۆی تێدا حەشاردابوو، زانیمان کە تەواوی ئەو گوندانەی، کە کەوتوونەتە نێوان بارزان و شوێنی مەبەست چۆڵ کراون و دانیشتوانەکەی دوای ئەوەی ئاواییەکانیان سووتاندووە پەنایان بۆ ناو چیاکان بردووە. پوختەی قسە ئەوەیە دانیشتوانی هەموو ئەو ناحیە و گوندانەی، کە بە دوای شێخی ناوبراو کەوتوون لە خراپترین هەلومەرجدان، لەسەر دوند و حەشارگەکانی زنجیرە چیاکان خۆیان شاردۆتەوە، ئەوەی کە ناچارمان دەکات لە شوێنی دیکەوە بسووڕێینەوە بۆ زوو وەدیهێنانی ئەنجامی یەکلاییکەرەوە. تکایە بۆ ئاگاداریتان.

**٤ ی ئەیلوولی ١٣٢٥**[٧].

**والیی مووسڵ و سەرکردەی ناوچەکە لە گوندی کانی لنج**

**فەریق یەکەم، فازیل**

ئەم ڕاپۆرتە نیشانی سەدارەت دەدرێت و ئەوەشی تیایدا بە باش دەزانرێت دەدرێتە ڕۆژنامەوانی. ٧ ی ئەیلوولی ساڵی ١٣٢٥[٨].

**بەڵگەنامەی پێنجەم:**
**بابی عالی**
**نەزارەتی داخیلییە**
**شیفرە قەلەمی (قەڵەمی نهێنی)**

## خوێندنەوەی برووسکەیەکی هاتوو لە والیی مووسڵ و سەرۆکی ناوچەکە لە ڕەواندزەوە

به کۆمەگی خودای گەورە و ڕۆحانییەتی پێغەمبەر و پەلاماری سەربازان و هێزەکانی پشتیوانی، کۆمەڵی نەگریسی شێخی بارزان، کە لە بڵاوکردنەوەی فەساد زۆر و زۆرداری نواندبوو، پەرتەوازەیان پێ کرا و ئیدی شیمانەی کۆکردنەوە و هاوپەیمانییان لەگەڵ هۆزەکانی دیکەی بۆ نەماوەتەوە. ئەم یاغییانە کە شەڕیان کرد و خراپ تێکشکان بەرەو چیایە سەختەکان هەڵاتن و لەناو جەنگەڵستانە چڕوپڕەکانی ناو چیاکاندا خۆیان شاردەوە. ژمارەی ئەو یاغییانەی کە تا ئێستا دەستگیر کراون نزیکەی چل کەسیان دەستگیر کراون کە بردراون بۆ مەرکەز، لەگەڵ ژمارەی زۆرتری ڕەدوونان و ڕاونانیان هەموو ڕۆژ لەنێوان پێنج تا شەش یاغی دەستگیر دەکرێن. هەرچی شێخ خۆیەتی دەرفەتی لە سەختی و هەڵەمووتی ناوچەکە وەرگرتووە، لەگەڵ دوو لە موریدەکانی ڕایکردووە و دەستنیشانکردنی شوێن و نەواکەی سەختە. هیوا دەخوازرێ کە بەم نزیکانە لە ئەنجامی ڕاوەدوونانی توندا دەستگیر بکرێت، بۆیە لەسەر ئەوەی پێشکەش کرا، من ڕام وایە تابوورێکی سەربازی لە گوندی بارزان بمێنێتەوە. دووبارە سەرلەنوێ پێکهاتەی قائیمقامیەتی زێبار، کە ماوەی کاتژمێرێك لە گوندەکەوە دوورە دروست بکرێتەوە، کە تا پێش چەند ساڵێك مەرکەزی قەزا بوو، هەڵوەشێنرایەوە و ئاسایش بەو شێوەیە کە دەیبینین، مەرکەزی قەزا بگوازرێتەوە بۆ بارزان و تا ئەوکاتەی ئەم گواستنەوەیەی تێدا دەکرێت وەکیلی قائیمقام تێیدا بمێنێتەوە و ناحیەی شێروانی سەر بە ڕەواندز بە قەزای ناوبراوەوە بلکێندرێ وەك ئەوەی لە پێشوودا وا بوو و مەفرەزەیەکی نیزامی لەو تابوورەی کە لە ڕەواندزە تێیدا نیشتەجێ بێت و بەو پێیە دەکرێ ڕێ بگیرێ هەم لە سەرگرتنی هەموو گریمانەکان

و هەم لە جێبەجێ نەبوونی نیازخراپی و بیر و بۆچوونە نەفرەتییەکان. تکایە بۆ ئاگاداریتان.

**١٧ ی ئەیلوولی ١٣٢٥** [٩].

**فازیل**

* * *

**بەڵگەنامەی شەشەم:**

**نەزارەتی داخیلییە**

**دائیرەی موخابەراتی عموومی**

## بۆ مەقامی بەرزی سەدارەت

بۆ بەرچاوڕوونیی سەدارەتی باڵا ئەو برووسکەیەی کە لە والیی مووسڵ، فازیل پاشا هاتبوو، لەبارەی بەیەکگەیشتنەوە بەو هێزەی کە عەبدوڵڵا پاشای ڕەواندزی سەرۆکایەتی دەکات و بەشداری دەکات لە کردە سەربازییەکانی تەمێکردن و ڕەدوونانی یاغییەکانی بارزان و شێخی هاوپەیمانیان و پێشکەشکردنی کۆمەگیی پێویست، هەردوو هێز بەیەکەوە بەردەوام دەبن لە ڕەدوونانەکانیان و دانیشتوانی گوندەکانی بارزان، کە کەوتوونەتە سەر ڕێگە، گوندەکانیان چۆڵ کردووە و سووتاندوویانە و بەرەو دوندی چیاکان هەڵاتوون و لەبەرچاوان ون بوون. فەرمان بۆ حەزرەتی وەلی ئەمرە.

**٨ ی ئەیلوولی ١٣٢٥**[١٠].

* * *

**بەڵگەنامەی حەوتەم:**

**بابی عالی**

**نەزارەتی داخیلییە**

**شیفرە قەلەمی (قەڵەمی نهێنی)**

## خوێندنەوەی برووسکەیەکی هاتوو لە والیی مووسڵ و سەرۆکی ناوچەکەوە

پاشبەندی ڕاپۆرتە برووسکەی مێژووی ١٧ ی ئەیلوولی ساڵی ١٣٢٥[١١].

پێشتر لە هەڵاتنی شێخی بارزان لە ڕەوشێکی زۆر خراپدا ئاگادارمان کردنەوە، مەفرەزە و شۆفارەکانمان ڕەدوویان دەنێن و لەناوخۆدا بە شوێنیدا دەگەڕێن و

هەواڵە ڕاست و دروستەکان ئەوە ڕادەگەیەنن، کە ناوبراو بەرگی خۆی گۆڕیوە و ڕیشی تاشیوە و لەگەڵ چوار لە پیاوەکانی لە گوندی زاوێتەی سەر بە عەشیرەتی تخوبی، کە لە عەشیرەتی تەیاری کریستانن لەناو ویلایەتی واندا. هاوبەشە تاوانکارەکەیی و خەلیفەکەی فەقێ عەبدولڕەحمان خۆی و منداڵەکانی، هەروەها قادر و خالید، کە دوو لە سەرانی یاغیین لە ئاوایی تحویەی سەر بە هۆزی ناوبراودان. بۆ ئەمە مولازمی جەندرمە بە هاوڕێیەتی سەرۆکی عەشیرەتی تاتاری ئۆرەمار، بەڕێوەبەری ڕێکان ڕەوانە کرا و ئەوەی ساغ کردەوە، کە شێخی بارزان لەناو هۆزەکانی تەیارییە، لەم هەلومەرجەدا، دوای ئەو کردەوە ئابڕووبەرانەی، کە کردوویە دوای گفتوگۆکردن لەگەڵ سەرۆکی کریستیانەکانی تەییاری کە لە دەرەوەی ویلایەتی ئێمەن، شیاو نییە کردەی سەربازی بکەین بۆ دەستگیرکردنی ئەو یاغییە ناوبراوانە، کە بە بیانووی داواکردنی بەخشین ئەمان هەڵاتوون بۆ ئەوێ، هەروەك چۆن ئەم هۆزانە لە کریستیانەکانن، بۆیە بچووکترین شت گەورە دەکرێ تا سکاڵا دەگاتە لای کونسڵخانەکان و لە ئەنجامدا ئەمە ناشێ بکرێت. لەسەر ئەوە من ویلایەتی وانم ئاگادار کردۆتەوە هەرچی پێویستە بیکات لەم بارەیەوە بەو پێیەی سەر بەم ویلایەتەیە. هەروەها هێڤی دەکەم کە لە تەرەفی فەخامەتتان فەرمانی پێویست بۆ ویلایەتی ناوبراو دەربکەن بەوەی بە هەر هۆیەك بێ بە زووترین کات دەستگیری بکەن. لەگەڵ شیمانەی دووبارە گەڕانەوەی شێخی ناوبراو بۆ شوێنی خۆی یان دووبارەکردنەوەی برێك کاری فەساد لە لایەنی خۆیەوە لەگەڵ ئەو هۆزانەی هاوپەیمانی لەگەڵ کردوون، بەو شێوەیەی کە من لە پێشتر بەرچاوم خستووە، من لەبەردەم هەموو ئەگەرەکاندام و فەرمانم داوە دوو تۆپهاوێژ و تابوورێك عەسکەر لە بارزان جێگیر بکرێن، بەڕێوەبەرێکی بە توانا لە شێروان دابمەزرێنین لەگەڵ جێگیربوونی مەفرەزەیەك لەوێدا، جێنشینکردنی عەشایرەکان و کۆکردنەوەی ئەو بەروبوومانەی کە ماون، عەشایرە هاوپشتەکان ئەوانەی خزمەتی چاك و ڕاستگۆیی خۆیان نیشانداوە، ڕوخسەتم پێداون. لەماوەی چەند ڕۆژێکدا لەگەڵ ئەو سەربازانەی عوسمانی کە ماون دەگەڕێمەوە بۆ ناوەندی شار بۆ ڕاییکردنی کاروبارەکانی دیکەی ویلایەت. بۆ ئاگاداریتان.

**شەمدینان ٢٤ ی ئەیلوولی ١٣٢٥**[١٢].

**والیی مووسڵ و سەرکردەی ناوچەکە**

**فازیل**

**بەڵگەنامەی هەشتەم:**

**دائیرەی ئەرکانی عمومی حەربییە**

**هۆبەی سێیەم**

پوختـــــە: لـــــەبارەی تـــــەمێکردنی بەرپرســـــیارانی دووبارەبوونـــــەوەی دەستدرێژییەکانی شێخی بـارزان و پێویسـتیی ڕیشەکێشـکردنی داواکـراو سـەعدی ئاغا کە لەکاتی هەڵاتنەکەیدا پاراستوویە.

والیی مووسڵ و سەرکردەی ناوچەی مووسڵ ئاگاداری داوە کە شێخی بـارزان دوای شکستی یەکەمی هەڵاتووە بۆ ناو کریستیانەکانی تحوب و تـەیاری لـە لیـوای هەکاری بە کۆمەگی سـەعدی ئاغـا، کـە لـە دەستڕۆیشـتووەکانی ناحیـەی سـالە و ئاغـای سـال سـەر بـە ویلایـەتی وانـە. پاشـان هێزەکـانی خـۆی کـۆ کردۆتـەوە و ڕووداوی دڵتەزێنی بارزان ڕوویدا. والی لەوە دڵنیایە کـە شـێخی بـارزان لەبـەر ئـەو تەنگەتاوییەی بەرەو ڕووی دەبێتەوە لە لایەن سەعدی ئاغای ناوبراو پارێزگاری لێ دەکرێ، ئەوانەی بوونەتە سۆنگەی ئەم ڕووداوەی دوایی دەبردرێنە بەردەم دیوانی جەنگ و پێویست دەکـات ڕێگەچـارەی پێویسـت بگیرێتەبـەر بـۆ دوورخسـتنەوەی سـەعدی ئاغـای نـاوبراو لـە ناحیـەی سـال، پێشـتریش سـەرکردایەتیی فیرقـەی هەشتمان لە وان ئاگـادار کردۆتـەوە لـەوەی یارمـەتی سـەربازیی ویلایـەت بکـات و لەکاتی هـەڵاتنی نـاوبراو دەسـتگیری بکـات، بـەڵام ئـەم ویلایەتـە بـەدەم ئـەوەوە نەهات کۆمەگی سەربازیی ویلایەت بکات. دواجار لـە برووسـکەیەکدا، کـە فیرقـەی هەشتەم ناردوویـە هـاتووە ویلایـەتی وان داوای تـابوورێکی سـەربازی کـردووە بـۆ تەمێکردنی سەعدی ئاغای سەرۆکی عەشیرەت، لە ناحیەی سـالی سـەر بـە قـەزای جۆلـەمێرگ، بـەهۆی پارێزگـاریکردنی لـە شـێخی بـارزان، موشـیریەتی سـوپای چوارەمی هومایۆنی ئاگەدار کراوەتەوە، کە فیرقـەی نـاوبراو دەسـتبەجێ وەڵامـی داونەتەوە بەوەی تابووری داواکراوی بۆ بەجێگەیاندنی کردەی تەمێکردن ڕەوانـە کردووە. دەستگیرکردنی سەعدی ئاغای ناوبراو، کە ئـەوەی لەسـەر سـاغ بۆتـەوە دوو جـاران داڵـدەی ئەوانـەی داوە، کـە دەسـتدرێژییان کردۆتـە سـەر سـەربازانی

عوسمـانی و پەلکێشـکردنی بـۆ دیـوانی حـەرب و ئاگادارکردنـەوەی ئـەوەی، کـە پێویستە بکرێت لەلایەنی مەدەنی و هەروا پەیوەستە بە ڕای سەدارەتی باڵا. ئێمـە وێنەی هەموو ئەو برووسـکەنامانەمان لـەم بارەیـەوە نـاردووە و فـەرمان فـەرمانی وەلی ئەمرە.

**٨ی زیلحجەی ساڵی ١٣٢٧، ٨ ی کانوونی یەکەمی ١٣٢٥**[١٣].

**نازری حەربییە**

***

**بەڵگەنامەی نۆیەم:**

**بابی عالی**

**نەزارەتی داخیلییە**

**شیفرە قەلەمی – (قەڵەمی نهێنی)**

## برووسکەی هاتوو لە ویلایەتی مووسڵەوە

نەگریسی ناسراو بە فەقێ عەبدولڕەحمان، کە لـە برووسـکەی مێـژووی ٢٤ ی ئەیلوولی ساڵی ١٣٢٥[١٤] ئاماژەمان پێکرد، لە لایەنگرانی شـێخی بارزانـە و هـەموو چەشنە خراپەکارییێك دەکات و نەزانەکان دژی سیسـتمی دەسـتووری دنـە دەدات، نەیتوانیوە لە لای تەیاری بمێنێتەوە لەگەڵ ژمارەیـەك لـە دەسـت و پێوەنـدەکانی هاتۆتەوە چیای شیرین لە پشت بارزان و یاغییەکانی ئەم ناوچەیەی جووڵاندووە و بەریەککەوتنێك لەنێوان ئەوان و مەفرەزە سـەربازییەکان و هێـزی پشـتیوان ڕووی داوە و لە لایەنگیرەکانی فەقێ عەبدولڕەحمان هەر یەکە لە عەلۆی کـوڕی حـەبۆ و فارسی کـوڕی عـەدۆ و یونسـی کـوڕی تـەرکان کـوژراون، خەسـکۆی برازایشـی بـە برینداری دەستگیر کراوە، لەزۆر لـەو بەیەکدادانانـەی کـە لـە مـاوەو کـاتی جیـاواز ڕوویان داوە، سەرانی ئەهلی خراپەکار حاجیك و صـارم و مامـە کـوژراون، شـێخی ناوبراو و محەمەد چیچۆ و ئەحمەد ئاغا و حەشۆ و مەلا حەسەن و فەیزی و خالیـد هەڵاتوون. هەرچی ئەو گرۆ نەزانەیـە کـە مـاوەوە دەگەڕێنـەوە شـوێنی خۆیان،لـە لێپرسینەوە لە وەڵام وەرگـرتنی ئەوانـەی کـە دەسـتگیر کـراون تێگەیشـتین کـەوا

شـێخی نـه‌گریس و فـه‌قێ عه‌بـدولڕه‌حمانی كـوژراو، دانیشـتوانیان هـان داوه بـۆ یاخیبوون و سه‌ركێشی و پێی وتوون له‌م سه‌رده‌مه‌دا حكوومه‌ت نه‌ماوه، ئێمه یه‌ك ده‌گـرین و كێمـان بـوێ بـه حـوكمڕان دایـده‌نێین، وه‌ك ئـه‌وه‌ی لێكۆڵینـه‌وه‌كان پشتڕاستی ده‌كه‌نه‌وه كه بڕێك له‌وانه بـه نـه‌زانی یـان لـه ترسـان تێـوه‌گلاون، تكـا ده‌كـه‌ین ئـه‌و لایه‌نـه‌مان بـۆ ده‌ستنیشـان بكـه‌ن كـه پێویسـته ده‌سـتگیركراوه‌كان له‌گه‌ڵ كاغه‌زی لێپرسینه‌وه‌كانیان بۆ بنێرین. ٣ تشرینی یه‌كه‌می ١٣٢٥[١٥].

**والیی مووسڵ و سه‌ركرده‌ی ناوچه‌كه له شێروانی خواروو**

**فه‌ریق یه‌كه‌م**

**محه‌مه‌د فازیل**

* * *

**به‌ڵگه‌نامه‌ی ده‌یه‌م:**

**نه‌زاره‌تی داخیلییه**

**دائیره‌ی موخابه‌راتی عموومی**

**مێژوو (٩ ی شوباتی ١٣٢٥ ی ڕۆمی)** [١٦]

## برووسكه بۆ ویلایه‌تی مووسڵ

قۆناغی ڕه‌دوونانی یاغییه‌كانی هه‌مه‌وه‌ند و بارزان به چی گه‌یشت و ژمـاره‌ی ئه‌وانه‌ی له‌وان ده‌ستگیر كراون چه‌ندن، ئه‌و مامه‌ڵه‌یه‌ی له‌گه‌ڵیان كراوه چـییه و چ ڕێوشـوێنێكیان له‌به‌رانبـه‌ر گـیراوه بـۆ ده‌سـتگیركردنی ئه‌وانـه‌ی كـه مـاون، تكـا ده‌كه‌ین ئه‌م خاڵانه به نووسـین بـه‌خێرایی ڕوون بكه‌نـه‌وه و ئاگادارمـان بكه‌نـه‌وه، وێڕای ئه‌وه ده‌فته‌ری داواكراو له باره‌ی هه‌مه‌وه‌نده‌وه بنێرن.

* * *

**بەڵگەنامەی یانزەم:**
**ئیدارەی تەلەگرافخانەی دەوڵەتی پایەبەرزی عوسمانی**
**سەرچاوە: بەغدا، ژمارە (١٦٠١٤)**
**مێژوو: ٢٦ ی مایسی ساڵی١٣٢٦**[١٧].
**بەپەلە**

**بۆ نەزارەتی داخیلییەی بەڕێز:**

دوای گەیشتنم بۆ ئێرە بۆ ئەوەی ڕادەیەك بۆ ڕووداوەکانی بارزان دابنرێ لە بەرەکانی مووسڵەوە، قائیمقام صەفوەت بەگ لەشوێنی ناوبراو دانرا، ناوبراو بە فەرمانداری لە لای سوپا لەگەڵم هات. لەو برووسکەنامەیەی کە ناوبراو ناردوویە، باسی ئەوە دەکات کە کردە و ڕەدوونانەکان، کە تا ئێستا کراون وایان کردووە شێخ عەبدولسەلام و ئەحمەد ئاغای شێروان و ئاغاکانی دیکە داوای پاراستن و پەنادان دەکەن و شێخی ناوبراو ئامادەیی خۆی نیشانداوە، کە لەحاڵێکدا ئەگەر بارزان ببێ بە مەرکەزی قەزا، سەرایەك بۆ حکوومەت و مۆڵگەیەك بۆ تیپێکی سەربازی و تەلگرافخانەیەك دروست بکات و بۆ حکوومەتیان جێ بهێڵێ، لە ئەنجامی داواکردنی پاراستن و گوێڕایەڵی بەناو هەمووان‌دا بڵاو دەبێتەوە، هیچی تر پشێوی نانرێتەوە. لەسەر ئەوانەی لە پێشەوەدا وتران و بەو پێیەی درێژبوونەوەی ئەم ڕووداوانە ماوەیەکی دوورودرێژی برد و کردە سەربازییەکان بوون بە سۆنگەی وێرانبوونی هەزار و سێ سەد و بیست و حەوت ماڵ، چل و چوار مزگەوت، کەنیسەیەك، پارەو پوولێکی زۆر تووشی لەناوچوون و ونبوون بوون و خەڵك هەموویان بە بێ نەوا مانەوە و لە بژێویی ڕۆژانەیان بێبەش بوون، هەوڵ دەدرێ لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی قەبارەی زەرەر و زیانەکان ئاگادار بکرێنەوە، تا ئەو کاتە وا پێویست دەکات کۆمەگییەکی بیست لیرەیی بۆ هەموو ماڵێك خەرج بکرێت، بڕێك هەنگاوی سەربازی بگیرێنەبەر بۆ گێڕانەوەی هێمنی و ئاسایش. ڕێك هەنگاوهەڵگرتنە عەسکەرییەکان پەیوەست بەمە وەڵامی بووە بۆ تێگەیشتن لەگەڵ ئێمە، ڕەزامەندی لەسەر ڕاییکردنی ئەو پێویستییەی هەستی پێ دەکەم بەوەی قەزای بەرنیار بگوازرێتەوە بۆ بارزان بەجۆرێك، کە پێشتر بە مەرکەزی قەزای

ئاکرێ لکێنرابوو بۆ ناونووسکردنی دانیشتوان و زامنکردنی هێمنی و ئاسایش، جا لەبەر ئەوەی کە پێشکەشکردنی کۆمەگ و ڕزگارکردنی دانیشتوان لە تەنگەتاوی و وەدیهاتنی ئەمە بەو خێراییەی کە پێویستە ڕادەوەستێتە سەر ئەو دروشمی پاراستنەی کە حکوومەتی عوسمانی بەرزی کردۆتەوە. من هیوادارم بە خێرایی ئەو کارانەی کە پێویستن ئەنجام بدرێن، هەروەها کاری پێویست بکرێت لەوەی پەیوەندی بە قەزا و درێژکردنەوەی هێڵی تەلەگرافییەوە هەیە، بەمە ڕووداوی بارزان کۆتایی هات، تکایە بۆ ئاگاداریتان. ٢٦ ی مایسی ساڵی ١٣٢٦[١٨].

**والیی بەغدا و سەرکردەی سوپای شەشەم**

**فەریقی یەکەم نازم**

* * *

**په‌راوێزه‌كان:**

(١) ٢٤، ٢٥ ی ئۆگستۆسی ١٩٠٩
(٢) ٢٦ ی ئۆگستۆسی ١٩٠٩
(٣) ٢٧ ی ئۆگستۆسی ١٩٠٩
(٤) ٧ ی ئه‌یلوولی ١٩٠٩
(٥) ١ ی ئه‌یلوولی ١٩٠٩
(٦) ٩ ی ئه‌یلوولی ١٩٠٩
(٧) ١٧ ی ئه‌یلوولی ١٩٠٩
(٨) ٢٠ ی ئه‌یلوولی ١٩٠٩
(٩) ٣٠ ی ئه‌یلوولی ١٩٠٩
(١٠) ٢١ ی ئه‌یلوولی ١٩٠٩
(١١) ٣٠ ی ئه‌یلوولی ١٩٠٩
(١٢) ٧ ی تشرینی یه‌كه‌می ١٩٠٩
(١٣) ٢١ ی كانوونی یه‌كه‌م١٩٠٩
(١٤) ٧ ی تشرینی یه‌كه‌می ١٩٠٩
(١٥) ١٦ تشرینی یه‌كه‌می ١٩٠٩
(١٦) ٢٢ ی شوباتی ١٩١٠
(١٧) ٨ ی حوزه‌یرانی ١٩١٠
(١٨) ٨ ی حوزه‌یرانی ١٩١٠

تێبینی:

١– ژماره‌ی به‌ڵگه‌نامه‌كان له‌ دانانی ئێمه‌ن و هیچ په‌یوه‌ندییه‌كیان به‌ به‌ڵگه‌نامه‌ ئه‌سڵییه‌كانه‌وه‌ نییه‌.

٢– هه‌موو مێژووه‌ ڕۆمییه‌كان وه‌ك له‌ به‌ڵگه‌نامه‌كاندا هاتوون وه‌كو خۆیان نووسراونه‌ته‌وه‌ و له‌ په‌راوێزیشدا هه‌موو مێژووه‌كان له‌ لایه‌ن ئێمه‌وه‌ كراون به‌ مێژووی زایینی (وه‌رگێڕ)

DH.M.U.I 1-1/46-2

الباب العالي

دائرة الشئون الداخلية حل البرقية الواردة من ولاية الموصل

قلم المراسلات

جاء في البرقية الواردة من وكيل والي الموصل بتاريخ ١١ و١٢ أغسطس سنة ١٣٢٥ عطفا على ما أبلغ به محليا، أن بغاة بارزان اشتبكوا مع المفرزة التي توجهت إلى عقرة وتمكن المريدون من تجريد مفرزة الطابور الثالث التابع للكتيبة السابعة والأربعين من كل أسلحتها، وأن عدد الجرحى بلغ حتى الآن خمسة عشر أرسلوا إلى مركز القضاء، وأن المدد يتواصل للمريدين ، وأنهم ينوون بعد القضاء على العساكر الهجوم على عقرة، وعليه فإنه نظرا لخطورة الوضع يتعين الإسراع في السوق العسكري من كل جانب ، كما أن ذخائر المدافع التي سبق إرسالها نفدت ، وأنه يتعين إرسال ذخائرها. ونظرا لهذا التطور الخطير صدر الأمر بالتأكيد على تسريع حركة طابوري الجيش الرابع الموجودين في جم جمال والمدفعين الجبليين مع مقدار كاف من الذخائر، وأبلغنا المقام المشار إليه بذلك بأصدارنا أمرنا إلى وكيل قائد الموصل محي الدين باشا بالتوجه إلى هناك بمعاونة العشائر المطيعة للحيلولة دون وقوع المحاذير. وأوامر إلى عشائر عقرة المطيعة وأغوات زيبار ورؤساء باروراي التابعة للعمادية رشيد بك وبراش حسن آغا وأغوات دوستكي وعبد الله باشا الراوندوزي بالتوجه مع مقدار كاف من المسلحين بالبنادق إلى المحل المذكور. أرجو التفضل بالإطلاع. ١٣ أغسطس سنة ١٣٢٥ وكيل والي الموصل

من كركوك الفريق أول فاضل

**بەڵگەنامەی ژمارە (١) عەرەبی**

DH.M.U.I 1-1/46-3

الباب العالي

دائرة الشئون الداخلية      حل البرقية الواردة من ولاية الموصل

قلم المراسلات

يفهم من البرقيات التي وردت بتاريخ أمس من قائمقام وقيادة راوندوز إلى وكالة قيادة الفرقة الثانية عشر في متصرفية كركوك واطلعنا عليها، أن بغاة بارزان يواصلون بغيهم بشدة، وأنهم توسعوا حتى مسافة أربع ساعات من راوندوز ، فبات الحفاظ على القصبة ومخزن الأسلحة والذخائر في خطر. وعلى هذا الوضع فقد تعين حل وحسم هذه المسالة بسرعة وبشدة. فقررت التوجه بنفسي صوب عقرة مصطحبا الطابورين التابعين للجيش الرابع اللذين سبق وأن صدر الأمر إليهما بالتحرك، مع أربع مدافع جبلية، وكتبنا إلى كل من عبد الله باشا الراوندوزي وكاكلو رئيس كردي وقرني آغا المشمشلي الموجود بقضاء شنو وسليمان خان رئيس زرزه والشيخ طه أفندي ابن المرحوم الشيخ محمد صديق بالتحرك مع فرسان ومشاة عشائرهم والاجتماع في راوندوز والتجرك من هناك مع قوة كافية بقيادة قائد راوندوز القائمقام جميل بك لضرب البغاة المذكورين من الخلف. كما بلغنا قيادة قوة المطاردة بسوق الطابور الثالث التابع للكتيبة السادسة الموجودة في بازيان. ولكن طوابير المشاة المطلقة بمطاردة الهموند ناقصة العدد كثيرا ومن الصعب القيام بعمل معها ، وفي واقع الأمر في الطابور الموجود في خانقين هو من مرتبات تلك القوة، فطلبنا فعرضنا على قيادة الجيش الهمايوني بالتفصيل سوق الطابور النظامي الموجود في خانقين إلى بازيان بدلا من الطابور الثالث المذكور، وإرسال الطابور الآخر التابع لبغداد الموجود في خانقين. أرجو التفضل بالإطلاع. ١٤ أغسطس سنة ١٣٢٥ وكيل والي الموصل

الفريق أول محمد فاضل

**بەڵگەنامەی ژمارە (٢) عەرەبی**

DH.M.U.I 1-2/76-4

برقية واردة من ولاية وان

ج ٢٥ أغسطس ١٣٢٥. تلقيت برقية نظارتكم المؤرخة في ١٩ أغسطس ١٣٢٥ في هذا اليوم لدى عودتي من باش قلعة. وعلى الفور استفسرت قائمقاميات جوله مرك وشمدينان وكوار، وسأقدم المعلومات لدى ورود الجواب منها. ومن يمكنه الالتحاق بشيخ بارزان من عشائر الولاية هي عشيرة بنيانش ونسطوريو تخوب وباز التابعة لناحية جال قضاء جوله مرك، وعشائر اورامار ودوستكي التابعة لكوار، بالإضافة إلى عشائر كردي التابعة لشمدينان. وبين العشائر الثلاثة في جوله مرك المار ذكرها وبين رشيد بك رئيس باروراي التابعة للموصل عداوة قديمة وبقيت معلقة بين ولايتي وان الموصل ولم تحل. والنسطوريون والبنيانش يعتمدون في تأمين أقواتهم للعمادية ، وقد قطع رشيد بك طريقهم منذ عامين بسبب هذه العداوة، وقد يشكل هذا الوضع سببا في اضطرارهم إلى الالتحاق بشيخ بارزان لعلهم يجدون طريقا إلى براوشته . أما سبب التحاق الأوراماريين فهو الحكم غيابيا بالإعدام على رئيسهم ستون وعداوتهم القديمة لمجموعة المرحوم الشيخ محمد صديق أفندي ابن الشيخ عبيد الله. أما الكرديون فهو مريدو شيخ بارزان من القديم وتشير التحقيقات إلى أن مجموع عدد مسلحي هذه القبائل يبلغ حوالي ستة آلاف. ولضمان عدم التحاق النسطوريين يجب استكمال الأسباب التي من شانها تحقيق المصالحة بينهم وبين البرواريين مهما كانت وبأسرع ما يمكن. بالإضافة إلى أن جعل هؤلاء جميعا تحت الطاعة يتوقف على إرسال مقدار كاف من القوة العسكرية والمدافع إلى ناحية كردي، وإرسال مفرزتين بصورة مستقلة إلى اورامار. ومن المأمول بهذه الحالة الحيلولة دون التحاقهم بعقرة من جهة وتحصيل الأموال الأميرية الذي بقي منذ بعض الوقت حبرا على ورق من جهة أخرى. ولما كان الموسم مناسبا للقيام بالعملية العسكرية فإن إعطاء الأمر ببدء العملية منوط برأي النظارة العالية. ٢٧ أغسطس سنة ١٣٢٥ الوالي

بكر سامي

**بەڵگەنامەی ژمارە (٣) عەرەبی**

ابله طوب اغاسنه و اورامارهده آبروجه ایکی بلوك ارسالنه متوقف اولوب بوسایه‌ده
هم عقره یه التحاقلرنیله منعی و همده اوشه دنبرو یازی اوزری قالان اموال امیریه‌نك
تحصیلی ممکن اوله بیله جکی مأمول قویدیر هرحالده عسکریه موکم تمامیله مساعد اولدیغنه
برآن اول امرینه اعطاسی منوط رأی عالی نظارتپناهیلریدر

والی
بکرسامی

۲۷ اغستوس ۳۲۶
۲۹ و...ردی

DH.M.U.I 1-2/82-3

برقية واردة من والي الموصل وقيادة منطقتها عاجل جدا

سبق وأن بينت في البرقية السابقة أننا دخلنا قرية بارزان. وبعد التأكد من التحقيقات أن بغاة بارزان فروا مع شيخهم إلى حلفائهم بقرية بيه التابعة لناحية شيروانه في راوندوز. تقرر ترك الطابور الثالث الاحتياطي التابع للموصل مع مدفعين جبليين سبق جلبهما من الجيش الهمايوني السادس بالموصل بقيادة البكباشي أمين أفندي في قرية بارزان لحمايتها، والفرسان والمشاة التي سبق وأن قدمت من كتيبة فرسان الموصل إلى عقرة في مركز ناحية زيبار، وخمسين عنصرا سبق وأن قدموا من راوندوز في قرية بركي الكائنة على الزاب لحماية محل العبور، ثم توجهت ثلاثة طوابير تابعة للجيش الرابع مع أربع مدافع متوكلين على الله صوب قرية بيه . وتقع القرية المذكورة فوق جبل مرتفع ، واتخذت القوة مواقعها على جبل مقابل، وأطلقت ست طلقات مدفعية، ولكن دون جدوى وكان السبب الهوة الواقعة بين الجبلين بعمق ألفي متر ومسافة ما يزيد على ساعتين ، فأمضينا تلك الليلة بقرية ريله ي المجاورة وفي صباح اليوم التالي توجهنا نحو قرية كاني لنج للالتفاف لعدم وجود طريق نعبر منه إلى قرية بيه المذكورة، والتقينا مع قوات عبد الله باشا الراوندوزي .علمنا أن الباشا المذكور قاتل غاصبي شيروانه في ثلاثة مواقع وتغلب عليهم ، واتحدت القوتان ، وفي اليوم التالي كنا سنتوجه نحو جبال مزوري حيث احتمى بها الشيخ المذكور، فعلمنا أن جميع القرى الواقعة على الطريق بين بارزان وبين المكان المقصود أخليت ولجأ سكانها إلى الجبال بعد أن أحرقوا قراهم. وحاصل القول أن أهالي كافة النواحي والقرى الذين تبعوا الشيخ المذكور باتوا في أسوأ حال، فاختفوا في ذرى ومجاهل سلاسل الجبال، مما جعلنا نضطر للالتفاف من الأماكن الوعرة لتحقيق النتيجة الحاسمة. رجاء التفضل بالإطلاع. ٤ أيلول سنة ١٣٢٥

والي الموصل وقائد منطقتها بقرية كانى لنج

فريق أول فاضل

يعرض التقرير للصدارة وتزويد الصحافة ما يناسب منه

٧ أيلول سنة ١٣٢٥

**بەڵگەنامەی ژمارە (٤) عەرەبی**

DH.M.U.I 1-4/59-4

الباب العالي

نظارة الداخلية     حل البرقية الواردة من والي الموصل وقائد منطقتها

قلم البرقيات     الموجود في راوندوز

بعون الباري وروحانية النبي وصولة العساكر والقوات الداعمة تم تشتيت جمع شيخ بارزان الخبيث الذي طغى في نشر الفساد، ولم تعد هناك إمكانية للتجمع والتحالف مع العشائر الأخرى. هؤلاء البغاة الذين قاتلوا ومنوا بهزيمة منكرة لاذوا بالفرار نحو الجبال الوعرة واختفوا بين الغابات الكثيفة فيها. وقد بلغ عدد المقبوض عليهم من البغاة حتى الآن حوالي أربعين حيث اقتيدوا إلى المركز ، ومع العديد من المطاردات والملاحقات يتم القبض كل يوم على ما بين خمسة وستة من البغاة. أما الشيخ الذي استغل تضاريس الأراضي وفر مع اثنين من مريديه فقد تعذر تحديد مكانه وملجئه . ومن المأمول القبض عليه قريبا نتيجة للملاحقة الشديدة، لذلك وعلى نحو ما سبق عرضه، فإن رأيي بأن إقامة طابور من العساكر بقرية بارزان ، وإعادة تشكيل قائمقامية زيبار التي تبعد عن القرية المذكورة مسافة ساعة وكانت مركز القضاء قبل عدة سنوات فألغي وبات الأمن على النحو الذي نشهده، ونقل مركز القضاء إلى بارزان وإلى أن يتم التحويل يقيم فيها وكيل للقائمقام ، وإلحاق ناحية شيروان التابعة لراوندوز بالقضاء المذكور على نحو ما كانت عليه سابقا وإقامة مفرزة نظامية من الطابور الموجود في راوندوز وبذلك يمكن الحيلولة دون كافة الاحتمالات ودون وضع سوء النوايا والأفكار اللعينة موضع التنفيذ. أرجو التفضل بالإطلاع. ١٧ أيلول سنة ١٣٢٥     فاضل

**بەڵگەنامەی ژمارە (٥) عەرەبی**

DH.M.U.I 1-2/82-2

نظارة الداخلية

دائرة المخابرات العمومية إلى المقام العالي للصدارة

قدمنا لفا لمنظور الصدارة السامية البرقية الواردة من والي الموصل فاضل باشا عن الالتقاء بالقوة التي يقودها عبد الله باشا الراوندوزي وتشارك في العمليات العسكرية لتأديب ومطاردة بغاة بارزان وشيخهم المتحالف معهم وتقدم الدعم اللازم، وأن القوتين ستواصلان المطاردات معا وأن سكان قرى بارزان الكائنة على الطريق أخلوا قراهم وأحرقوها وفروا نحو ذرى الجبال وتواروا على الأنظار، والأمر لحضرة ولي الأمر.

٨ ايلول : ١٣٢٥

بەڵگەنامەی ژمارە (٦) عەرەبی

DH.M.U.I 1-3/60-3

الباب العالي

نظارة الداخلية        حل البرقية الواردة من والي الموصل وقائد منطقتها

قلم البرقيات

ذيل تقريرنا البرقي بتاريخ ١٧ أيلول سنة ١٣٢٥. سبق وأن أبلغنا بفرار شيخ بارزان بحالة مزرية، وأن المفارز والجواسيس يطاردونه ويبحثون عنه محليا، وتقول الأخبار الصحيحة أن المذكور تنكر، كما حلق لحيته وهو موجود الآن مع أربعة من رجاله بقرية زاويته التابعة لعشيرة تحوب وهي من عشائر طياري النصرانية بداخل ولاية وان، وأن شريكه في الجريمة وخليفته فقي عبد الرحمن مع أولاده وكذلك قادر وخالد وهما من رؤساء البغي موجودون بقرية تحويه ناوي التابعة للعشيرة المذكورة ، وعلى اثر ذلك تم إرسال ملازم الجندرمة بمرافقة رئيس عشيرة تاتار اورامار مدير ريكان فتحقق من وجوده بين عشائر طياري، فهو في هذه الحالة، فإنه بعد الأفعال الدنيئة التي قام بها بعد التخابر مع الرؤساء داخل نصارى الطياري الذين هم خارج ولايتنا، لن يكون من المناسب القيام بالعمليات العسكرية للقبض على الباغين المذكورين الذين فروا إلى هناك بحجة طلب العفو والأمان، كما أن كون هذه العشائر من النصارى فإن أصغر شيء يتضخم حتى يصل إلى الشكوى لدى القنصليات وبالتالي فلا يجوز ذلك، وعليه فإنني أبلغت ولاية وان بكل ما يلزم عمله لهذه الأماكن باعتبارها تتبع تلك الولاية. كما اتمنى من طرف فخامتكم توجيه الأوامر اللازمة للولاية المشار إليها للبحث عن وسيلة للقبض عليهم بأسرع ما يمكن. ومع وجود إمكانية لعودة الشيخ المذكور على مكانه مرة أخرى أو تكرر بعض أعمال الفساد من طرفه مع من تحالف معهم من العشائر، فعلى نحو ما عرضته سابقا أنني أمام كافة الاحتمالات فقد أمرت بتمركز مدفعين وطابور في بارزان، وتعيين مدير مقتدر في شيروان مع تمركز مفرزة فيها، وإسكان العشائر والقيام بجمع ما بقي من التحصيلات، وأعطيت الإذن للعشائر الداعمة التي أثبتت حسن خدمتها وصدقها، وسأعود إلى مركز الولاية مع من بقي من العساكر العثمانية خلال أيام لتسيير أمور الولاية الأخرى. وتفضلوا بتلإطلاع. ٢٤ أيلول سنة ١٣٢٥ والي الموصل وقائد منطقتها

فاضل

**بەڵگەنامەی ژمارە (٧) عەرەبی**

DH.M.U.I 1-9/15-15

دائرة الأركان الحربية العمومية

الشعبة الثالثة

خلاصة: حول تأديب المسئولين عن تكرار اعتداءات شيخ بارزان، وضرورة استئصال المدعو سعدي آغا الذي حماه أثناء فراره.

أبلغ والي الموصل وقيادة منطقة الموصل أن شيخ بارزان بعد هزيمته الأولى فر إلى نصارى نخوب وطياري بلواء حكاري بمساعدة سعدي آغا وهو من متنفذي ناحية سال وآغا سال التابعة لولاية وان. ثم إنه جمع قواته وأوقع حادثة بارزان المؤسفة، وأنه تأكد بأنه سيلقى الحماية من سعدي آغا المذكور نظرا للتضييق الذي سيلقاه، وأن الذين تسببوا في الحادثة الأخيرة قدموا إلى ديوان الحرب، وأنه يتعين اتخاذ الوسائل اللازمة لإبعاد سعدي آغا المذكور من ناحية سال، وسبق أن أبلغنا قيادة الفرقة الثامنة في وان بضرورة تقديم المساعدة العسكرية لولاية وان للقبض على المذكور أثناء فراره، لكن تلك الولاية لم تطلب ما يوجب الدعم العسكري لها، وأخيرا جاء في برقية أرسلتها الفرقة الثامنة بأن ولاية وان طلبت طابورا لتأديب سعدي آغا رئيس العشيرة المقيم بناحية جال التابعة لقضاء جوله مرك نظرا لحماية شيخ بارزان، فأبلغت مشيرية الجيش الهمايوني الرابع بأن الفرقة المذكورة ردت فورا بسوق الطابور المطلوب للقيام بعملية التأديب. إن القيام بالقبض على سعدي آغا المذكور الذي ثبت إيواؤه لمن اعتدى على العساكر العثمانية مرتين وتقديمه إلى ديوان الحرب وتبليغ من يلزم لإجراء المقتضى في الجهة المدنية كذلك منوط برأي الصدارة السامية. وقد أرسلنا صور كافة البرقيات في هذا الشأن والأمر لحضرة ولي الأمر.

٨ ذي الحجة سنة ٣٢٧ و٨ كانون الأول سنة ٣٢٥ ناظر الحربية

**بەڵگەنامەی ژمارە (٨) عەرەبی**

DH.1-7/7-22

الباب العالي

نظارة الداخلية البرقية الواردة من ولاية الموصل

قلم المراسلات

الخبيث المدعو فقي عبد الرحمن الذي ذكرنا في البرقية المؤرخة ٢٤ أيلول سنة ١٣٢٥ أنه من مناصري شيخ بارزان ويقوم بكل أنواع المفاسد ويحرض الجهلة ضد النظام الدستوري، لم يتمكن من الاستمرار في البقاء بجهات طياري فعاد مع عدد من أعوانه إلى جبل شيرين خلف بارزان، وحرك بغاة تلك المنطقة فوقع صدام بينهم وبين المفارز العسكرية والداعمة فقتل من أعوان فقي عبد الرحمن كل من علو بن حبو وفارس بن عدو ويونس بن تركان ، وقبض على ابن أخيه خسكو جريحا، وفي العديد من الاشتباكات التي وقعت في فترات متفاوتة قتل من رؤساء أهل الفساد حاجيك وسارم ومامه ، وبقي الشيخ المذكور ومحمد جيجو وأحمد آغا وحشو وملا حسن وفيضي وخالد في حالة فرار ، أما ما بقي من مجموعة الجهلة فإنهم يعودون إلى أماكنهم، وقد فهم من استجواب الذين قبض عليهم من رؤسائهم أن الشيخ الخبيث والمقتول فقي عبد الرحمن حرضا الأهالي على التمرد والعصيان قائلين لهم" لم تبق في هذا الزمان حكومة، نتحد وننصب من نشاء، وقد أفادوا كما أثبتت التحقيقات أن البعض من هؤلاء انساقوا بجهلهم أو خوفهم، نأمل بيان الجهة التي يتعين إرسال الموقوفين مع أوراق استجوابهم إليها. ٣ تشرين الأول ١٣٢٥

والي الموصل وقائد منطقتها بشيروان السفلى

الفريق أول محمد فاضل

**بەڵگەنامەی ژمارە (٩) عەرەبی**



عبدالرحمن بو زمان حکومت قاطعانه‌ده بر [illegible] ایسته‌یکمزی نصب ایدرز وعده [illegible]
[illegible] علیهن اهالی عصیانه تشویقه ابتداکلری و بونلرك بعضلری قوه قوشیح
و بعضلری جبالنده اغفال ایدلسه اولده قدرین عمومیته اغاه ایتمه و آبر وجه
تخفیفا [illegible] ثابت اولمسه اولده تفریح طوتیلاوده اوده [illegible] نطقه‌لریله‌بار موفوقیته حقلرنی
اوله‌جق معامله جهته عدلیه وباخود [illegible] جزی تودیع اولنمه لازم کلدیکی
معروضدر و [illegible] اول [illegible]

۷ [illegible]

[illegible] موصل والیسی [illegible]
قوماندانی [illegible] محمد فاضل

**بەڵگەنامەی ژمارە ( ٩ ) توركی عوسمانی**

DH.M.U.I 1-8/13-1

نظارة الداخلية

دائرة المخابرات العمومية

التاريخ ٩ شباط سنة ١٣٢٥ برقية إلى ولاية الموصل

ما هي المرحلة التي وصلت إليها مطاردة بغاة الهموند وبارزان وكم عدد الذين قبض عليهم من هؤلاء ، والمعاملة التي أجريت بحقهم، وما هي الإجراءات المتخذة للقبض على الباقين، نرجو توضيح هذه النقاط كتابيا على وجه السرعة وإبلاغنا بها، بالإضافة إلى إرسال الدفتر المطلوب عن الهموند».

**بەڵگەنامەی ژمارە (١٠) عەرەبی**

DH.MUI 1-11/15-14

إدارة برق الدولة العلية العثمانية

المصدر : بغداد رقم ١٦٠١٤ عاجل

التاريخ ٢٦ مايس سنة ١٣٢٦ إلى نظارة الداخلية الجليلة

عقب وصولي إلى هنا لوضع حد لأحداث بارزان في جهات الموصل ، عينت القائمقام صفوت بك على المحل المذكور وهو الذي جاء معي مأمورا لدى الجيش، وأرسلته إلى هناك، وقد جاء في البرقية التي أرسلها الموما إليه بأن المعمليات والمطاردات التي قام بها حتى الآن أدت إلى طلب شيخهم عبد السلام وأحمد آغا شيروان وغيره من الأغوات الأمان، وأن الشيخ المذكور أعرب عن استعداده في حال اتخاذ بارزان مركزا للقضاء لبناء قصر للحكومة وثكنة تكفي لإقامة قطعة عسكرية ودارا للبرق ، وتركها للحكومة ، وأنه نتيجة لطلبهم الأمان عم السكون والطاعة الجميع ، ولم يعد هناك ما يخل بالأمن.

وبناء على ما تقدم وباعتبار امتداد تلك الأحداث فترة طويلة فقد أدت العمليات العسكرية إلى خراب ألف وثلاثمائة وسبعة وعشرين منزلا وأربعة وأربعين مسجدا وكنيسة وتعرض الكثير من النقود والأموال للتلف والضياع ، فبات الناس جميعا دون مساكن ومحرومين من القوت اليومي ، وأنه سيصار إلى الإبلاغ عن نتيجة التحقيق بحجم الخسائر، وإلى ذلك الحين فإن الحاجة تدعو إلى تقديم إعانة عشرين ليرة لكل بيت، واتخاذ بعض التدابير العسكرية لاستمرار الأمن والاستقرار، وقد أجيبَ بتحديد التدابير الانضباطية المتعلقة بذلك بالتفاهم معنا، والموافقة على إجراء مقتضى ما أشعر به بنقل قضاء برنيار إلى بارزان حيث ألحقت في وقت سابق بمركز القضاء عقرة، لتسجيل النفوس ولضمان الأمن والاستقرار، ولما كان تقديم المعونات وتخليص الأهالي من الضائقة وتحقيق ذلك بالسرعة المطلوبة يتوقف على شعار الحمية لدى الحكومة العثمانية فإني آمل سرعة إجراء اللازم ، وكذلك إجراء المقتضى فيما يتعلق بالقضاء وتمديد الخط البرقي ، وبذلك انتهت حادثة بارزان رجاء التفضل بالإطلاع. ٢٦ مايس سنة ١٣٢٦

والي بغداد وقائد الجيش السادس

فريق أول ناظم

**بەڵگەنامەی ژمارە (١١) عەرەبی**

## ملخص البحث

### انتفاضة الشيخ عبدالسلام البارزانى في الوثائق العثمانية

اقتنت لجنة الوثائق والمخطوطات في الأكاديمية الكوردية الوثائق المنشورة هنا من الأرشيف العثماني في حزيران ٢٠١١، مترجمة من التركية العثمانية الى اللغة العربية. ننشر في هذا العدد من مجلة الأكاديمية الكوردية احدى عشرة وثيقة عثمانية غير منشورة عن انتفاضة الشيخ عبدالسلام البارزاني مترجمة من العربية الى الكوردية. تلقي هذه الوثائق الأضواء على أحداث انتفاضة الشيخ عبدالسلام البارزاني والوسائل التي اعتمدتها الدولة العثمانية في القضاء عليها. تسع من هذه الوثائق مرسلة من قبل والي الموصل وواحدة من قبل والي بغداد وأخرى من قبل والي وان. تخص الوثائق التدابير التي أتخذتها الدولة العثمانية لمواجهة حركة عبدالسلام البارزاني عسكريا، كما تتضمن أخبارا عن هزيمة القوات العسكرية العثمانية أمام المنتفضين الكورد وبخاصة الطابور الثالث والدعوات الملحة لأرسال تعزيزات عسكرية اضافية لمواجهة رجال الشيخ عبدالسلام. كما تتضمن الوثائق معلومات عن محاولات الدولة العثمانية لجر العشائر الكوردية الى جانبها في هذا الصراع وزجها في محاربة قوات شيخ بارزان وقمع انتفاضته.

تشير الوثائق في جانب منها الى أحداث من قبيل احتلال قرية بارزان من قبل القوات العثمانية وهروب الشيخ عبدالسلام الى مناطق المسيحيين والأختفاء بينهم واستماتة السلطات العثمانية لألقاء القبض عليه. كما تخبرنا الوثائق بأن سكان بارزان لجأوا الى حرق قراهم بعد أن أجبروا على تركها أمام زحف القوات العثمانية. ومن خلال رسالة والي وان نعرف بأنه بذل جهودا كبيرة لمنع العشائر الكوردية الأخرى الألتحاق بحركة شيخ بارزان، أما والي بغداد فقد أكد في رسالته على ضرورة تهدئة الأوضاع في المنطقة وترسيخ سلطات الدولة فيها.

# Abstract

The Documents & Manuscripts Committee in the Kurdish Academy has obtained the documents published herein from the Ottoman Archive in 2011 being translated from Ottoman Turkish into Kurdish. In the present issue of the Academy journal we publish eleven unpublished Ottoman documents translated into Kurdish on Sheikh Abdulsalam Barzani uprising. Such documents shed light on the events taking place during the uprising and the means the Ottoman State employed to end it. Nine of these documents were sent by Mosul Wali, one by Baghdad Wali and another by Wan wali. They state the measures taken by the Ottoman state to deal militarily with Abdulsalam Barzani's movement; it also contains information on the defeat suffered by the Ottoman armed forces when confronting the Kurdish revolutionaries, particularly the Third Column, and the persistent calls to receive additional military reinforcements to encounter Sheikh Abdulsalam's men. It also contains information on some attempts made by the Ottoman state to drag the Kurdish tribes to its own side and involve them in the fight to repress Barzan's revolt.

Moreover, the documents make reference to events such as the occupation of BArzan village by the Ottoman forces and how Sheikh Abdulsalam flees to the Christian-inhabited areas to hide himself. They also revealthe fact that Barzan people were forced to burn down their villages having deserted them for fear of the Ottoman forces advancement. Again through the letter sent by Wan Wali, we come to know how much effort he had made to prevent other tribes from joining Barzan movement. The Wali of Baghdad, however, sressed in his letter on the necessity of appeasing the situation in the area and consolidating the state authorities there.

# ناودارانی ناکورد لە کتێبی
# (ناودارانی کورد لە لوغەتنامەی دهخودادا)

د. زرار سدیق تۆفیق

لوغەتنامـەی دهخـودا فەرهـەنگێکی مێـژوویی و ئـەدەبی و ڕۆشـنبیریی پـڕ زانیارییە و لـە ئاسـتی ئێـران و کوردسـتانی خۆمانـدا ناسـراوە، تیایـدا ژیاننامـەی هەزاران کەسایەتیی ناوداری جیهانی ئیسلامی ناسێنراوە، هەروەها چەندین بابەتی مێژوویی لەم فەرهەنگەدا جێگەی کراوەتەوە و لـە لایـەن زانـا و لێکۆڵـەری ئێرانـی نـاودار عـەلی ئەکبـەر دهخـودا (١٢٥٦-١٣٣٤هـ.ش/ ١٨٧٨-١٩٥٦ز) نووسـراوە و دوای مردنی لە ماوەی ساڵانی (١٣٢٥-١٣٥٨هـ.ش) چاپ و بڵاوکرایـەوە. (بڕوانـە: محمد شریفی، فرهنگ ئەدەبیات فارسی، (تەهران ١٣٩١هـ.ش)، (ص٦٥٧-٦٥٨).

ئـەکادیمیای کـوردی کـارێکی زۆر بـاش و شایسـتەی کـرد کاتێـك رابـوو بـە وەرگێڕانـی ژیاننامـەی کەسـایەتی کوردییـەکانی نـاو فەرهـەنگی دهخـودا و لـە کتێبێکدا لە ساڵی ٢٠١٢ لە ٤٨٦ لاپەڕەدا بڵاوکردەوە.

وەك لە تێبینی لیژنەی چاپکردن لە ئەکادیمیای کوردیدا هاتووە کاتی خـۆی مامۆسـتا عبدولحەمیـد حـیرەت سـوجادی فەرهـەنگی دهخـودای خوێندۆتـەوە و کەسایەتی کوردییەکانی دەستنیشان کردووە، ئینجا ئـەکادیمیای کـوردی وەك لـە پێشـەکییەکەیدا هـاتووە مامۆسـتا فـەتاح کاویـانی راسـپاردووە ژیاننامـەی ئـەو کەسایەتییانە وەربگێڕێتە سەر زمانی کوردی، دواتـر لەگـەڵ فەرهـەنگی دهخـودادا بەراورد کراوە و لاپەڕەکان و پیتەکان دەستنیشان کراوە بۆ ئەوەی ئاسانکاری بۆ خوێنەر بکرێت تا بتوانێت بچێتەوە سەر دەقە فارسییەکە.

لـە راسـتیدا ئـەم کـارە کـارێکی زۆر باشـە و شـایەنی دەستخۆشـییە، بـەڵام خوێنەر هەر لەگەڵ کردنەوەی کتێبەکـەدا تووشـی سەرسـامی دەبێـت و دەبینێـت کتێبی ناودارانی کورد پـڕە لـە هەڵـەی هەمـەجۆر، ئێمـە لێـرە پوختـەی سـەرنج و تێبینییەکانمان دەخەینە روو و هەوڵمانداوە لە سەنگی گوتارێك بێت و ناچینە نـاو

ئەو هەڵانەی کە لەوانەیە لە دانە ڕەسەنەکەی دهخودا هەبێت، چونکە خوێندنەوە و بەراوردکردنی ئەو هەموو بابەتە زۆرە کارێکی گەورەیە و ماوەیەکی زۆر دەخایەنێت و ئێمە تەنها تێبینییەکانمان لە سەر وەرگێڕاوە کوردییەکە دەخەینە ڕوو.

١- پێویست بوو لە پێشەکییەکی کورتدا عەلی ئەکبەری دهخودا بناسێندرێت و تیشك بخرێتە سەر ئەم کتێبە و ساڵی لە چاپدانی ..هتد.

٢- لەو دانەیەی کەوا ئەکادیمیای کوردی بە سوپاسەوە پێشکەشیان کردم، لاپەڕەکانی (٢٧٣-٢٨٨) نەماوە و لە جێگەیان لاپەڕەکانی (٢٥٨-٢٧٢) دووبارە چاپکراونەتەوە، من نازانم تەنها ئەوەی لە لای منە بەو شێوەیە یان لە هەموو دانە چاپکراوەکان ئەم هەڵە هونەرییە بوونی هەیە.

٣- بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە روون دەبێتەوە کە پڕاو پڕە لە ژیاننامەی ناودارانی ناکورد لە عەرەب و فارس و تورك، تەنانەت ئەرمەن و سریانی و ڕۆم، بەر لە هەموو شتێك من گومانم هەیە مامۆستا عەبدولحەمید سوجادی مەبەستی لە نیشانکردنەکان ئەوە بووبێت کە ئەوانە کوردن، ئەگەرنا ئەو کەسەی ئەمانەی بە کورد داناوە لەگەڵ ڕێزمدا دەردەکەوێت زانیارییەکی ئەوتۆی لە سەر مێژوو و ئەدەبیاتی کوردی نییە، دوای ئەوە مامۆستای وەرگێڕ کاتێك بەم کارە رابوو هەستی نەکردووە زۆربەی زۆری ئەم کەسایەتییانە نە کوردن و نە کوردستانین و نە هیچ پەیوەندییەکیان بە کوردەوە هەیە، یان پاشتر شارەزای راسپێردراو هەستی بەم راستییە نەکرد؟، لەمەش سەیرتر ئایا لێژنەی چاپکردن لە کاتی چاوخشاندنەوە بەم کتێبەدا هیچکام لەو هەڵانەیان بەرچاو نەکەوت؟ کە هەڵەکان لە دێڕی یەکەم و دووەمەوە دەست پێدەکات، و دەپرسین ئایا ئەم کتێبە نەنێردرا بۆ شارەزایەك یان پسپۆڕێك؟ یان هەڵسەنگێنەرێك؟ دەنا چۆن ئەم هەڵە و ناتەواوییەی تێ دەکەوت؟.

٤- لە راستیدا هەڵەکان زۆرن و هەمەچەشنن، زەقترینیان دانانی کەسان و بنەماڵەی ناکورد نازانستییانە بە کورد هەژمار کراون، بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە کە لەو دانەیەی لای مندا ٨٧٧ کەسایەتی تێدا ناسێنراوە دەکرێت بڵێین ژمارەیەکی کەمیان کوردن و ژمارەیەکی دی لەوانەیە کورد نەبن، بەڵام خەڵکی

شارەکانی کوردستانن یان بە ناوی ئەو شارانەوە ناسراون. سەدان کەسایەتیی خەڵکی شارەکانی ئەسفەهان و قەزوین و ئەردەبیل و شیراز و حەڵەب و مووسڵ و سیواس و مەراغە و تکریت و حەڕان و شارە ناکوردییەکانی دەوڵەتی عوسمانی باس کراون، وەك زانراوە ئەم شارانە بە شاری کوردنشین دانانرێن و هەندێکیان بە سەدان کیلۆمەتر لە کوردستانەوە دوورن، کەچی ئەم کەسایەتییانە بە کورد دانراون، بۆ نموونە ژیاننامەی دەیان زانای ئەسفرایانی تۆمارکراوە بە کورد لە قەڵەم دراون (بڕوانە: ل ٢٥، ٣١–٣٣، ٥٥، ١٣٣، ١٣٨–١٣٩)، کەچی ئەسفرایین شارێکە لە ولاّتی نیشاپۆر لە ڕۆژهەلاّتی ئێران و بە سەدان کیلۆمەتر دوورە لە کوردستانەوە (یاقوت الحموي، معجم البلدان ١٤٢/١).

– شەش ناوداری تکریتی کە هیچیان کورد نین و بە کورد دانراون (ل ١٧١–١٧٢).

– مۆزیکزان (اسحاق الموصلي) بە کورد دانراوە و زیاتر لە ٢٤ لاپەڕەی بۆ تەرخان کراوە (١٠٨–١٣٣).

– ئەحمەدی کوڕی جەعفەر ناسراو بە (جعفر البرمكي) لە بنەماڵەی بەرامیکەی فارس بە کورد دانراوە و شازدە لاپەڕەی بۆ تەرخان کراوە (ل٧٠–٨٦).

– چەندین میری میرنشینی سامانی لە خۆراسان کە فارسن و هیچ گومانێك لە فارسی بوونیان نییە کراون بە کورد (١٥٢–١٥٣، ٢٢٩–٢٣١).

– لەمەش سەیرتر هەندێ کەسایەتی هەن بە ناو و ژیاننامەکانیان دیارە کە کورد نین، بەڵکو مەسیحی و ئەرمەن و سریانن، وەك ڕەحمانی بەتریکی ئەنتاکیا کە مێژووی ئەرمەنی بە سریانی نووسیوە، یان یوسف داود بەهنام ناسراو بە اقلیمس السریانی، ابو الدر یاقوت الرومي (ل٢٠)، یان زاهد العلماء– نەسرانی نەستوری (ل٢٢٦). یان کەسەکە بە ئاشکرا دیارە کە عەرەبە وەك (سلطان الجبوري ل٢٣٢) یان چەرکسە وەك حافظ پاشای چەرکسی (ل١٨٩)...هتد.

– چواردە کەسایەتی خەڵکی شاری حەڕان ناسێنراون (ل١٩٦–١٩٩) کەچی ئەو کەسایەتییانە هیچیان کورد نین و ئەو دەمانە حەڕان کوردی لێ نەبوو.

– سێ خەسرەو پاشا ناوی عوسمانی بە کورد دانراون (ل٢١١–٢١٢).

– ئەندامانی بنەماڵەی (ابن الاثیر، ضیاءالدین، مجدالدین، عزالـدین) کـە هـیچ گومانێك نییە عەرەبی هۆزی شەیبانن کراون بە کورد (ل٨–٩، ٤٠٧).

– هەموو میرانی دەوڵەتی (الاراطقه) و میرانی بنەماڵەی عمادالدین زەنگی کە هەردوو بنەماڵەکە تورکن و کوردستانیان داگیر کردووە بە کورد دانراون (ل٤٣٧) و چەند لاپەڕەیەکی دی.

– چەندین کەسایەتیی بەناوبانگی جیهانی ئیسلامی ناسراو کە نەك هەر کورد نـین، بـەڵکو عـەرەب و فارسـن و پەیوەندییـەکی ئـەوتۆیان بـە کـوردەوە نییـە، و نازانرێت بە چ پاساو و بەڵگە و نیشانەیەك بە کورد هەژمار کراون، بۆ نموونە:

– الامام الرفاعي ل٢٤٢.

– شاعیری ناوداری عەرەب ابوفراس الحمداني ل٤٨–٥٠.

– مێژوونووسی حەڵەبی ابن العدیم ل٩٧.

– القاضي البیضاوي ل ٤٣٤.

– مێژوونووسی ناودار الواقدي ل٤٦٤.

هـەروەها ابـن جـني الموصـلي، ابـن الـدهان الموصـلي، القاضـي ابـن شـداد الرافعي، ابوعلي القالي، ابو الحسـن الهـروي نووسـەری کتێبـی (الاشـارات في معرفـة الزیارات)، بدرالدین لؤلؤ الارمني، حاکمی مووسڵ و دەیان کەسی دی.

– هەندێك بنەماڵەی فەرمانڕەوا هەن کە هیچ پەیوەندییان بە کـوردەوە نییـە وەك سـەلمێنراوە لەوانـە: بنەماڵـەی (مظفـري) فـەرمانڕەوایانی هـەرێمی فـارس، بنەماڵەی پاوەنـدی فـەرمانڕەوایانی مازەنـدەران و میرانـی حەمـدانیی عـەرەب لـە مووسڵ، چەندین بنەماڵەی دی.

هەموو ئەم کەسایەتی و بنەماڵانەی بە کورد دانراون، پێویست ناکات خوێنەر بێتو لە سەرچاوەکان بگەڕێت تا بزانێت ئەمانە کـوردن یـان نـا، بـەڵکو لـە خـودی ناوەڕۆکی ژیاننامەیاندا لە کتێبەکە بە ڕوونی دەردەکەوێت کە ئەمانە هەرگیز کورد نین و هـیچ پەیوەندییـەکیان بـە کـوردەوە نییـە و نازانرێـت چـۆن لێـرە لـە ڕیـزی ناودارانی کورد هەژمار کراون؟.

٥– بە خوێندنەوەی لاپـەڕە سـەرەتاکانی کتێبەکـەدا دەردەکـەوێت کـە ئـەم کتێبە کەس نەیخوێندۆتەوە بەر لە چاپکردنی، نە وەرگێڕ و نـە کەسـانی شـارەزا،

دەنا چۆن هەڵەی وای تێ دەکەوێت؟، بۆ نموونە لە دێڕی دووەمی لاپەڕەی یەکەمدا هاتووە ((نێوەی یەکەمی مانگی چوارەمی کۆچی))، (ل٥ ) لە راستیدا نێوی یەکەمی سەدەی چوارەمی کۆچی. – لە لاپەڕەی دواتر و لە ناساندنی ئیبراهیمی گوڵشەنی هاتووە ((لە ساڵەکانی ناوەڕاستی دەیەی نۆهەمی کۆچی لە دایك بوو)) (ل٦)، لە لاپەڕە نۆ ناوی کتێبێك هاتووە (المثل الشائر في ادب الكاتب والشاعر)، کەچی ناوی هەمان کتێب و لە هەمان لاپەڕەدا بە شێوەیەکی دی هاتووە (السائر في ادب الكتاب والشاعر) و هەر لە (ل ٩) کتێبێکی ابن العديم بە (الداري في ذكر الذراري) لە راستیدا (الدراري في ذكر الذراري)، ناوی کتێبێکی دیکە هاتووە بە (رفع الظلم والتجري عن ابي العلاء المعري) لە راستیدا (دفع الظلم والتجري) ... هتد.

لە (ل١٠) هاتووە ((لە سەردەمی "صبا"دا دەگەڵ باوکی چوونە شاری دیمەشق..)) من وا تێدەگەم بەم شێوەیە بێت: لە سەردەمی لاوێتی.

لە (ل ١٠٨) و لە ناساندنی اسحاق الموصلي هاتووە ((هەرکات بيويستبا رەشيد استخفاف بە ابو صفوان ناوی دەهێنا)) برای وەرگێڕ و برایانی لیژنەی پێداچوونەوە نەیانپرسی کە ئەم برگەیە لە راستیدا چۆنە؟ و ئەگەر بیانخوێندبایەتەوە دەیانپرسی رەشید استخفاف بە واتای چی دێت؟ من وا تێدەگەم بەم شێوەیە: هارون الرشيد هەر کاتێك بيويستبا بە استخفافەوە بە ئیسحاقی دەگوت ابوصفوان.

لە (ل ٢٦٦) هاتووە ((لە کتێبی "ابن الاثير" هاتووە "صفی الدين" لە ساڵی ٧٢٣ کۆچی دوایی کردووە، ("كشف الظنون ذيل النهاية في غريب الحديث")ی "ابن اثيري" نووسیوە، کەچی لە راستیدا (ابن الاثير) بە دەیان ساڵ پێش ساڵی (٧٢٣ك) لە ساڵی ٦٠٦ك مردووە وەك لە کتێبی ناودارانی کورد (ل٨) دێڕی ٣ هاتووە کە مجدالدين (ابن الاثير) لەم ساڵە مردووە و کتێبی (النهاية في غريب الحديث) نووسیوە. لە راستیدا لە کتێبی (كشف الظنون) هاتووە کە صفی الدين ساڵی ٧٢٣ کۆچی، کتێبی (ذيل النهاية في غريب الحديث) داناوە، بە بەڵگەی ئەوەی کتێبی (النهاية في غريب الحديث) نووسراوی (مجدالدين ابن الاثير) بڕوانە (ل٩) ئەمە و سەدان هەڵەی دیکەی لەم بابەتە.

٦- له هەمووی سەیرتر شاری خرتبرت- حصن زیاد که تا هەنووکەش ماوه و دەکەوێته ولاتی تورکیاوه به کەسایەتی دانراوه، هەر له ناساندنی خرتبرتدا روونه که ئەوه شوێنه نەك کەسایەتی (ل٢١١).

٧- دیاردەیەکی دیکەی سەرنجڕاکێش لەم کتێبەدا ئەوەیە چەندین کەسایەتی زیاتر له جارێك ناسێنراون، له هەندێك لەو دووبارەکراوانه زانیاریی لێکجیاواز پێشکەش کراون، بۆ نموونه بەدری کوڕی حەسنەوییه له لاپەڕەکانی (٥، ١٦٢، ٤٣٣) باس کراوه، (ضیاء الدین ابن الاثیر) له یەك لاپەڕەدا (ل٩) دووجار ناسێنراوه، شەهفوری ئەسفراینی (ل ١٣٩، ٢٣٨) و شاعیری ناودار علم الدین الشاتاني دووجار ناسێنراون (ل ٤٥، ٢٣٧) و له هەر شوێنێك لەو دوو شوێنه باسی ساڵی مردن و لەدایکبوون به جیاوازی باس کراوه.

- پەنداری کورد باپیری شێخ زاهیدی گەیلانی له (ل١٦٤) به (الکردي السبحاني) ناوی هاتووه، کەچی له پاش دوو لاپەڕه هاتووه (الکردي السنجاني)، ئەمەو دەیان هەڵه و ناتەواوی و خەوش، بۆیه به بۆچوونی من پێویسته هەرچی زووه ئەم کتێبه له کتێبخانەکان بکێشرێتەوه و دابەش نەکرێت و بدرێت به کەسێکی شارەزا، تا ئەم هەڵانه راست بکاتەوه و هەموو ئەو کەسایەتی و بنەماڵانەی به کورد ناسێنراون لابردرێت و ناکۆکی و دووبارەبوونەوەکان راست بکرێنەوه.

**ناساندنی کتێب:**

# کەلهوڕنامە

**د. ڕەحیم قادر سورخی**

## پێشەکی

ناساندنی کتێب بە واتای ناساندنی ئەو بەرهەمانەیە کە لە بواریکی تایبەتدا نووسراون و ئامادەکردنی لیستەیەکە لە ناوەڕۆکەکەیان. ئەمڕۆ ناساندنی کتێبەکان سەرەتایەک و ئامرازێکە بۆ لێکۆڵینەوە زانستییەکان؛ جگە لەوەی توێژەران لە پێشینەی بابەتێک و بوارێکی لێکۆڵینەوە ئاگادار دەکاتەوە، تیشک دەخاتە سەر ئەو بوارانەش کە نەخراونەتە بەر سەرنج و لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە نەکراوە. ئەم کارانە لێکۆڵینەوەکانی پێشوو دەوڵەمەند دەکەن و برەو دەدەن بە توێژینەوە ئەکادیمییەکان لە ئێستا و داهاتووشدا.

ڕەخساندن و ڕێگا خۆشکردن بۆ لێکۆڵینەوەی ڕەسەن و بایەخدار پێویستە لە بەرایی کاروبارە زانستی و ئەکادیمیاکاندا بێت. لێکۆڵینەوە لە زمان و ئەدەب، فۆلکلۆر، مێژوو، کەلەپوور و بوارەکانی دیکەی زانستە مرۆڤایەتییەکانی کورد لە بەرایی ئەو هەوڵانەدان کە ئەکادیمیای کوردیی پێیانەوە خەریکە.



لەپێناو ئەم ئەرکەدا لەمەودوا لەهەر ژمارەیەکی گۆڤاری ئەکادیمیادا هەوڵ دەدەین بەرهەمێک یان چەند بەرهەمێک بە خوێنەران و توێژەرانمان بناسێنین. لەم ژمارەیەدا کتێبی "کەلهوڕنامە" (ئەدەبی




فۆلکلـۆری کەلهـوڕ) لە ناوچەکـانی کرماشـان و ئیلاممـان هەڵبـژاردووە کە لەلایەن "خـــــاتوو ناهیــــــد محەمەدی"یەوە کۆکراوەتەوە.

## زاراوەی کەلهوڕی

لە کـــۆنترین ســــەرچاوەی باوەڕپێکراوی کوردیدا (شـەرەفنامە)، زارە کوردییەکـــان بە چـــوار زاری سـەرەکی: کرمـانج، لـوڕ، کەلهـوڕ و گـۆران هـاتوون. زاری کەلهـوڕی لە نـــاوچەی "گەڕووس"ی بیجـــار بە "گەڕووسی"، لە ناوچەکانی ئەسەدئاوا و سونقور و کولیایی بە "کولیایی"، لە ڕۆژئاوای ئەو ناوچەیە لە خانەقین و دەوروبەری و لە ئیلام و دەوروبەری بە "ئەرکەوازی" یان "فەیلی" ناسراوە.

زاری کەلهـوڕی چەنـد شـێوەزارێکی وەک ئەیـوانی، گەیلانـی، زەهـاوی، ئیســلام ئـاوایی، قەسـری، ماهیدەشــتی، کولیـایی، گەڕووســی، چـارداوڵی، مەلەکشـایی، بەدرەیی، بیلەواری، نـاودەروەنی، مەهەکی، خزلی، زۆرباتەیی، فەیلی، خانەقینی، کەلاری و کفری دەگرێتەوە.

## کەلهوڕنامە

کەلهوڕنـامە (ئەدەبـی فۆلکلـۆری کەلهـوڕ- ئـیلام و کرماشـان)، بەرگـی یەکەم، ناهیــد مــحەمەدی، بە پێشــەکیی: پ. هەڵــکەوت حەکـــیم و پ. میرجەلالەددین کەزازی، تاران: ئینتیشاراتی دەستان، ٢٠١٣/١٣٩١.

کتێبـی کەلهوڕنـامە بەرهەمـی گەڕان، بە دواداچـوون و مانـدووبوونی "خـاتوو ناهیـد مـحەمەدی"، شـاعیری کـوردی شـاری "ئەیـوان"ە لە پارێزگـای کرماشـانی ڕۆژهەڵاتـی کوردسـتان کە لە قەبـارەی ٢٤ لە ١٧ (وەزیـری) و بە ٢٦٧ لاپەڕە بە زمــانی کــوردی و فارســی بــڵاو کــراوەتەوە. پێشــەکییە

کوردییەکانی بە فارسیش وەرگێڕدراون. بەشی پەند و مەتەڵەکانی بەفارسی وەرگێڕدراون و لە کۆتاییدا لە فەرهەنگۆکێکدا واتای وشە و زاراوەکانی بە فارسی بۆ نووسراوە.

کەلهوڕنامە کۆمەڵێکە لەو هەڵبەست، چەمەری، بەند، پەند و مەتەڵە کوردییانەی بە شێوەزاری کەلهوڕی لەلایەن ژنان و پیاوانی یەکێک لە دێرینترین ناوچەکانی کوردستانەوە (ئیلام و کرماشان) سنگ بە سنگ پارێزراون و گوتراون. بەرهەمی ژیانی سەدان و هەزاران ساڵی کۆمەڵەیەکی زمانییە کە تاکەکانی ڕێگەی خوێندن بە زمانی زگماکی خۆیانیان نییە. "ڕاستی، داوێنپاکی و چاکەکارییەکانیان بە ساویلکەیی ناو براوە و داگیرکەران هەوڵیانداوە بە خەڵکانێکی سەرەتایی بیانناسێنن."

ناهید خاتوون "لە کۆسپ و بەربەست و کوێرەوەرییەکانی سەر ڕێی، لە ماوەی پێنج ساڵ کۆکردنەوەیان بۆمان نادوێ"، برینەکانی بە"مەڵحەمی هەست و سۆزی بێخەوش و پاکیی ژنانی ئەو ناوچەیە سارێژ دەکات". شێلگیر و پەیگیر پەیڤی شیرینی ئەو کەسانە دەبیستێ کە بە گیانیان کولتوورەکەیان پاراستووە و ئەوەی لە دایک و باوکانی خۆیان بیستوویانە لەگەڵ شیر و بەزەیی دایک، فێری ڕۆڵەکانیان کردوون.

ئەم بەرهەمە کەرەستەی لێکۆڵینەوەیە بۆ لێکۆڵەرانی بواری کولتوور، کۆمەڵناسی، مۆسیقا و گۆرانی، زمان، ئەدەب و زارناسیی کوردی.

### ناوەڕۆکی کەلهوڕنامە:

بەرهەمەکە بە پەسەندێک لە مامۆستا ماجدی مەردوخی ڕوحانی، کورتە پەیڤینێکی کۆکەرەوە (ناهید محەمەدی) کە تێیدا ناوی ئەوکەسانەی وەک سەرچاوە گوتراوەکانیان وەرگیراوە و تۆمارکراوە هاتووە و پێشەکییەکی پ. هەڵکەوت حەکیم (پرۆفیسۆری زمانی کوردی لە پاریس) و دیباچەیەک لە پ. میر جەلالەددین کەزازی (پرۆفیسۆری زمان و ئەدەبی فارسی لە تاران) بە ناوی "ئەدەبی دەوڵەمەند، ئەدەبێکی زیندوو" دەست پێدەکات.

**پێکهاتەی کۆکراوەکان لەم ناونیشانانە پێک دێن:**

1. **ئاشـقانەیل (دڵدارییەکان):** کۆمەڵێ دێری ئاشـقانەن کە بە پـاراوی، ڕاشکاوی و ڕاستگۆیانە ئەوین دەنوێنن و بە ناوی "بەی، بیوە، خاڵ و شیرین و فەرهاد" هاتوون.

ئاوەگەی ئەڵوەن ڕشی لە قەسر  خانم خانمەیل چەوەیل پڕ ئەسر
ئاوەگەی ئەڵوەن یە چەنی قۆلە  ماچ دۆت ئازەو وە زەرب پۆلە
ئاوەگەی ئەڵوەن یە چەنی قۆلە  ئاوێزان لەبان زەنگیانە و پۆلە
ئاوەگەی ئەڵوەن چەمەگەی ڕاوەن  زولفەگەی لەیلێ م کردیە پاوەن..
ئاوەگەی ئەڵوەن لە قەسرەو ڕشی  شیقەی دۆت ئازەو کوڕ جایەڵ کوشی...

* *

ئەر شەوی بویدە میوان ماڵم  سەر بنەیدەو بان سەرین باڵم
پیرانە سەری مەچوو لە سەرم  جوانەو بوودن دڵەگەی تەڕم

* * *

لە سەدر سینە دوو بەی ها وە دار  میەن هەزار بوو چۆ قۆتی عەتار
لە سەدر سینە دیوان داس دوو بەی  لە فەرموودەی هەق پەیوەسن وە خۆی...

* * * *

ئۆشم لە داخد بوومە دەوریش  لە دەورێشەگان بیچارەی دڵ ریش
دەوریش بایە کەشکووڵ وە دەس بوو  چۆ بڵبڵ دایەم ماوای قەفەس بو
دەورێش دڵ ریش گووشەی شارانم  چۆ زەمین هەڵاک قەترەی وارانم

* * * * *

2. **ژنـــانە:** کـــۆکەرەوەی ئەم بەشـــە لایە لایە (لاوە لاوە)، مـــوور و چەمەری (شینگێڕی)، بەیت و گۆرانی تایبەت بە چالاکییە ڕۆژانەکانی ژنـان (مەشـکە و...) دەگـرێتە بەر. ئەمـانە ئەو بەسـتە و هـۆنراوە ژنانـانەن کە لە زمان ژنانەوە گوتراون و هەست و سۆزیان بەرانبەر بە دەوروبەری خۆیـان دەردەبڕن.

**لاوە لاوە:**

لاوە لاوەگەم خیاتەی خاوە  زەمزەمەی مەلا[ن] تافەی بەفراوە
لاوە لاوەگەم، سەر گوو، قەمگە  گیسەیل خرماچن بان مەمگە

گیانم وەقوربان دووڵ دەمی ری
سور رووڵەگەم لاگرتەیسە لی
کورپەگەم گیری دەنگ وە زارەوە
ئەڕای بسینم گوڵ وەدارەوە
ڕووڵەگەم چییە ڕاو جووشە
پڕ گیرفانی هوردە قرووشە
لاوە لاوەگەی کوورپەی نازارم
بەڵکم بخەفی نەکەی ئازارم....

*

**مەشکە:**

باڵای مەشکەژەن چۆ تۆل تەڕە
گەردەن چۆ مینا چۆ شاخ زەڕە
مەشکە و مەشکەژەن، بەن سی پا مەفتۆل
باڵای مەشکەژەن لویل مەخوەی چۆ تۆل
مەشکەگەم چایە مەپرس حەواڵی
ئاوەگەی ئەڵوەن کەفتە خەیاڵی
مەشکە بژەنیە نیمەروو شەقە
میوانم ئەڵسی وەبەردە ڕەقە
ئێل عەشایر دایە لە شەو بار
گاوسد بژەن نەمەنیە شەوار
مەشکەگەم ژەنیەی هارە هاریە
وە سەنگ تەوریزی کەرە باریە...

**3. جۆراوجۆر:** ئەم بەشە تایبەتە بە نواندنی سروشت، پیری، هاوسا، شعور، ئایین، ڕۆژگار، کەیوانو، مەلەوەرەیل، قیامەت، دڵ، ساڵی چل و یەک (ساڵی بەفرە زۆرەکە و قاتی و برسێتی) بیستوین و خانە گومانەیل.

**ساڵ چل و یەک :**

خوداوەن وە حەق بکەی وە کاری
ساڵ چل و یەک دە ئەو دویا ناری
وەختی دەوڵەمەنەیل هاتن لە بانا
چوار قەی بەتیە کردن، خسن وەشانا...

*

**دڵ:**

دڵ سفرە نییە بخەیدەی بانە
تا بەی لە بانی خیش و بێگانە
بی خەم بی خەیاڵ بی پەژارە بۆم
خوزگەمەو ئەوسا لە گاپارە بوم...

**

**4. پەن و جەواهـر (پەنـد) و چەوچەو (مەتەڵ):** لێـرەدا ئەو بەشـە لە ئەدەبـی فۆلکلـۆری کـوردی کـۆکراوەتەوە کە پێوەنـدیی بە مەتەڵ (بـۆ کـات بەسـەربردن) و پەنـدەکان (فێرکـاری و گێـڕانەوەی شـارەزایی و ئەزموونەکان)ەوە هەیە.

- **چەو چەو:**

سەری بڕم شیر دیری  زگی دڕم خوین دیری (هەنجیر)

مامر یەکی خا دوانزە       جوجگ سێ سەدو، پەنجیاو پانزە (ساڵ، مانگ و ڕۆژ)

هالەقان مالەقان     لە بیوانەیل دۆ لەقان (نەی/قامیش).

هڵدم دڵدم شەش پا و دو سم (تەرازوو).

تاڵی ئەوریشم تا بەقدا  کیشم (جادە).

گری لە دۆی خۆن لە لۆتی تیەی: کلکی دەگری خوێن لە لووتی دێت (قۆری).

وە سێ قول ڕی کەی   وە یەک قول وسی: بە سێ پێ دەڕوا، بە یەک پێ دەوەستێ (سەعات).

هەرچی فەرەس هەر کەمە (دۆست)

هەرچی کەمە هەر فرەس (دوژمن).

شەوەکی  پڕ ئیواران خاڵی (کەوش).

- **پەن و جەواهر:**

تا خوا حەق کرد بەنە دق کرد (تا خوا حەقی کرد بەندە دیقی کرد).

- تا تەوانسم نەزانسم ئینگە زانم نەتوانم: (کاتێ دەمتوانی نەمدەزانی ئێستە دەزانم ناتوانم).

- ئەر خـــــــوەرە وەی وە کەچەڵ، ئەر وارانە وەی وە کەچەڵ: (ئەگەر خـۆرە وەی لە کەچەڵ، ئەگەر بـارانە وەی لە کەچەڵ)؛ واتە، چ هەتـاو بـێ، چ باران بێ هەر بە زەرەری کەچەڵە.

- ئەر مـن لە بەقدا ناتـام شـۆ داڵـگ تـو کـی بـۆ: (ئەگەر مـن لە بەغداوە نەهاتایەم کێ دەبووە مێردی دایکت )؛ واتە ئەگەر مـن نەبـوایەم تـۆ پشـتت بە کێ دەبەست.

- پێغەمبەر دوعا وە گیان خـۆی کەی (پێغەمـبەر دۆعـا بـۆ گیـانی خـۆی دەکا)، واتە هەرکەس لە بیری خۆیدایە.

شکایەتە رووی وە چەقەڵ کردن (شکات لە ڕێوییان بردە لای چەقەڵ).

**کتێبەکە بە فەرهەنگۆکێکی کوردی - فارسی کۆتایی پێ دێت.**

# مەولەوی لە چەند دیکۆمێنتێکدا

د. ڕەئووف عوسمان

**فەرمانی ژمارە (١)**

عـــەلی وەیـــس و براکـــانی، موحەمـەد وەیس، سـان ئەحمـەد، دەروێش سەلیم و براکەی، قەمـەر، قالـە = قـادر، عـەلی وەیـس کاکـە وەیـس، عـەزیزو براکـەی، کیـانی شاوەیس، سلێمان.

پایـــەی عـــالی مـــەقام، خۆشەویستیو ڕاستی نیشان، خالۆ موحەمەد بەگ ((بحمد الله تعـالی))، پاش سـڵاو ڕوونـی دەکاتـەوە، کـە لـەم کاتـەدا وەکـو پێشـتر بڕیـار درابـــوو، ســـیانزە بنەماڵـــە وا لەســـەرەوە ناویـــان هـــاتووە، بـــە پیـــاوداری جـــەنابی مەولـــەوی، بڕیاردرا و ئەوانەمان سپاردەی ئـەو کـــرد و خـــەرج و حەواڵـــەیانمان یەکسەر لە دەفتەرخانە بـەدەرکرد، لە کۆتاییدا، بە دڵنیاییەوە پێتان ئەوترێو ئاگادار دەکرێن کـە هەڵبـەت لەمـەودوا بەهیچ چەشنێك لە چەشنەکان، پەیوەندیو هاتوچۆ و داواکاریتان لێیـان نـەبێت و زەحمەت و دەستدرێژی نەکەنە سەریان، با ڕەحەت خەیاڵ و ئاسوودە حاڵ بـن و بەکاری خۆیانەوە خەریك بن.

عەبدوڵڵا

میری میران ١٢٦١



## فەرمانی ژمارە (٢)[١]

خـزم و نزیکـانی جـەنابی زۆر گەورە و بـەڕێز، برامـان مەولـەوی، هەڵبەتە بەگەیشتنی ئەم نووسراوە باڵایـە، بـە ئەوپـەڕی ئەمنییـەت و دڵنیاییـەوە، لەگـەڵ مـاڵو کۆچـدا بـەرەو شـارەزوور ڕێکـەوتنو لـەوێ سـەقامگیر دەبـن، بـەدڵنیایی‌و بـێ ختوورە بە کاروباری خۆیان خەریك دەبــن و دۆعــای بــەردەوامی بــۆ حکومـەتی پایەبـەرز دەکـەن، ئـیتر لـەم بارەیـەوە دڵنیـابن بەشـێوەی بڕیار لەسەردراو ئیش بکەن.

| | |
|---|---|
| ٢٦٢ | عەبدوڵڵا |
| ٩ ب | میری میران |

---

[١] بەڕێز جەنابی شێخ (معتصم هاشمی) ئەم دیکومێنتانـەی بـۆ وەرگێڕامـە سـەر زمـانی کوردی.



### فەرمانی باڵای (٣)

بە مەبەستی بەدەستهێنانی ڕەزای خـــــودای مـــــەزن و دڵخۆشبوونی سەیدی ئەنبیا (علیـه الصــلاة والأنــام) لەبــەر خــودای گــەورە و بەخشــندە و لــە ڕووی حەقــــداریی زاتییــــەوە، دێـــی (بیاوێڵەمان)[٢] بەناوی (وەقفیـەت) بــە جــەنابی بــەڕێز و پایەبــەرز، برامـــــان مەولـــــەوی، مـــــەولانا عەبدولڕەحیم ئەسپەردە کرد، تـا داهاتەکـەی بـۆ گـوزەرانی خـۆی بــەکاربهێنێ، وە بــە خــەیاڵێکی ئاسوودە، بە ئیشو دەرس وتنەوە و بڵاوکردنەوەی زانیارییەکان و خواپەرستیو دۆعا گۆیی خـەریك ببێت. هەڵبەتـە هیچ کەس بۆی نییە لە ئیش و کاری ئەودا موداخەلە بکات.

| ١٢٦٢ | عەبدوڵڵا |
|---|---|
| ٢١ ج | میری میران |

[٢] ئەم ئاواییە دەکەوێتە باشووری خۆرئاوای هەڵەبجەوە.



**فەرمانی ژمارە (٤)**

کاربەدەستی جۆگاکاری بەڕێز...

ئــەمرتان پــێ ئەکــەین و بڕیــار ئەدەین، کە هەر جۆگایەك پایە بەرزی بــەڕێز و بــەختیار شــێوە، برامــان مەولەوی، لـە ئـاوی سـیروانەوە هـەڵی دەگرێت، لەلایەن ئێمەی پایە بەرزەوە ڕێگای پێدراوە و حەقی خۆیەتی.

هەڵبەتە نابێت هیچ کەس ڕێگـری لێ بکات و دەست نەخەنە ڕێگەی.

١٢٦٢ — ١٢ ش

عەبدوڵڵا

میری میران

**بڕیاری پێنجەم – فەرمانی باڵا**

دەبێت وەکیل و مووچە خۆرەکان بزانن کە:

لەم کاتەدا و پشت بەسـتن بـە بڕیـاری پێشـوومان سـەبارەت بـە مەولـەوی و خزمەکانی کە بریتین لە سیانزە خێزان و ئێستا لە ئاوایی (هانەسوورە، چـاڵگە)[٣] و چەند شوێنێکی تریش نیشتەجێن، داواکـارم کـە باجیـان لەسـەر لابرێـت و ئـەم بڕیـارە بـەخێرایی جێبـەجێ بکرێـت، هـیچ کـەس بـۆی نییـە دەسـت بکێشـێتە کاروباریانــەوە، یـان بـاج و سـەرانەیان لەسـەر دابنێـت بـۆ ئـەوەی بـە خۆشـیو دڵنیاییيەوە بژین.[٤]

١٢٦٢ — ٢٤ ج

عەبدوڵڵا

میری میران

---

[٣] دوو ئاوایین دەکەونە باشووری هەڵەبجەوە و لە ناوچەی نەورۆڵین، ئێستا دێی (چاڵگە) نەماوە.

[٤] دەقی ئەم فەرمانە، وەك دیکۆمێنت کاتی خۆی نـاردم بـۆ گۆڤـاری کـاروان، بـەڵام جێـی داخـە، کـە ونیان کرد، بەڵام وەرگێڕانەکەیان پەخش کرد، چەند هەوڵم دا، لە کتێبخانەکەمدا نەمدۆزییەوە.

## شیکردنەوەی دیکۆمێنتەکان

زیندووکردنەوە و بووژاندنەوەی کەلتوورو مێژووی کوردو تەکاندنی تەپوتۆزی رۆژگـار، لـە رووە گـەش و جارجـارەش مەینەتبارەکـەی، ئـەرکێکی رووناکبیری و نەتـەوەیی گرنگـە لـە ئەسـتۆی رۆشـنبیرانی میللەتەکەمانـدا و پێویسـتی بـە ماندووبوون و کێومالّی هەمیشەییە.

کـارلێکی ئێسـتا و رابـووردوو، بەئاگاهێنانـەوەی لایەنـە پرشـنگدارەکانی کەلەپووری گەلەکەمانە لە خەوی پشتگوێخستن‌و کارێکی دلّسـۆزانەیە و پێویسـتی بە هەولّ و تەقەللای فرە هەیە لە گشت لایەکەوە.

ئەم پێنج دیکۆمێنتە دەگمەن و گرنگەی کە لەبـەر دەسـتماندایە، بـریتین لـە پێنج فەرمانی ئـەمیری کـە عەبـدوللّا پاشـای بابـان ناسـراو بـە (مـیری مـیران) لـە دیکۆمێنتەکاندا، دەری کردووە، لەم فەرمانانەدا میری میران، ئەمر دەکات بەسـەر کاربەدەسـتەکانیا، کـە زانـا و شـاعیری گـەورەی کـورد عەبـدولڕەحیم ناسـراو بـە (مەولەوی) لە باج و رسوومات ببەخشرێت و یارمـەتی و کارئاسـانی بـۆ بکرێـت لـە بەرێوەبردنی کارەکانیا.

خوێندنەوەی ئەم پێنج فەرمانە لای من، کۆمـەڵێك دەرهاویشـتەی جیاجیـای هەیە، کـە پەیوەنـدییان بـە خـودی فەرمانـەکان و کەسـایەتیی مەولـەوی و مـیری میران و دەوروبەرەکەیەوە هەیە و دەشێت ئەمە دوا شیکردنەوە نەبێت و ئیزافـەی تریشی بۆ بکرێت لەلایەن هەر بەرێزێکەوە.

### دەرهاویشتەکان:

١- هــەرگیز رەشــە خەڵکەکــەی ئــەو ســەردەمە لــە ئاســت تێگەیشــتن و هەزمکردنی بەرهەمەکانی مەولەویدا نەبوون، چ وەك هونەری شیعر، یـان پـەیبردن بـە زانسـتەکانی عەقایـد و کـەلام، کـە لـە هـەردوو کتێبـی (العقیـدة المرضـیة) و (الفضیلة)کەیدا رەنگیان داوەتەوە، واتە بەشێك لە کەسایەتێکەی دەگەرێتەوە بـۆ لایەنـە خواناسـیو ئـاینیو کۆمەلایەتێکـەی، بـەلام لای عەبـدوللّا پاشـای بابـانو رووناکبیرانی سەردەمەکەی لایەنی شاعیرێتییە ناوازەکـەی، جێگـای گـوێ پێـدانو نرخاندنی گەوهەری شیعرە بالاکانی بووە، واتە هەردوو لایەنی شاعیریەتو زانایی‌و

عیرفانییەتەکەی، لای دەستبژێرە (نخبة) ڕووناکبیرەکانی سەردەمەکەی، ئێجگار دیار و بەرچاو بووە. فەرمانی سێهەم دەیسەلمێنێت کە میری میران زۆر مەبەستی بووە کە مەولەوی بە دەرس وتنەوە و بڵاوکردنەوەی زانست خەریك بێت.

٢- من وای بۆ دەچم کە ئەم فەرمانانە دوای وەدەرنانی مەولەوی بێت لە ناوچەی شەمێران لەلایەن عوسمانی خاڵەی یەزدان بەخشییەوە، بۆ تاوگۆزی و جارێکی تریش لەوێوە بۆ دێهاتەکانی (هانەسوورە، میراولی، چاڵگە)، چونکە ئەم ئاواییانە نزیك یەکن‌و بە ناوچەی نەورۆلیی سەر بە قەزای هەڵەبجە دەژمێررێن. کاتێك (موحەمەد پاشا) بەم کۆچ و بارکردنەی مەولەوی دەزانێت، نامەیەکی بۆ دەنووسێت گلەیی لێ دەکات تیایدا، کە بۆچی شەمێرانی بەجێ هێشتووە، ئەمیش لە وەڵامی نامەکەیدا بۆی دەنووسێت کە (عوسمانی خاڵە) لەگەڵ خزمەکانی ئەم باش نەبووە، لەبەرئەوە ناچار بووە بار بکات، لەگەڵ نامەکە، ئەم چەند شیعرە فارسییەشی بۆ دەنووسێت:

**وزان سوی وطن هجرت نمودم**

**خلافت أز علي دانسته بودم**

**به تاثیر محمد میر أکمل**

**خلافت چون عثمان شد محول**

**دل خویشان مارا پر زخون کرد**

**به خویشاوند خود نعمت فزون کرد**

واتە بۆیە گواستمەوە بۆ نیشتمان چونکە خەلیفەییم بۆ (عەلی) بە حەق دەزانی، وە کە بە تەئسیری (موحەمەد پاشا) درا بە (عوسمان)، دڵی خزمەکانی ئێمەی پڕکرد لە خوێن و خەڵات و بەراتی بۆ خزمەکانی خۆی زیادکرد، مەبەست لە عەلی (شێخ عەلی) و لە عوسمان (عوسمانی خاڵە)یە، مەولەوی لەم شیعرە ناسکەیدا ئیشارەتی بۆ مەسەلەی خەلافەتی (عوسمانی کوڕی عەفان) و (عەلی کوڕی ئەبوتالیب)یش کردووە و ئەو وەزعە رابوردووەی هێناوەتە بەرچاو.... (دیوانی مەولەوی، ل٢٠).

٣- ئەم پێنج فەرمانە لە ساڵی ١٢٦٢دا دەرچوون‌و وەك سەرچاوەکان دەڵێن مەولەوی لە ساڵی ١٢٢١ك لەدایك بووە، کەواتە تەمەنی مەولەوی، لەکاتی

دەرچوونی فەرمانەكاندا (٤١) ساڵ بووە، واتە ئەم زاتە لەو تەمەنەدا ناوبانگیی كەسایەتی ئاینیو كۆمەڵایەتیو شاعیرێتیو زانستیو عیرفانی، بەو قەڵەمڕەوەدا بەشێوەیەكی دیارو بەرچاو بڵاوبۆتەوە، دیارە درەوشانەوەی شۆرەتی مەولەوی لەم تەمەنەدا بەڵگەی بەهرە و لێهاتووییەتی.

٤- وەك لە فرمانەكاندا دەبینین، نە نووسینی مێژووی زاینی نە مێژووی كوردی نابینرێت، واتە بە تەنیاو تەنیا لەو دەورانەدا هەر مێژووی كۆچی نووسراوە، دیارە ئەمە ئەتەكێتی نووسینی ئەو دەورانە بووەو مێژووی زاینیو كوردی لەئارادا نەبووە.

٥- وەك لە فەرمانەكاندا دەردەكەوێت، مەولەوی خاوەن وزە و توانا و ئیرادەیەكی باڵا بووە، لەگەڵ ئەو هەموو لێهاتوویيو ناوبانگە كۆمەڵایەتیو ئاینیو زاناییو شاعیرییەتەیدا، خەریكی كشتوكاڵو جۆگا هەڵبەستن بووە و بێ منەت لە گشت كەس، هەمیشە ئەوەی پێ باشتر بووە كە دێهاتەو دێهات بكاتو ئاوارە بێتو عارەقەی كشتوكاڵكردن برێژێت، وەك لەوەی بچێتە بن دەستی میرێكەوەو بڕوبیانوو بۆ كارە چەوتەكانی بێنێتەوە و شیعرەكانی بخاتە مەزاتخانەی میر و فەرمانڕەواكانەوە، ئەوەبوو بە مەبەستی نان پەیداكردن و ژیان لە زێدی خۆیەوە گواستوێتییەوە بۆ دێی چرۆسانە و لەوێشەوە بۆ ناوچەی شەمێرانو لەوێشەوە بۆ سەرشاتە و، جارێكی تر گەڕانەوە بۆ ئاواییەكانی ناوچەی نەوروڵی. با ئەوەشمان لەیاد نەچێت ئەو كاتەی كە لە سنە بووە، فەرهاد میرزای قاجار داوای لێ كردووە كە لەوێ بمێنێتەوە و چەند موڵك و ئاوایی لەسەر تاپۆ كات، بەڵام مەولەوی رەفزی كردووە و ژیانی هەژاریی نێو قەوم و عەشرەتەكەی هەڵبژاردووە، كاتی خۆی مەلا موحەمەدی كۆیە، واتە مەلای گەورە، مەولەوی ئاسا هەر بە كشتوكاڵەوە خەریك بووەو ملی بەكەس نەداوە. ئەم جوامێرانە، دوور لە سێبەری میر و پاشا و كاربەدەستە زاڵمەكان، ژیانی هەژاری و زەحمەتكێشییان هەڵبژاردووە و نەیانویستووە ببنە دەرباری هیچ كەس، یان كاژی رۆژگار فڕێ دەنو هەر رۆژەی بە باڵای یەكێكدا هەڵبدەنو بەهای شیعرەكانیان وەك كا و جۆ برێژن.

